فەرهەنگی نوێ

بۆ شیکاریی رامیاریی

# A Modren Dictionary of Political ANALYSIS

المعجم الحديث للتحليل السياسي

ئینگلیزی ـ کوردی ـ عەرەبی

دانانی


**GEOFFRE ROBERTS**
**And**
**ALISTAIR EDWARDS**


وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: سمیر عبد الرحیم الچلبی

وەرگێڕانی بۆ کوردی
محەممەد چیـــا

## پێشەکی

شیکاریی رامیاریی، وەکو بوارەکانی تری توێژینەوە، زاراوەکانی تایبەت بە خۆی بەرهەم دەهێنێت، کە ووشە نوێیەکان دووبارە دەکاتەوەو مانای هونەری بەووشە بەکارهێنراوەکان دەبەخشێت. کرداری پرۆسەی داهێنان پێویستە بۆ پەرەپێدانی ـ پشکنین و گوزارشت کردن و تێگەیشتن بە شێوەیەکی روون و ورد، ئەمە لە کاتێکدا کە روونی و وردبینی هەمیشە روون و ئاشکرانین، واش دەردەکەوێت کە هەندێك لە دەقەکانی زانستە سیاسییەکان، لەوانەش هەندێك لەو دەقانەی کە قوتابیان لە قۆناغێکی زووی خوێندنیاندا وەریدەگرن،لە خوێنەر دەخوازێت کەبەبەردەوامی بگەڕێتەوە بۆ ئەو چاپکراوە تایبەتمەندانە بۆ ئەوەی گرێی هێمای هەندێك لەو زاراوە بەکارهێنراوانە بکاتەوە، کاتێکیش بەم کۆششانە هەڵدەستن بێگومان دەبێتە بەشێکی گرنگ لە فێربوون.

تێگەیشتنی راست و دروستیش، لە کۆتاییدا، نایەتەدی تەنها بە شێوەیەکی پلە بەپلە نەبێت و هەروەها لە رێگەی خوێندنەوەو خۆماندوکردنێکی زۆرەوە نەبێت،ئەمە لە کاتێکدا کەپرۆسەی لەم شێوەیە زۆر دەگمەنە چونکە بواری بە دوادا چوونی کردارێکی لەم شێوەیە بە وردی و رێك و پێکی رەنگە تەنها بۆ چەند قوتابیەکی کەم فەراهەم ببێت بەڵام زۆرینە ئەوا هەلی راستەخۆیان بۆ ناڕەخسێت، وەئەمە نەریتێکی خوێندنەو بە شێوەیەکی لەسەرخۆ نەبێت پەرەناسێنێت، سەرەڕای ئەوەش کە ئەم فەرهەنگە چارەسەرێکی بەشی بۆ ئەم گرفتانە پێشکەش دەکات، بەڵام ئەمە ئینسکلۆپیدیا نییە، چونکە دەروازەکانی زانیاری گشتگیر لە بارەی بابەتەکانیانەوە پێش کەش ناکەن، بەڵکو تەنها هەوڵ دەدات چەند پێناسەیەکی کورت پێشکەش بکات کە چەند جیاوازییەکی گرنگ دەخاتە نێوان زاراوە هاو شێوەکانەوە هەروەها ئاماژە دەکات بۆ بەکارهێنانە جیاوازەکان و گرفتەکانی پێناسە کردن لە حاڵەتە دیاریکراوەکاندا دەخاتە روو، ئامانجیش بریتیە لە دابین کردنی هاوکاری راستەوخۆ بۆ

ئەو خوێنەرەی کەچەندین گوزارشتی نائاشنا مانای ناڕوون ڕێگە لە تێگەیشتنی دەگرن.

ڕەنگە هەڵبژاردنی زاراوەکان سەختترین کارێك بێت لەئامادەکردنی کتێبێکی لەم جۆرەدا. پرۆسەی چالاکی ڕامیاریی کاریگەر دەبێت بە هەموو مەسەلەیەك کار بکاتە سەر بایەخە مرۆییەکان، هەروەها زانستی ڕامیاری بوارێکە بۆ پشکنین زۆر گوڵبژێرە لە بەکارهێنانی ئەو زاراوانەو ئەو شێوازو تیۆرانەی کە لە زانستە کۆمەڵایەتیەکانی ترەوە و لە زانستە سروشتییەکانەوە وە لە توێژینەوە مێژوویی و فەلسەفی و یاساییەکانەوە وەرگیراوە.

هیچ هێڵێکی ڕونی سنورەکانی زانستی ڕامیاری و یان زاراوەکانی دیاری ناکات. بۆ روونکردنەوەی ئامانجی ئەم فەرهەنگە و ئەو پێداویسیە تایبەتیانەش کەدەیەوێت بیهنهێنێتە دی هەستاوین بە ئامادەکردنی پێناسەیەکی کورت سەبارەت بەو بنەما سەرەکیان کە هەڵبژاردنی زاراوەکان یان دورخستنەوەیان دیاری دەکات.

## ڕواڵەتەکانی هەڵبژاردنی دەروازەکان

زاراوە پێناسەکراوەکان ئەو زاراوانەن کە ڕەنگە لە دەقێکی زانستی سیاسیدا بیاندۆزیتەوە. کە بە شێوەیەکی گشتی ئەمانە دەگرێتەوە: زاراوەکانی توێژینەوەی ئەزموونی (coalitionئینتیلاف)) ڕێگا شیکاریە سەرەکیەکان و تیۆرە ئەزمونیەکان (coalition theory تیۆری ئینتیلاف، شیکاری سستمەکان (systems analysis) و زاراوە بنەڕەتیەکانی ئەم ڕێگاو تیۆرانە (Minimum- winning coalition-) ئینتیلاف ی سەرکەوتوو بە کەمترین ئاست لە بەدەست هێنانی کورسیەکاندا یان (Gatekeepers) چاودێرانی دابین کردنی خزمەتگوزاریە گشتییەکان یان ڕێکخراوە نێوەندەکان بۆنموونە )، زاراوە بەکار هاتووەکان لە گفتوگۆکردن لەسەر مەسەلە سەرەکیەکان لە فەلسەفەو ڕێگاکانی گەڕان (Determinismحەتمیەت و surveyresearch توێژینەوە ڕووپێوییەکان) .

ئێمە بە شێوەیەکی تایبەتی کارمان لە سەر ئەو زاراوانە کردووە کە بەدەربڕینی نوێ دادەنرێن و مانا و پراکتیکی نوێیان هەیە لە زانستی سیاسیدا کە جیاوازن لە ماناکانیان لە بە کارهێنانی ڕۆژانەدا (exit , paradigm,satisfice)، وە لە چەمکە سەرەکییەکانی زانستی ڕامیاریدا کە دەکرێت مانایان ڕوون بێت لە زمانی ئاسایدا، بەڵام لەهەر کاتێکدا کە لە زانستی سیاسیدا پێویستی بە وردبینیەکی زیاتر هەبێت ئەوا چەند دەلالەتێکی تایبەت لەو بارەیەوە هەن یان جیاوازییەکی توند دەربارەی گرنگی دارشتنەوە جیاوازەکان دێتە ئاراوە.

(هێز power، بیرۆکراسی bureaucrac ) . پراکتیزەکردنی ئەم پێوانانەش هەڵاوێردە کردنی ژمارەیەک لە گروپی دیاریکراودا دەچەسپێت : لەم فەرهەنگەدا هیچ دەروازەیەک بۆ ڕامیاریمەدارەکان یاخود نوسەرە سیاسیەکان بەدیناکرێت لە کاتێکدا

نەبێت کەناوی ئەو کەسانە بوویێتە ناونیشان بۆ کۆمەڵێك لە بیرۆکە (Marx مارکس، بەمانای مارکسیزم Marxism) یان کاتێك کارەکانیان لە زاراوەیەکەوە سەرچاوەی گرتبێت یان پێی کاریگەر بوویێت ( Michels iron law of oligarchy)یاسای مایکڵی ئاسنین بۆ حوکم کردنی کەمینە و ( ideal typas of authority) تەرزە میپالیە کانی ویبر بۆ دەسەلأت ) یان بۆ هێنانەوەی نموونە (Stalin,s Russia) ، بەو پێیەی کەنموونەیەکە بۆ ئەزعەی ستەمکارانە، هەروەها سەبارەت بەدام و دەزگاو دیاردە سیاسیە ناوچەییەکان (Politburo مەکتەبی رامیاریی) ، (Perostroika)، بونیادنانەوەو ئازادی بیروا (Glasnot) ئەوا ئەم فەرهەنگە نایانگرێتەوە تەنها لە کاتێکدا نەبێت کە ولأتێکی جیاواز ئەم دامەزراوانەی (ombusman) لێکۆڵینەوە لە سکالأی دژ بە فەرمانبەران و ستەملێکراوان تەبەنی کردبێت). هەروەها ئەم فەرهەنگە هەندێك لەو زاراوە بلأوگرنگە ئاینگلیزیە بەکارهاتووانە بۆ پێناسە کردنی دیاردە گشتییەکان دەگرێتەوە (Dirigisme) ئابوری ئاراستەکراو، Putsch هەوڵی کودەتا) . هەروەها هەوڵی نەداوە کە ئەو زاراوانە لە خۆبگرێت کە بەتایبەتی پەیوەندیان بە تیۆرە سیاسیە پێوانەییەکان و یان مێژووی فیکری سیاسیەوە هەیە. ئەمە لەکاتێکدا هەندێك لەم زاراوانە هێنراوە، لەبەر چەند هۆیەکی جۆراو جۆر، لەزانستی رامیاریی نوێدا، لەبەر ئەوە فەرهەنگەکە لە خۆی گرتوون .بەو شێوەیە زاراوەی (دەسەلأت Authority)، و (مەزهەبی پراگماتیکی ( Utilitarianismمان زیاد کردوە، لە کاتێکدا هەر دوو زاراوەی (justice) داد (و Aninomianism) رەتکردنەوەی بنەما سروشتیە ریشەدارەکان لەرووی کۆمەلأیەتیەوە، فەرامۆشکراون، هەروەك چۆن ئەو زاراوانە فەرامۆشکراون کە پەیوەندیان بە رامیاری و کێشە دیاریکراوەکانەوە هەیە (Monetarism) کە تیۆرێکە دەڵێت ناکرێت زەمانەتی گەشەی ئابوری بکرێت لە رێگەی کۆنترۆڵکردنی تێکڕای رێژەی زیادکردنی ئامادەکردنی پارەوە بۆ توانای بەرهەم هێنانی راستەقینە بەسەر گەشەکردندا، و

(Mutual as – sured destruction تێکشاندنی ناوەڕۆکی ئاڵوگۆڕکراو).
هـەروەها چـەندین زاراوەمـان پێناسـەکردوە پێناسـەیەکی گونجاو لـە فەرهەنگـە ئینگلیزیە باشەکاندا پێناسەمان کردوون کەوا دەرناکـەوێت پێویـستە دیـاریکردنی بـۆ جودابیەك بۆی لە بەکارهێنانی سیاسیدا پێویست بکات (competiton کێبرکێ، و Crisis قەیران، بۆنمونە) .
لەکۆتایدا، زاراوەی زۆر هەن کە لە زانستی سیاسـیدا بـەکاردێن و لـە لقـەکانی تـرەوە وەرگیراون یان بەشێکن لە زاراوەکانی رێبازێکی دیاریکراو یان شـێوازێکی دیـاریکراو. نموونەی ئەم جۆرە زاراوانە بەگشتی بەبێ ڕاڤەکردنێکی گونجاو بەکار ناهێنرێن تـەنها لە دەقە تایبـە تکراوەکـان و پـێش کەوتوەکانـدا نـەبێت، لەبەرئـەوە زۆربـەی چـەمکە بنەڕەتیـەکانمان هـەڵاواردوە وەکـو (philosophyفەلـسەفە، Marxism مارکسیزم، و Statistical Analysis شـیکاریی ئامـاریی) لـە خـوارەوەش هەندێك لەو دانراوانە دەیخەنە ڕوو کە ئەو کۆمەڵە هەڵاوێردراوانە لەخۆدەگرن.

## پێکهاتەی فەرهەنگەکە

وامان پێ باش بوو کە ئەو ڕوونکردنەوانە لەگەڵ زاراوەکاندا بەکار نەیەت لە فەرهەنگەکەدا بۆ هەموو دەروازەیەك. لەبری ئەوەش کۆمەڵێك زاراوەی پەیوەندیدار لە کۆتایی زۆربەی دەروازەکاندا بەدیاردەکەوێت. گەڕانەوەش بۆ ئەو زاراوانە کارێکی پێویستە لە پێناو تێگەیشتنی هەر زاراوەیەك و، شوێنی لە شیکاریی ڕامیاریدا بە شێوەیەکی تەواو .هەروەها ئەم کارە سود بەخش دەبێت هەتا لە کاتێکیشدا کە خودی دەروازەکەش پێناسەیەکی پێویست و رازیکەری پێشکەش کردبێت. ئەمەش ئەو زاراوانە دەگرێتەوە کە چەند ڕوونکردنەوەیەکی ئەو گوزارشتە بەکار هاتووانە لەگەڵیدایە کە لەو دەروازەیەدا بەکار هاتوون کە گرنگیەکی تایبەتیان هەیە بۆ تێگەیشتن، هەروەها ئەو زاراوانەی کە پە یوەستن بە زاراوە پێناسەکراوەکەوە یان ئەو زاراوەیەی کە دژی دەوەستێتەوە یان زاراوە هاوشێوەکان لە ڕوکاردا، لە کاتێکدا ـــ لەحەقیقەتدا ـــ ئاماژە بۆ بیرۆکەی تەواو جیاواز دەکات . هەروەها چەند دەروازەیەکی جودا پێشکەش دەکات لە حاڵەتەکانی بەکارهێنانی زاراوەیەك بۆ دوو مانای جیاواز یان زیاتردا و ناکرێت ئاماژە بۆ جیاوازیەکان بە کورتی بکرێت :

**e.g .Convention (a) :The institution ;convention,**
**(b) procedural conventionسەرچاوەی تر**

بەتایبەتی ئاماژە بەم سەرچاوانەی خوارەوە دەدەین :–


Vernon Bogdanor (ed.) The Blackwell Encyclopedia of political Institutions ,Oxford , Basil Blackwell, 1987.

J.Eatwell , M .Milgate and p . Newman (eds .) . The New Palgrave D ictionary of Economics , London ,Mac-Millan , 1987.

Paul Edwards (ed .) The Encyclopedia of philosophy , New York , Collier MacMillan , 1973 .

David L . Sills (ed.) The International Encyclopedia of the Social Sciences , New York , Collier MacMillan , 1979 .

# A

(دەنگدان بە بێ ئامادەبوون) (الاقتراع الغيابي)
**Absentee Voting**

ڕێگەدان بەچەند کۆمەڵێکی دیاریکراوی دەنگدەران کەلە هەڵبژاردنەکاندا بە بێ ئامادەبونی خۆیان لە ناوەندە ڕەسمیەکانی هەڵبژاردندا دەنگی بدەن. ئەمەیش ئەو خەڵکانە دەگرێتەوە کە نەخۆش وکەم ئەندامن و هەروەها ئەوانەی کە بە هۆی پابەندبوون بەکارەکانیانەوە ڕەنگە نەتوانن لە بازنەکانی دەنگدانیاندا ئامادە بن، . وەدەکرێت بەهۆی پۆستەوە یان بریکار دەنگ بدات لەبری دەنگدەرەکە ئەمەیش بە پێی بنەماکانی سستمی هەڵبژاردنی وڵاتەکە.

هەروەها بڕوانە (proxy) بریکار .

**Absolute majority see : majority**

**Absolutism** حوکمکردنی ڕەها (الحكم المطلق)

ئایدۆلۆژیاو شێوەیەکە لە حوکمکردن کەتێیدا کۆت و بەندە دەستوریەکان ناسەپێنرێن بەسەر دەسەلاَتدارانی دامودەزگا پیشەییەکاندا، حاکمی ڕەها بانگەشەی مافی حوکمکردنێك دەکات کەنەبەستراوەتەوە بە پێشینە یاساییەکانەوە یان بە نەریتەکانەوە یان بەبانگەشە ڕکابەرەکان بۆ دامەزراوە سیاسیەکان یان کۆمەڵایەتیەکانی ترەوە. لەوانەشە وا پیشان بدات

کە مافی ئەو حوکمکردنەی هەیە بەڵام بە شێوەیەکی تەواو مومارەسەی ناکات واتە زۆرێک لە چالاکیە کۆمەڵایەتی و ئابورییەکان بەدورلە ئاراستەکردنی ناوەندی بەئازادی دەمێننەوە. وەلەو حاڵەتانەدا کەلەم شێوەیەن ئەوا حوکم کردنی رەها (Absolutism) جیاواز دەبێت لە حوکمی سەرکوتکەرانە (Totalitarianism) (تۆتالیتاریزم).

.See also : Autarchy tota cracy ,
judi cial yeview, rule of Law , soverignty,tata litarianism.

## Additional Member System AMS — سستمی ئەندامی زیادکراو (نظام العضو الاضافي)

سستمێکی هەڵبژاردنە کەپێك دێ لەنواندنی ئەو بازنە هەڵبژاردنانەی یەك ئەندامی هەیە یان چەند ئەندامێکی پاڵێوراوی هەیە و هەڵدەبژێررێن بە رێگاکانی دەنگدان بەزۆرینە یان بەدەست نیشان کردن وە لەگەڵ خستنە سەر (supplem entation) لە لیستە حیزبیەکاندا (هەرێمی یان هەرێمایەتیەکان) یان لەو پاڵێوراوانەی کە هەڵنەبژێراون و ئەنجامی باشیان بە دەست هێناوە بۆ جێبەجێکردنی دابەشکردنی رێژەی گشتی بۆ کورسیەکان لە نێوان حیزبەکاندا. سستمی هەڵبژاردنی ئەڵمانیش لەم جۆرە سیستمە بەکار دێنێ، وەکو سستمێکی لەم شێوەیە. پێویستە تێبینی ئەوەش بکرێت کە چەندە رێژەی سەدی ئەندامەکانی ئەنجومەنی یاسادانان یان دەستەیەکی تر کە هەڵبژێرابێت هەڵبژاردنێکی راستەوخۆ لە بازنەکانی هەڵبژاردندا وە چەندە ئەو ناوچەیەش کە لیستە حیزبیەکانی بەسەردا جێبەجێ دەبێت (یان خستنە پاڵی پاڵێوراوانێك لە

هەڵنەبژێراوەکان) بچوکتر بێت ئەوەندەش ئەنجامی گشتی کەمتر دەبێت بەدیاریکردنی ڕێژەیی.
هەروەها بڕوانە:-

**See also : Electoral System, proportional representation**

## Administrative Law ‏ یاسای کارگێڕی (*القانون الأداري*)

یاسایەکە کەچالاکی لقی جێبەجێکردن لە حکومەتدا ڕێك دەخات لە بەڕێوبردنی ئەرکەکانیدا لە ڕێگەی دەزگاو بریکارە پەیوەندیدارەکانەوە لەوانەش ئەوەی کە سەر بە حکومەتی ناوچەیین. سەرەڕای بوونی نزیکیەکی زۆریش لە نێوان یاسای کارگێڕی و یاسای دەستوریدا دەکرێت هەندێك جیاوازی نێوانیان دیاری بکرێت. یاسای دەستوری بە شێوەیەکی تایبەتی گرنگی بە مافەکان و ئەرکە بنەڕەتیەکانی حکومەت و هاولاتی و و پەیوەندی نێوان لقەکانی حکومەت دەدات. بەلاّم یاسای کارگێڕی ناکرێت بەشێوەیەکی تەواوەتی دابڕێت لەو ئیش و کارانە، بەلاّم ئەو بۆ خۆی بەشێوەیەکی تایبەتی گرنگی بەو لایەنە دەدات کە ئایا بریکارەکانی لقی جێبەجێکردن لە چوار چێوەی دەسەلاّتەکانیدا کاری کردووە لەڕێگەی پرۆسە گونجاوەکانەوە، هەروەها مومارەسەی چاودێرییەکی مەعقولی کردووە بە پێی داخوازییەکانی دادپەروەری کۆمەلاّیەتی. دەکرێت دادگا کارگێڕییە تایبەتیەکان پرۆسەی یاسای کارگێڕی جێبەجێ بکەن (وەك لە زۆربەی ولاّتە ئەورووپیەکاندا هەیە)یان لە ڕێگەی دادگا ئاساییەکانەوە (وەك بەریتانیاو ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا) وە لەحاڵەتی کۆتاییدا دەکرێت کەکێشەکان بەهاوتای ئەو کێشە مەدەنیە ئاساییانە دابنرێن کە پەیوەندیان هەیە بە گەیاندنی زیان و گرێبەستەکان و یاساکانی سزادانەوە،

سـەرەڕای ئـەوەش کـە دەسـەڵاتی جێبـەجێکردن بـەزۆری توانـای پاراسـتنی ئـەو ڕێوشوێنە یاساییانەی هەیە کەوا تاکەکان و دەزگا ئەهلیەکان ناگرێتـەوە. مەسـەلەی ڕاستی بڕیارێك، دادگایـەکی نیشتمانی لەدەوڵـەتانی ئەنـدام لـە کۆمەڵـەی ئەورۆپیـدا وەریدەگرێت سەبارەت بەو مەسـەلانەی کـە یاسـای کۆمـەڵی ئـەورووپی دەیانگرێتـەوە دەکرێت بخرێتە بەردەم دادگـای (داد) (**محكمة العدل**) ی کۆمەڵـە ئەورووپیـەکان ئەگەر هیچ چارەسەرێکی یاسایی (**القضائی**) بەپێی یاسای نیشتمانی نەبوو.

**See also : Administrative tribunal ;**
**con stitutional Law ; due process ;**
**executive ; ombudsman .**

## Administrative Tribunal (*المحكمة الادارية*) دادگای کارگێڕی

دادگا کارگێڕیەکان چەند دامەزراوەیەك کەخاوەنی ڕواڵەتی دادوەری و کـارگێڕین کەحکومەتـەکان دایـدەنێن بـۆ یەکلاکردنـەوەی ئـەو ململانێیانـەی کـە دروسـت دەبـن لەبەڕێوەبردنی ئەو ڕێکخراوانەدا کەوا ئەنجومەنەکانی یاسادانان بڕیاری لەسەر دەدەن .دەشـێ ئـەم کێشەو ناکۆکیانـەش لـە نێـوان هـاوڵاتی و دەوڵەتـدا دروسـت بـبن و ڕاسـتەوخۆ لـە بڕیـارێکی کارگێڕیـەوە دروسـت دەبـن کـە فەرمانگەیـەکی حکـومی دەریدەکات یان لە نێوان هاوڵاتیاندا دروست دەبێت هەروەها لە ڕێگەی یاسـادانانێکی ڕێکخستنیەوە یە کە ئامانجی پاراستنی یەکێك لە لایەنەکانە .ئەندامیەتی دادگاکانیش بەنـد نییـە تـەنها بـەو کەسـانەوە کـە لـەڕوی سیاسـیەوە شـیاون بـەڵکو زۆر جـار ئەندامگەلێکی ئاسایی‌و هەموو جۆرە کەسانێکی پسپۆڕیش لەخۆ دەگرێت . هـەروەها دادگاکان مەبەستیان نیە کە ڕێگایەکی خێراتر و هـەرزانتر و کـەمتر ڕەسمیـەتی پێوە دیار بێت بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیەکان پێشکەش بکـەن کـە دەکرێـت پـێش کـەش بکرێن لە ڕێگەی دادگاکانەوە. نەرمی لێپێچینەوەکانی دادگـا کارگێڕیـەکان بـە سـودن بەتایبـەتی لـە چارەسـەرکردنی ئـەو مەسـەلە هونەریانـەی کـە پەیوەنـدیان بـە

نەخشەکێشانی زەویەکان و بەکارهێنانیانەوە هەیە. هەروەها ئەم دادگایانە ڕێوشوێنی جۆراو جۆری زۆر لەخۆ دەگرن کە گرنگی بە بوارە جۆراو جۆرەکان دەدات لە کارگێڕی و ناکۆکیە جۆراو جۆرەکاندا.

هەروەها نموونەکان ئەو دادگایانە دەگرنەوە کە لە ناکۆکیەکان دەکۆڵێتەوە سەبارەت بە خەملاندنی باجەکان و پێدانەکانی چاودێری و بەخشینی مۆڵەت و سەلامەتی پیشەسازی و جیاکردنەوە لە دامەزراندندا. هەروەها دادگا تایبەتیەکانی بەسەرکردنەوە کاردەکەن لە هەندێك لە بوارەکانداو و بەشێوەیەکی گشتی دەکرێت (بەسەرکردنەوەکان) بدرێنە دادگاکان سەبارەت بەمەسەلە یاساییەکان. لە ئینگلتەرە ئەنجومەنی دادگاکان کەدەستەیەکی ڕاوێژکارییە و لە ساڵی 1958 دا دامەزراوە دەستوری دادگاکان و مومارەسەکانیان چاودێری دەکات.

See also : Executive ; ombudsman.

**Adversary Politics** ژیانی ڕامیاریی دژیەك (*الحياة السياسية المتضادة*)

هەندێك لە زانایانی ڕامیاریی جیاوازیەکی گرنگ دادەنێن لە نێوان کارە سیاسیە ڕەزامەندییەکان کە تێیدا بە شداران ئامانجێکی هاوبەشیان دەبێت لە ڕووی گەڕان بەدوای ئەوئامانجانەی کە هەمووان ڕازی دەکەن لەگەڵ ڕامیاریە ململانێ کەرەکان بۆ یە کلاکردنەوەی ئامانجە دژەکان لەلایەن گرۆپە بە شدار بووەکان کە پشت دەبەسترێت بە شێوازی پرۆسەی بانگەشە کردن و بەرگری لە ڕێوشوێنەکانی دادگا بەریتانیەکاندا. ژیانی ڕامیاریی دژەیەك ڕوانگەیەکە لە کردەوە ڕامیارییە بەریتانیەکاندا کەگوزارشتێکی تایبەتی دۆزیەوەتەوە لەو کۆمەڵە ووتارانەدا کە س . أ فایز بەناونیشانی:

**Adversary Pol itics and Electoral Reform (London , Antony Wirgam , 1975).** نوسیویەتی.

گریمانەی سەرەکیش ئەوە بووە کە ڕامیاریی حیزبە بەریتانیەکان وەك شێوەیەکی

دژیەکیەك لە پەیوەندییەکان پەرەی سەند بوو بە هۆی ئەو سیستمی هەڵبژاردنەوە کە پشت بە زۆرینەی سادە دەبەستێت هەروەها شێوازی ژیانی رامیاریی دژەیەك بووەتە هۆی جۆرە رامیارییەکی ناجێگیرو زیان بەخش کەحکومەتە تاك حیزبیەکان جێبەجێیان کردووە کەتەنها لە لایەن کەمینەیەك لە هەڵبژێراوانەوە پشتگیریان دەکرێت.

هەروەها ئەمە دژ دەوەستێتەوە لەگەڵ ئەو شێوازە سیاسیەدا کەزیاتر رازیکردنی پێوە دیارە لە هەندێك وڵاتدا نمونەی کۆماری ئەڵمانیای یەکگرتوو کە سستمی دەوڵەتێکی یەکگرتوو کەپشت بەحکومەتە ئیئتلافییەکان دەبەستێ کەزۆریەی دەنگدەران لەرێگەی سستمی هەڵبژاردنی نواندنی (التمثیل)ی رێژەییەوە لایەنگیریی دەکەن. حکومەتە بەدوادا هاتووەکانیش تیایدت بەگشتی حیزبێك

لەناوەڕاست لەخۆدەگرن کە بەشداریەکەی دەبێتە مایەی راسترکردنەوەی هەڵوێستە زۆر توندەکانی ئەو حیزبانەی بەشدارن لەحکومداو وای لێدەکەن زیاتر هاوسەنگ بێت. بەو شێوەیە بانگەشە کەرانی چاکسازی سستمی هەڵبژاردنی بەریتانی لەبیرۆکەی چالاکیە سیاسیە دژەکان سوودیان وەرگرت وەك بەڵگەیەکی سەرەکیی، کە پێیان وایە ئەو سستمی هەڵبژارنەی کە پشت بە زۆرینەی سادە دەبەستێت هانی چالاکیە سیاسیە دژەکان دەدات. بە پێی ئەم سستمەش حیزبەکان بەو ئەندامە چالاکانەی لەناوییان کاریگەر دەبن یاخود ئەوانەی کۆنترۆڵی ئەوحیزبانە دەکەن و ئەوانە لەرووی بیروباوەڕەوە مەیلی پەرگیریەکی پتریان هەیە لەئەندامانی حیزب یاخود هەڵبژێردراوانی. هەروەها ئەندامە چالاکەکانیش رۆڵێکی سەرکردەیی دەگێرن لەهەڵبژاردنی پاڵێوراوەکاندا بەتایبەتیش لەکورسیە مسۆگەر کراوەکاندا هەروەها زیاتر ئەو کەسانە یان پێیان باشە کە داوای پاڵاوتنیان کردووە، و زیاتر پەیوەستن ئەوەك میانرەوەکان.

پاش دەسەڵات گرتنە دەستیش ئەوا حکومەتی تاکە حیزب کە پشت بە گروپە پەرلەمانیەکەی دەبەستێت و بەگشتی پێك هاتوون لەو نوێنەرانەی

کەلەڕووی ئایدۆلۆژییەوە پەیوەستن و پابەند نابن بە هیچ پێویستیەکی بۆسازش و ڕێکەوتن لەسەر چارەسەر مام ناوەندەکان لەگەڵ حیزبە هاوبەشەکانیدا لە ئیئتلافدا و دەتوانێت ڕەنگدەرەوەی ئەو یاسایانە بێت کە حکومەتەی پێشوو دایناون. کۆنترۆڵ کردنی پیشەسازی پۆلاو دانانی یاسای پەیوەندیە پیشەسازییەکان لەلایەن دەوڵەتەوە دوو نمونەی زۆر ڕوونن بۆ دژیەکیەکی لەم شێوەیە لە ژیانی ڕامیاریی بەریتانیادا پاش جەنگی جیهانی دووەم، لەبەر ئەوە ڕەخنەگرانی ژیانی ڕامیاریی دژیەك پێیان وایە کەبەهۆی بەرهەم هێنانی بەرنامە ڕامیاریی زیاتر پەرگرەکان و بە هۆی نەبوونی زەمانەت وئەو ڕێکخستنەوە کە ناتەواوی لە ڕامیاریەکاندا لەخۆی دەگرێت ئەوا پیادەکردنی ڕامیارییە دژیەکەکان زیان دەگەیەنێت بە ڕەوشی ئابوری و کۆمەلایەتی وولات.

See also : Consensus.

## دانانی خشتەی کارەکان (وضع جدول الاعمال) Agenda Setting

بریتیە لەتوانا یان ئەرکی دانانی خشتەی کارەکان بۆ ڕێکخراوێکی ڕامیاریی: لیژنەیەك، کۆبونەوە یان کۆنگرەیەکی حیزبی، ئەنجومەنێکی حکومی خۆجیی ئەنجومەنی وەزیران ...هتد دانانی خشتەی کارەکان بریار لەسێ شت دەدات کاریان تێ دەکات: لەخۆگرتن یان دورخستنەوەی ئەو مەسەلە یەکەمینانەی کەبایەخ دەدا بۆ مەسەلەکان و خشتەڕێژ بۆ کردنی ئەو مەسەلانە (ئەمەیش کارێکە کە ڕەنگە گرنگییەکی ئامرازیانەی هەبێت بە دواخستنی چەند مەسەلەیەکی گرنگ بۆ کۆتایی خشتەی کارەکان لە کاتێکدا (بۆ نموونە) ئەگەر هەندێك لەنەیارەکان کۆبونەوەکەیان بەجێهێشت بوو) . لەبەر ئەوە ئەوا دانانی خشتەی کارەکان بە سەرچاوەیەکی ڕامیاریی گرنگ دادەنرێت.

بەپشت بەستن بە هەندێك تیۆریستی دەسەڵاتی رامیاریی دەكرێت دانانی خشتەی كارەكان دابنرێت بۆ ئامازەكردن بەبواری ئەو كێشانەی وادانرێت شایانی مشت و مڕبن لە كۆمەڵەیەكی سیاسیدا. هەروەك چۆن كاریگەر دەبێت بە بیرو باوەڕە باوو شێوازە رامیارییەكانیش.

**See also : Non - d ecision**
**Aggregation of interests**
**See : Interests .**

## Alienation نامۆ بوون (داماڵران) الانسلاخ

حاڵەتی جیابونەوەیە لە بەشێك لە خود یان لە سستمی رامیاریی و كۆمەڵایەتی. ماركس پێی وایە كە شێوەی سەرەكی بۆ نامووبون لە بەرهەمهێنانی سەرمایەداریدا ئەو پەیوەندیە دەگرێتەوە لە نێوان كرێكارو بەرهەم هێنەری كارەكەدایە. بەرهەم كارەكە بەرجەستە دەكات، لەم مانایەشدا بەشێكە لەخودی كرێكارەكە، ئەمە لە كاتێكدا بەرهەم هاتووەكە دوردەخرێتەوە لە كرێكارەكەو دەبێتە بەشێك لەو هێزە دەرەكیەی كە بەسەر كرێكارەكەدا پیادە دەكرێت. ئەم پەیوەندیە و پەیوەندیەكانی بەرهەم هێنانەیش كە بە گشتگیریەكیگەورەتر یان هەیە خنكاندنی توانا ئەفرێنەرەكانیان لە كرێكاری نامۆبوودا پێوە بە سترلوەتەوە.
ماناكانی تری نامۆبوون نەبوونی دەستپێوە گرتنێكی قوڵ لەرۆڵە كۆمەڵایەتی و سیاسیەكانەوە خۆی دەبنێتەوە، هەتا لە حاڵەتی بوونی گونجانێكی دروستكراو یان میكانیكیدا. ئەوا نامۆ بوون لێرەدا پەیوەستە بەنەبوونی تێكهەڵكێشانی رامیاریی و شكست خواردنی پەروەردەكردنی كۆمەڵایەتی و رامیاریی ولاوازی پاڵپشتی سستمی رامیارییەوە.

بڕوانە:

**;realignment. Anomie ;Marxism AlignmentSee:Dealignmen ;political**

## سستمی دەنگدانی جێگرەوە *(نظام الاقتراع البدیل)*

## Alternative vote system

سستمێکە بۆ پاڵفتەکردنی پاڵێوراوان بەبەکارهێنانی دەنگدانی فەزل بەسەرادانی ڕەهاوە لەو بازنانەی هەڵبژاردندا کە یەك ئەندامی هەیە یان بۆ هەڵبژاردنی یەك پایە، دەنگدەرە پاڵێوراوەکان بە پێی پلە بەندی فەزل بەسەردادان (**التفضیل**) ڕێکخراون. ئەو پاڵێوراوەش کە زیاتر لە 50٪ ی ئەو دەنگە (تفچیل)یانەی یەکەم بەدەست دەهێنێت ئەوا هەڵدەبژێرێت. خۆ ئەگەر هیچ پاڵێوراوێکیش یەکەم جار نەگەیشتە ئەو مەرجە ئەوا ئەو پاڵێوراوەی کەوا کەمترین ژمارەی دەنگەکانی بەدەست هێناوە دور دەخرێتەوە پاشان دووبارە کاغەزەکانی ئەو پاڵێوراوە دابەش دەکرێتەوە بەسەر پاڵێوراوەکانی تردا بەپێی ئەو شێوازە دەنگدانەی دووەم کە بۆیان ڕوونکردوەتەوە. ئەم پرۆسەیەش دووبارە دەبێتەوە بە پێی پێویست هەتا ئەو پاڵێوراوە هەڵدەبژێررێت کە زیاتر لە50٪ ی لەکۆی دەنگەکان بەدەست دەهێنێت. ئەم سستمەش بەکاردەهێنرێت بۆ هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجومەنی خوارەوە (ئەنجومەنی نوێنەران) لە ئەنجومەنی یاسادانانیئوسترالیداو لە هەندێك لە هەڵبژاردنەکانداو لە ڕێکخراوەکاندا وەك یەکێتیە خوێندکاریەکان. ئەمەش کۆنگرەی چاکسازی سستمی هەڵبژاردنە پەرلەمانیەکان لە بەریتانیادا لە ساڵی 1917 پێشنیاری کرد، هەروەها لەدەستەی لائیحەی یاسایی ساڵی 1920 دا خرایە ڕوو هەر چەندە پێشنیارەکە نەبوویە یاسا لەهەر دوو حاڵەتەکەدا. ئەم سستمە ئەگەری هەڵبژاردنی ئەو پاڵێوراوانە هەڵدەوەشێنێتەوە کە وا تەنها کەمینەیەك لە دەنگەکان بەدەست دەهێنن (هەروەك چۆن زۆر جار لە هەڵبژاردنە پەرلەمانیەکانی بەریتانیادا ڕوو دەدات) . لە کۆتایدا ئەمە سستمێك نییە بۆ نوێنەرایەتی ڕێژەیی بۆ حیزبەکان و بۆ ئەوە دانەنراوە.

هەروەها بڕوانە :

**Electoral System ; preferential**

Voting ;proportional representation;
Single transferable vote System.

## Analogy                                                   هاوشێوەیی (التناظر)

بریتیە لەلێکچوون لە نێوان لایەنەکانی دووشتی جیاواز یان زیاتردا، تێبینی (هاوشێوەیی) کراوە لە نێوان سستمە هەڵبژاردنیەکان و بازارە ئابوریەکاندا، وە لە نێوان سستمە سیاسیەکان وبونەوەرە زیندوەکاندا، وە لە نێوان سستمە سیاسیەکان و سستمە بیرکاریەکاندا (الحاسبات)، و لەنێوان هەڵمەتەکانی هەڵبژاردن و جەنگەکاندا، وە لە نێوان رەوشی رامیاریەکانی و یاریەکاندا .دەکرێت کە وا دانانی یەکەمیی بوونی هاوشێوەیی لە چەندین رێگاوە بەکار بهێنێت: بەو پێیەی بەشێکی ئەندێشە بۆ پێشنیارکردنی گریمانەکان و هێڵەکانی بەدیهێنان، وەك کە هێلکارییەکی لێکدانەوەی یەکەمینی شێوەی نزیککراوەی هەندێك لە کردەوەکان. وە ك هەنگاوی یەکەم لەهەوڵی بەدەرخستنی ئەوەی کە کردوەکان هەمان شتن واتە (زیاتر لەهاو شێوەیی رووت) لە نێوان هەردووسستمەکەدا لە ئارادایە. ئەم بەکار هێنانانەش لەو خەملاندنەوە سەرچاوە دەگرن کە مەرجییە هەتا ئەو پەری سنور. لە کاتێکیشدا کە هاوشێوەیی لە سنوری خۆیدا راڤەیەکی پاساودار پێش کەش ناکات بۆ ئەو پرۆسانەی کەبابەتی توێژینەوەن ئەوا پێویستە بەوریاییەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت. وایش دەردەکەوێت کە لەیەك چوونەکان روکەشن و پەیوەندیان بەبابەتەکەوە نییە وهەڵخەڵە تێنەرن.

**بڕوانە:**

;hypothesismodel Explanation

## گێرەشێوێنی (الفوضوية) ئانارشیزم Anarchism

ئەو رایەیە کە دەڵێت حکومەت و دەسەلاَت بە شێوەیەکی دەستکرد دەسەپێنرێن وەدەکرێت دەستیان لێ هەڵبگیرێت، وە کۆمەڵگە پێویستە رێکبخرێت لە رێگەی بەستنی چەند رێکەوتنێکی ئازادنەو لە نێوان ئەو کۆمەلاَنەدا کە پێك دەهێنرێن لەپێناو رازیکردنی کۆمەڵێکی تەواو لەپێداویستیەکانی مرۆڤ و ئامانجەکانی، وە پێویستە ئەم سستمە هەرەمەکیەی تاکە هاوکارەکان کە بەئازادی مامەڵە دەکەن جێگەی ئەو رێو شوێنە زۆرە ملێیێ و چەوسێنەرانە بگرێتەوە کە یاسا و دەوڵەت دایدەنێن. لەناو ئەم رەوشەیشدا جیاوازی هەیە سەبارەت بە ژمارەیەك لە مەسەلە سەرەکیەکان : رادەی پێویستیتوندو تیژی و پاساو دانەوەی لە لەناوبردنی دەوڵەتدا، هەروەها سەبارەت بەوەی کە ئایا موڵکایەتی تایبەت پێویستە بۆ ئازادی تاکەکەس یان ئامرازێکە بۆ زۆرە ملییی، و هەروەها رادەی شەرعیەتی رێکخستنی کۆمەڵی. جیاوازیەکان دەربارەی مەسەلە بنەڕەتیەکان رێگا بە سەرهەڵدانی هەست و سۆزە گێرەشوێنەکان دەدەن بە شێوەیەکی زیاتریش لە چوار چێوەی سیاسیدا لە فیکری راست و چەپدا، وە دەبێتە هۆی دابەش بوون لەناوخودی (مەیلی گێرەشێوێنیەکە) خۆیدا.

هەروەها بڕوانە :

**Anarcho –syndicalism ;authority; ideology;Marxism;newright;power;** society;state.

## بزوتنەوەی ئاژاوەگێری ــ سەندیکایی (الحركة الفوضوية ــ النقابية) Anarcho-Syndicalism

رەگەزێکی گرنگە لە ناو چالاکیە رامیارییە سۆشیالیستی و سەندیکاییە ئەورووپی

و ئەمریکیەکانیسەدەی بیستەمدا. ئەم بزاڤە کە بە شێوەیەکیگشتی ئاژاوەگێڕییە، رایگەیاندوە کە دژ بەچەمکی دەوڵەت و، رۆڵی سەندیکا (**Syndicat** لە فەرەنسیدا) دەوەستێتەوە لەکاری رامیاریی وەرچەرخانی کۆمەڵایەتیدا. سەندیکاکان ئامرازەکانی رێکخستن لەخۆدەگرن بۆ گۆڕینی دەسەڵاتی دەوڵەت بەحوکم کردن لە رێگەی رێکخراوە کرێکاریەکانەوە. هەروەها ئێستا ئەم زاراوەیە بەسەر ئەو ئاراستانەدا جێبەجێ دەکرێت (بەتایبەتی لە سەندیکا کرێکارییە فەرەنسی و ئەمریکیە لاتینیەکاندا) نەك بەتەنها بەسەرهەر بزوتنەوەیەکی دیاریکراودا بەڵکو هەندێ جاریش ئەم زاراوەیە بەکاردێت بۆ پێناسەکردنی کارێکی رامیاریی سەندیکایی کەراستەوخۆ ئامانجی روبەڕوبونەوەی دەسەڵاتی دەوڵەتە. لەساڵەکانی یەکەمی سەدەی بیستەمدا بزوتنەوەیەکی هاوشێوەی ئەمە لەبەریتانیادا بەدەرکەوت کەناسرا بەناوی (سۆسیالیزمی سەندیکایی) .. سۆسیالیزمە سەندیکاییەکان پێیان وابوو کە رێکخراوە پیشەسازیەکان پێویستە بە شێوەیەکی کۆمەڵی ئەو کەسانە حوکمی بکەن کەگرنگی دەدەن بەبەرهەمهێنان لەوانەش کارمەندە کارگێڕیەکان، هەروەها پێویستە هەموو پیشەسازییەك بەرهەمەکەی لە پێناو بەرژەوەندی گشتیدا ئاراستە بکات لە رێگەی سەندیکا نیشتیمانیە دیموکراسیەکانەوە (کە هاوشێوەی سەندیکاکانە لە چاخەکانی ناوەراستدا)وە دەوەستێت لە نێوان تاك و دەوڵەتدا دەوەستێت، هەروەها پێویستە نوێنەرایەتی بەرژەوەندی بەکاربەران بکات لەرێگەی ژمارەیەك لە دامەزراوەکانەوە، لەسەردەوڵەتیش پێویستە بەشێوەیەکی گشتی رۆڵێك بگێرێت کە رێکخەرانەو زۆرە ملێیانە نەبێت.

**هەروەها بڕوانە :**

**Anarchism ;corporatism (a) :**
**ideology : socialism.**

## Anomie نائامادەیی یاساکان یان بنەماکان یان پێوەرەکان

(*غیاب القوانین او القواعد او المعاییر*)

ئەم زاراوەیە بەکاردێت بۆ پێناسەکردنی رەوشی ئەو تاکانەی کە ناتوانن کۆتە کۆمەلآیەتیەکان یان رەوشی ئەو کۆمەلگایانەی کە خاوەنی کۆمەلە پێوەرێکی ململانێکەرو دارماون وەربگرن. لە شیکاریی رامیاریدا ئەم زاراوەیە بۆ راڤەکردنی رەفتاری رامیاریی لادەرو چالاکیە سیاسیە توندرەوەکان بەکارهێنراوە ...هتد. ئەگەری روودانیش زیاترە لەسەردەمەکانی وەرچەرخاندا وەك دروستکردن و پەرەسەندنی رامیاریی خێراو شۆرش و ئازادی ئەهلیدا.

هەروەها بروانە :

**Alienation; norm**

## Apportionment دابەشکردن (*التقسیم*)

بریتیە لەپرۆسەی دانانی سنوری جوگراف بۆ بازنەکانی هەلبژاردن و دیاریکردنی بازنەکانی هەلبژاردنە لەنێوان ناوچە کارگێڕیەکاندا (ولآتەکان یا پارێزگاکان یا ولایەتەکان لە ولایەتە یەکگرتووەکاندا...هتد) وە بە پێی سستمی زۆرینە رەنگە دابەشکردنی رێژەیی دانیشتوان لە نێوان بازنەکانی هەلبژاردن وروالەتە کۆمەلآیەتیو ئابوریەکانی دەنگدەراندا کارێکی گەورە بکاتە سەر ئەنجامە چاوەروانکراوەکانی هەلبژاردنەکان بەچەند رێگەیەك بەشێوەیەکی گشتی کە ناچەسپێت لەسستمی نواندنی رێژەییە هەلبژاردنیەکاندا. لەبەر ئەم هۆیەش زۆر جار بەدوای رێگەیەکی دابەشکردندا دەگەرێت کەوا حیزبی نەبێت، هەروەها ئەم رێگەیە

بەکار دەهێنرێت بۆ دووبارە دابەشکردنەوەی بازنەکانی هەڵبژاردن لە نێوان ماوەیەك و ماوەیەکی تردا بۆ ئەوەی زیاد بوون و دابەزینە ڕێژەییەکان لەبەر چاو بگیرێت لە ژمارەی دانیشتواندا لە بازنە جیاوازەکانی هەڵبژاردندا. لەبەرئەوەی کە یەکسان بوونی نزیکەیی لە ژمارەی دەنگدەراندا فاکتەرێکی سەرەکی زاڵە لەو سستمە هەڵبژاردنیانەدا کەپشت بە زۆرینە دەبەستن ئەوا دووبارە دابەشکردنەوەی خولی پێویست دەبێت.

دابەشکردنی ناوچەکان دوبارە دەکرێتەوە بۆ مەبەستی هەڵبژاردنە نوێنەرایەتیەکان لە ولایەتەیەکگرتووەکاندا پاش هەر سەر ژمێریەکی دانیشتوانی دەیی، ئەمەش هەمیشە ئەرکێکی ئەنجومەنی ولایەتە تەشریعییەکانە. بەلاّم لە شانشینی یەککگرتوودا ئەوا دەزگا ناحیزبیەکانی سنوری ئینگلتراو ویلز وسکۆتلەندەو ئیرلەندای باکور نزیکەی هەر 10–15 ساڵ جارێك دابەشکردنەوەی بازنەکانیهەڵبژاردن دووبارە ئەنجام دەدەنەوە. سنورە سروشتیەکان (دورگەی وایت بۆ نموونە) و سنورەکانی ئێستای پارێزگاکان و ئارەزوی بۆمانەوە لەسەر یەکێتی کۆمەڵگە ناوچەییەکان چەند پێوەرێکی زێدەن کار لە دابەشکردنی کورسیەکان دەکەن لەولایەتە یەکگرتووەکاندا. هەروەها ئەم زاراوەیە ڕەنگە مانای دابەشکردنی نوێنەران لەنێوان لقەکان و ناوچەو کۆمەڵەکان و ..هتد بەسەر دامەزراوە نوێنەرایەتیەکان لە شێوەی سەندیکاکانی کرێکاران و حیزبە سیاسیەکان بگرێتەوە.

See also : Gerrymandering

## Aristocracy (الارستقراطية) ئەرستۆکراسی

لەبنچینەدا واتە (حوکمی باشترین) لەلایەن دەستەبژێرێکی هەڵبژاردەوە (ڕەنگە هەڵبژاردنێکی خودیش بێت) بەپێی ئەو خاوەنداریە گریمانەییەی بۆ قۆرخکردنی کۆمەڵێك خەسڵەتی دیاریکراو کەویستراوەو وا دادەنرێت کە لەرێگەی لەدایك بوونەوە بە دەست دێت، وەك (دانایی) ﴿(کۆمار)ی ئەفلاتون﴾ بۆ خەوشی رەگەزیی

(نازیەکان لە زەوییە داگیرکراوەکانی ئەوروپای خۆرهەلآتدا) وەجاخ زادەیی هەمیشە پەیوەستە بە مولکداری زەوییەوە (بەریتانیای دەرەبەگایەتی و لەماوەی پاش دەرەبەگایەتیدا) یان چین (چەند بەشێك لە هیند لەسەردەمە جۆراوجۆرەکاندا) . ئەم زاراوەیەش ئەمڕۆ بە شێوەیەکی بەرفراوان بۆ پێناسەکردنی چینێك یان کۆمەڵێکی فەرمانڕەوا بەکار دەهێنرێت کە مافی لە فەرمانڕەوایکردندا لە لەدایکبوونی وەجاخزادەیی بۆماوەیی وەردەگرێت بە پێچەوانەی حوکمی کەمینەوە کە هەقی لەفەرمانڕەواییدا ئەم شەرعیەتەی نییە.

See also : Elite ; oligarchy ;
Technocracy
Arrows, theorem See: Sociol choice; Theory

## Attitudes هەڵوێستەکان (*المواقف*)

بریتیە لەئاراستەکانی کەس سەبارەت بە دامودەزگاکان یان شتەکان وەکو گوزارشتێك لەو فەزڵدان یان هەڵسەنگاندنەکانی ئەو کەسە . هەڵوێستەکان کۆمەڵێك حاڵەتی زهنین .وە لەبەر ئەوەی کە دەکرێت راستەخۆ تێبینی بکرێن ئەوا لە رەفتارەکانەوە بەرهەم دێن (لەناویشیاندا رەفتارە زارەکیەکان).
هەڵوێستەکان لەگروپە ئەقلانیەکانی ترجیا دەکرێنەوە چونکە جێگیر ترن لە پاڵنەرەکان و زیاتر پەیوەندیان هەیە بە تایبەتی بەو بارودۆخانەو ئەو شتانەی کە لەو بیر و باوەڕانەوە وەرگیراون کەلە بنچینەدا گرنگی بەدابەشکردن دەدەن (بیروباوەڕەکانی جیاکاری کە پەیوەستە بە راستی گریمانە ئەزمونیەکانەوە)لە بەها بنەڕەتیەکانەوە سەر هەڵدەدات، بەلآم هاویەك نیە لە گەڵیدا .
پێوانەکردنی هەڵوێستەکانیش بریتیە لەچاودێریکردنی ئەو رەفتارانەی کە گوزارشت لەچەند هەڵوێستێکی دیاریکراو دەکەن هەروەها پۆلێنکردن و شیکاریکردنیشیان.
پێوانەکردنیش گرنگە گرنگی دەدات بە توندی هەڵوێستەکان و ناوەڕۆك و

جێگیریەکانی .ئەو بنەمایانەش دەگرێتەوە زۆر جار بەکارهێنانی ئەو پرەنسیپە تەبەنیکراوانە دەگرێتەوە کەپێك دێت لەو قسەو باسانەی لەبارەی بارودۆخ و ئەو شتە دیاریکراوانە و بەدەستخستنی ئەو بەرپەرچدانەوانە لە ڕووی پلەی پەرچەکرداری ویستراو یا نەویستراو.

لێکۆڵینەوەی هەڵوێستەکان بەکار هاتووە لە زۆر بواری شیکاریکردنی ڕامیاریدا و لەوانەش، رەفتاری دەنگدانی، رەفتاری یاسایی و دادوەری، ڕێکخستن و تێهەڵکێش کردنی ڕامیاریی و پشتگیری سستمی فەرمانڕەوایی.

لێکۆڵینەوەی هەڵوێستەکانیش هەوڵی ڕاڤەکردنی بوونی جۆرێکی دیاریکراو لە سستمی ڕامیاریی دەدات بە ئاماژەکردن بۆ سروشتی هەڵوێستەکان لە کۆمەڵگەدا . هەروەها هەوڵی لێکۆڵینەوەی کەسێتی ستەمکاری داوە، دەرخستنی ئەوەی کە پشتگیری بیروباوەڕە سیاسیە ستەمگەراکان پەیوەستە بەو هەڵوێستە ستەمگەرایانەوە کەبوارێکی زۆر فراوانتر لەرەفتارە کۆمەلآیەتیەکانی لەسەر بەندە .کە هەڵوێستانێکن ڕەنگە ریشەدارین لەشارەزایی هەڵوێستە باوکسالاریەکانەوە لەبەرامبەر دەوڵەتدا

بەکارهێنانی هەڵوێستەکان لە شیکاریکردندا رەخنە لێگیراوە لەبەر چەند هۆکارێك: دەبێتە هۆی گۆرینی یان بەرهەمهێنانی پرۆسەی پشکنینی هەڵوێستەکان لە بری چاودێریکردنیان، وە هیچ شتێك نییە کە لە بنچینەدا لە هەڵوێستەکاندا بپێورێت لەبەرئەوەی کە پێوان هەرەمەکیانە دەسەپێنرێت، هەروەها هەڵوێستەکان تەنها بریتین لەوێنەیەکی سادەو سادەکراوەی هۆکارە ئالۆزو شاراوەکانی پشت کردەوەکانەوە پێشکەش ناکەن، هەروەك چۆن هەوڵە زۆرەکان بۆ ڕاڤەکردنی دیاردە سیاسیەکان بە هێنانەوەی نموونەو هەڵوێستەکان وەك ئاخنراو دەردەکەون.

See also : Behaviouralism ; ideology values.

**Attitude Scaling**

See: attitude

## Autarchy حوكمی خۆیی (الحكم الذاتي) ئۆتارشی

ئەم زاراوەیە بەكاردێت بۆ پێناسەكردنی دەوڵەتێكی سەربەخۆی خاوەن سەروەری یان حكومەتێكی رەها.

**See also : Absolutism;autarky ; autocracy; autonomy; sovereignty.**

## Authoritaranism نەزعەی ستەمكاری (النزعة الاستبدادية)

هەر بیروباوەڕێكە بۆ حوكم كردن بەدەركردنی فەرمانەكان بە بێ گرنگی پێدان یان گرنگی پێدانێكی كەم بەڕای گشتی و مافی تاكەكان و حوكم كردن بە پەسەند كردن یان بیرۆكەی نەیاری شەرعی.

**See also ;Aabsolutism ;democracy Dietatorship; liberalism ;opposition; Puplic opinion ;totalitarianism.**

## Authority(السلطة) دەسەلات

دەسەلاتیش وەكو ئەو چەمكانەی تر كە پەیوەستن پێیەوە وەك هێزو بوونی قەڵەمڕەویی و سەركردایەتی، بنەمایە بۆ زامن كردنی رازی بوون لەسەریان یاخود گوێڕایەڵی بۆ بڕیارێك یان شێوازی كار. لەبەر ئەوە زاراوەكە مانایەكی جیای پێدەدرێت كە پشت بەسروشتی هۆكارەكانی قەبوڵكردن یان گوێڕایەڵی دەبەستێت، بوونی هێزیش هەردەم سزا زۆرە ملێكانی لەگەڵدایەو بوونی قەڵەمڕەویش دەسەلاتیش

هۆکارێکی قەناعەت پێکەریان هەڵوێستێك هاوەڵێتی دەکات، هەروەها سەرکردایەتیش هاوڕێ دەبێت لەگەڵ پشت بەستن بەشێوەیەك لە بالآ بوون کەخەڵکی تەسلیمی بوون.

ئەمە لەکاتێکدا کەوا زۆرێك لە شیکاریەکان پێیان وایە کە بنەمای جیاکەرەوەی دەسەلآت بریتیە لە توانای زامن کردنی ملکەچی یان گوێڕایەڵی لەبەر چەند هۆکارێك کە پەیوەندیان بەبەهاکان یان ئەو ڕێسا بنەڕەتیانەوە هەیە کە بەگشتی دانی پێدا دەنرێت بەوەی کە شەرعیە. ئەم هۆکارە بەرجەستە بووانەیشە لە کەسێك یان دەزگایەك یان بریارێك یان کارێکدا کە پەیوەندی دروست دەکات لە نێوان شەرعیەت و دەسەلآتدا هەروەها پەیوەندی بەو پێناسەیەوە هەیە کە دەڵێت دەسەلآت بریتیە لە پیادەکردنی هێزی شەرع. دەمێنێتەوە پۆلێن کردنی (ویبەر) بۆ جۆرەکانی دەسەلآتی خاوەن قەڵەمرەو، دەسەلآتی تەقلیدی پشت بە داب و نەریتە کۆنەکانی کۆمەڵگە دەبەستێت، دەسەلآتی یاسایی ئەقلآنیش پشت بە پێوەرە یاساییە ڕونەکان دەبەستێت، دەسەلآتی جادوکەر لە جەماوەریش پشت بەسیما کەسیەکانی تاکێکی دیاریکراو دەبەستێت (بەو شێوەیە ئەو جیاوازیانەی سەرەوە لە نێوان دەسەلآت وسەرکردایەتیدا ناشکرا دەبێت) . هەروەها زۆر جاریش جیاوازی تر هەیە لە نێوان دەسەلآتی یاسایی و دەسەلآتی کردەییدا .ئەگەر دەسەلآتیش پشتی بە بنەماکان بەست ئەوا لەگەڵ مافی خواستنی ملکەچیدا دەگونجێت و بەلآم مەرج نیە کەتوانای مسۆگەر کردنی ملکەچیی هەبێت.بەلآم ئەگەر پەکی لەسەر توانای سەپاندنی فەرمانەکانی کەوتبوو ئەوا دەشێ لەو کاتەدا دەسەلآتێکی کردەیی نەبێت. قسەکردن لە بارەی دەسەلآتەوە بەم شێوەیە ڕون نەکردنەوەی جیاوازی لەنێوان دەسەلآت و هێزدا دەگەیەنێت.

See also: headership ;legitimacy ;power.

## Autocracy (ئۆتۆكراسی) حكم الفرد (حوكمی تاك)

شێوەیەكە لە ستەمكاری كەدوو ڕواڵەتی ئاشنای هەیە: پیادەكردنی دەسەڵات لەلایەن یەك سەركردەوە، هەروەها پیادەكردنی دەسەڵاتی ڕامیاریی لە ڕێگەی ئیرادەی هەڕەمەكی سەركردەوە لە بری مومارەسەكردنی ئەو دەسەڵاتە لە ڕێگەی یاسا ناسراوەكانەوە ئەمەیش بەبێ هەست كردن بەهیچ لێپرسراوییەتێك بەرامبەر جەماوەری هەڵبژێردراوان یان هەر دەستەیەكی ڕامیاریی تر. نموونەی ئەم جۆرە سەركردانەیش ستالین و هتلر و وعیدی امین لە ئۆگنداو فرانسوا دوفالییە (بابادوك) لە هایتی.

See also : Absolutism ; autarchy; dictatorship; totalitarianism.

## Autonomy ئۆتۆنۆمی (الحكم الذاتي)

ئەو دەوڵەتانەی كە خاوەنی سەروەرین خاوەنی مافی (ئۆتۆنۆمی) خۆ بەڕێوە بردنن لەو شتانەدا كە پەیوەندی بە دەوڵەتانی ترەوە هەیە.

حكومەتە هەرێمایەتیەكانیش خاوەن مافی خۆبەڕێوەبردنن لە چەندین بواری دیاریكراودا لەدانانی یاساكان كە حكومەتی مەركەزی پێی دەبەخشێت. هەروەها دامەزراوە كۆمەڵایەتیەكانیش بەهەمان شێوە مافی خۆبەڕێوەبردنیان دەدرێتێ لە دانانی ئەو ڕێسایانەدا كە گورەپانی چالاكیەكانی بەڕێوە دەبات. ئەم زاراوەیە بەشێوەیەكی گشتی لە شیكاریی ڕامیارییدا بەمانایەكی جیاوازو نادەستوری بەكار دەهێنرێ.چونكە (خۆ بەڕێوەبردنی دەوڵەتێك) ئاماژە دەكات بۆ توانای دەوڵەت بۆ كاركردن لە پێناو بە دیهێنانی بەرژەوەندیە دیارو ئاشكراكانیدا نەك نواندنی بەرژەوەندیەكانی گروپە كۆمەڵایەتیەكان وبەتایبەتیش چینێك یان چینە باڵادەستەكان یان كاركردن لەبرییان.

See also: Autarachy ; federation; marxism ;sovereignty ; state .

**Axiom** (*البديهية*) (بەلگە نەویستێتی)

گریمانەیەکە لە شیکاریی زانستی یان زانستی کۆمەڵایەتیدا وا دادەنرێت کە روونە و سەلماندنی زیاتری ناوێت . بەم شێوەیە ئەوا بەلگەنەویستەکان گوتەی بنـەڕەتین و بنەما بنەڕەتیەکانی لقێکی زانستی پێـك دەهێـنن کـە دەکرێـت لێیـەوە گریمانـەکان و پاساکان و تیۆرەکان پەرەیان پێبدرێت.

# B

## Balkanization (البلقنة) بەلكەنە

بریتیە لەپرۆسەی بەش بەش کردن بۆ چەند دەوڵەتێك یان چەند تاییفەیەك کە هەندێکیان دژ بە هەندێکی تریان دەوەستنەوە .ئەم پرۆسەیەش کە بە بەڵکەنە ناو دەبرێت هەمیشە لایەنێکی دەرەکی دروستی دەکات و هەوڵی دابەشکردنی دراوسێکانی یان رکابەرەکانی دەدات. ئەم زاراوەیەش یەکەم جار بەسەر ئەو رامیاریەدا پراکتیزە کرا کەروسیا گرتییە بەر بەرامبەر دەوڵەتانی نیوە دورگەی بەڵکان لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا.

## کاریگەری پێشبینی کردن بە سەرکەوتن (تأثير التنبوء بالفوز)
## Bandwagon Effect

زیادکردنی پشتگیری پاڵێوراوێك یان حیزبێك لە هەڵبژارنەکاندا، کە بەهۆی راگەیاندنی پێشبینیەکەوە بەئەنجامێکی چاوەروانکراوی ئەو هەڵبژاردنانە لە بەرژەوەندی پاڵێوراوەکە یان حیزبەکە دەبێت (بۆ نموونە )، بەبلاوکردنەوەی دەرەنجامەکانی راپرسیەکە، بەبێ ئەو راگەیاندنەش ئەوا زیاد بوونەکە روی نەدەدا، یان زیاد بوون کەمتر دەبوو.

See also : underdog effect

**تیۆری سازشکردن** *(نظرية المساومة)*

**Bargaining Theory**

بریتیە لەلێکۆڵینەوەی دانوستان (بەدانووستانی رامیارییشەوە) لە رێگەی رێبازی جۆراو جۆرو نموونە گەلێکی شێوەیی و تیۆرەکانەوە ...هتد. لەو رێگە بەکار هاتووانەیش تیۆری یاریەکان و ئەزمونکردنی کۆمەڵە بچوکەکان و شیکارییکردنی شێوەیی وەرگیراو لە زانستی ئابوری و لێکۆڵینەوەی ململانێکان و رێگا دەروونیەکانەوە. وە لە بابەتەکانی جیی بایەخی سەرەکی لە لێکۆڵینەوەی سازشکردنی رامیارییدا ئەو چوار چێوە دامەزراوییەیە کە تێدا سازش روو دەدات و بەهاکانی ئەو رەگەزە بە شداربووەکان و رێگاکانی گەیاندنی بژاڤەکانی سازش و تواناکانیقەبوڵ کردنی چارەسەرە دیارەکان و رێگاکانی تەواو کردنی پرۆسەی سازشکردن ....هتد بوارەکانی رەفتاری رامیاریی کە پەیوەستن بە تیۆری سازشەوە پێکهاتەکانی ئیئتلاف و دانوستانی نێو دەوڵەتی دوولایەن یان فرە لایەن و رەفتاری تەشریعی دەگرێتەوە، بەتایبەتیش کاتێك کە دیسپلینی حیزبی ئاسان بێت و دانوستان لەو لیژنەو هەڵبژاردنانەدا کە تێیدا دەنگدان بە شێوەیەکی ئاشکرا دەبێت نەك بە دەنگدانی نهێنی.

**Seealso; conflict approach ; gametheory .**

**Behaviouralism** *(التحليل السلوكي)* **شیکاریی رەفتاریی**

زاراوەیەکە زۆر جار بە شێوەیەکی رەخنە گرانە جێبە جێ دەکرێت بەسەر ئەو شیکارییەی کە زۆربەی یاخود هەموو ئەم پابەندبوونانە دەخاتە روو: ناکرێت زانستی

ڕامیاری بێ لایەن بێت و ناکرێت لایەنێك نەبێت بۆ ئەو تیۆرانەی کە زیاتر گشتیترن بۆ ڕەفتاری تاکی، یەکەی بنەڕەتیش بۆ شیکاریی ڕامیاریی ئەو تاکەیە کە لەناو ژینگە ڕامیارییەکە هەڵسوکەوت دەکات، هەروەها پێویستە کە ڕاڤە کردنە زانستیە چەسپاوەکان و گریمانەکان و بەکارهێنانی شێوازەکانی چەندیەتی ڕەخساو،پەرەی پێ بدرێت هەروەها پێویستە خۆ لەو زانیارییە گریمانکراوەکان بەدوربگیرێت و پێویستە ڕێگە نەدرێت بە بەها کەسییەکانی توێژەر کە دەست بخاتە توێژینەوەکانەوە.

بانگەشەکەرانی ئەم ڕێبازە هەوڵی ئەوە دەدەن کە خۆیان لەو ناتەواوییە سەرەکیانە لادەن کە لە بەرنامەکانی تردا دەیبیننەوە : ئارەزوو بۆ وەسفکردنی ناتیۆری و جەخت کردنەوە لەلایەنە یاساییو دەستوریەکانی دەوڵەت و ئامادەبوون بۆ تێکەڵ کردن لە نێوان مەسەلە پێوانەییەکان و مەسەلە ڕاستەقینەکاندا. پێویستە جیاکاری لە نێوان شیکاریی ڕەفتاریی (Behaviouralism) و ڕەفتارگەرایی (Behaviourism) دا بکرێت. چەند لێکچونێکیش هەیە لە نێوانیاندا لە هەندێك لایەنەوە بەڵام زاراوەی ڕەفتارگەرایی تەسکترە، بەتایبەتی ئەو میتۆدێکە لەلێکۆڵینەوەی زانستی دەروونناسیدا. ڕەفتارگەرایی ئەوە دەگەیەنێت کە تیۆری دەروونی پێویستە ئاماژە نەکات بەودیاردانەی دەکرێت تێبینی بکرێن بە شێوەیەکی ڕاستەخۆ و پێوانە بکرێن بەشێوەیەکی بابەتی. لەبەر ئەوە کە حاڵەتە زهنیەکانی ڕەگەزەکایش بەم پێوەرانە ڕازی نابێت ئەوا پێویستە خۆ لەهەر ئاماژەیەك بۆهەست لابدرێت و هەروەها پێویستە زانستی دەروونناسی تەنها دیاریکردنی ئەو پاڵنەرو پەرچەکردارانە لەخۆ بگرێت کە پەیوەندیدارن و مامەڵە لەگەڵ ئەو زهنەی کە چووەتە ناو ڕەگەزەکەوە بکات وەکو ئەوەی سندوقێکی ڕەش بێت، هەروەها شیکاریی ڕەفتاریی زۆر جار ڕەخنەی لێدەگیرێت بە هۆی ڕاڕایی لەڕادەبەدەری و ڕۆیشتنی بۆ دورتر لەوەی تێبینیکراوە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆو بەهۆی ڕوکەشی تیۆری بەرهەمهاتوو و هەروەها بەهۆی هەڵبژاردنی بوارەکانی توێژینەوە ئەوانەی کە

شیاوترینین بۆ پێوانە کردن نەك بە هۆی گرنگییانەوە یا ئەو گرنگییەوە کە دەیخاتەوە هەروەها بە هۆی ئەو بانگەشە ساویکانەیەوە کە هەندێ جار سەبارەت بە ئازادی بەها دەریدەبڕێت (واتە بێ لایەنی پێوانەیی **Normative neutrality**) ئەو پابەند بوونە ئاشکرایە بە ڕێبازی ڕەفتارییەوە ئاشکرایە بە تایبەتی لە زانستی ڕامیاریی ئەمریکیدا لە پەنجاکاندا سەرەڕای بوونی ئاراستەیەکی هاوشێوە لە چەند توێژینەوەیەکی زۆردا بە درێژایی ئەو سەدەیە.

**See also : Blick box techrigue; empiricism normative theory ; operationali zation ; political behaviour ; political science ;positivism .**

## Bicameral (ثنائي المجلس) جووت ئەنجومەن

ئەم زاراوەیە ئەو دەسەڵاتە تەشریعیە وەسف دەکات کە دوو ئەنجومەنی هەیە وەك ئەو ڕژێمەی کە هەیە لە زۆرینەی هەرە زۆری دەوڵەتە دیموکراسیەکاندا و هەموو دەوڵەتە فیدراڵەکان و پەنجا ویلایەتەکەی ئەمریکادا یەك ولایەتیان نەبێت، لەو دەسەڵاتە تەشریعیانەدا کە دوو ئەنجومەنیان هەیە شتێکی باوە کە ئەنجومەنی نوێنەران هەڵبژێرن بەهەڵبژاردنێکی ڕاستەوخۆ، ئەمە لە کاتێکدا کە ئەندامێتی ئەنجومەنی باڵا دەرئەنجامی ڕێگەیەك یان کۆمەڵێك ڕێگا بێت: بۆ ماوەیی (ئەنجومەنی لۆردەکان لە پەرلەمانی بەریتانیادا) و ناونان (ئەنجومەنی پیرانی کەنەدی) داواکردن لەلایەن حکومەتە هەرێمیەکانەوە (البندسترات لە ئەڵمانیا) یان هەڵبژاردن (ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکی) . کارەکانی ئەنجومەنی دووەم و گرنگیەکەی زۆر جیاواز دەبن لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێکی تر. زۆریان کاری پێداچونەوەی پێشنیارە تەشریعیەکانیان هەیە هەندێکیشیان مافی هەڵوەشاندنەوەی تەشریعی پابەندیان هەیە. لە دەوڵەتە یەکگرتووەکانیشدا وا باوە کەئەنجومەنی باڵا

فـەرمانی سـەرەکیی هـەبێت بـە نواندنییمافـەکانی پارێزگاکـان و بەرژەوەندیـەکان و بەرگری لێیان.

See also : federation ; unicameral .

## Bipolarity (القطبية الثنائية) جەمسەرگیر یی دوانەیی

مەیل و ئارەزوی رەگەزەکانە بۆ کۆبونەوە لەدەوری دوو ناوەندی پەرگیر لە سـەر هەمان پێپەیژەدا. لەبەرئەوە زاراوەکە لە زانستی ڕامیاریدا لە دوو ڕەوتدا بە تایبەتی بەکار دەهێنرێت. زاراوەکـە لەپەیوەندیـە نێو دەوڵەتیەکانـدا ئامـاژە بـە کۆبونـەوەی دەوڵەتەکان لە دوو بارستە یان دوو هاوپەیمانیەتی دژدا دەکات بە تایبـەتی لـە سـاڵی 1945 ەوە لـە رووبونـەوەی جـەنگی سـارددا لـە نێـوان وڵاتـە یـەکگرتووەکان و هاوپەیمانەکانیـدا لـە لایەکـەوەو بارسـتەی سـۆڤیەتیش لـە لایـەکی تـرەوە. هـەروەها زاراوەکە لە هەڵبژاردنەکاندا ئاماژە بۆ ئـەو حاڵەتـە دەکـات کـە تێیـدا دەنگدەران لـە نێـوان دوو حیزبـی دژ بەیەکـدا یـان دوو بارسـتەی حیزبـی ململانێکـەردا یـەکێکیان هەڵدەبژێرن، زۆر جاریش ئاماژە بۆ ئەم حاڵەتە دەکرێت کەوا کەمتر وردبینـی تێدایـە بەوەی کە حاڵەتێکی جەمسەرگیربوونە.

See also : polarization.

## Black Box Technique (اسلوب الصندوق الاسود) شێوازی سندوقی رەش

هەر شێوازێکی شیکاریی کە بیرۆکەی (سندوقی رەش) بـەکار بهێنێـت بـۆ ئامـاژە کردن بۆ کۆمەڵێکی ئاڵۆز لە کارلێکەکان. ئەم (سندوقی رەشە) لە شـیکاریکردندا بـە هیچ جیـا ناکرێتـەوە مەگـەر بـە دەروازەو دەرەچـەکانی نـەبێت وە بـۆ مەبەسـتەکانی

شیکار یکردن بێئاگا بوون لەهەر پرۆسەیەکی ماڵ پێدان (تمویل) دابڕاو لەسندوقی ڕەش بەئاکام دەگات. ئەم شێوازە، بە کار هێنراوە لە شیکاریی دەروونی و ڕەفتاری و شیکاریی ڕێکخستنی و ئەو میتۆدانەی کە پشت بە سستەمەکان دەبەستن لە شیکاریی ڕامیارییدا ...هتد لەنموونەکانی شیکاریی سستمێکی ڕامیاریدا لێکۆڵینەوەی ڕەوشی ڕامیاریەکانە کە لەچونە ناوەکانی لەحیزبەکان و کۆمەڵەی بەرژەوەندیەکان دەکۆڵێتەوە هەر وەك لە دەرچووەکانی شێوەی بڕیارەکان سەبارەت بە ڕامیارییەکان دەکۆلێتەوە، ئەمە لەکاتێکدا کە دەسەلآتی یاسادانان یان ئەو دەستەیەی کە ڕامیارییە دادەمەزرێنێت دادەنرێت بە (سندوقی ڕەش)بەخۆ بێئاگاکردن لەو ڕیێو شوێنانەی کەچوونە ناوەکانی تێدا گۆڕاوە بۆ (دەرچووەکان) لەبەکارهێنانی چەمکی (سندوقی ڕەش) بەم شێوەیە ڕەنگە بە هۆی ئەو زیادەڕەوییەوە بێت لە ئاڵۆزکردنی پرۆسەکانی وەرچەرخاندا یان لەبەر ئەوەی کە پەیوەندی نیە بە مەبەستەکانی ئەو شیکارەوە بەتایبەتی.

## دەنگدانی بارستە (*تصويت الكتلة*) Block vote

سستمێکە بۆ دەنگدان کە تێیدا نوێنەرەکان دەنگ دەدەن لە بری ئەو کۆمەلآنەی کە نوێنەرایەتیان دەکەن بە دەنگدانێك کەلەسەر دەنگە جیاوازەکان نەوەستاوە و بەپێی قەبارەی ڕێژەیی ژمارەی ئەندامانی کۆمەڵەکە حساب دەکرێت کە نوێنەرەکان نوێنەرایەتی دەکەن. سەندیکا کرێکاریەکان کە ئەندامن لە کۆنگرەی حیزبی کرێکاراندا و کونگرەی سەندیکا کر ێکاریەکان (لە بەریتانیا) بۆ نموونە بەم شێوەیە دەنگدەدەن. هەروەها دەنگەکانی ولایەتەکان لە گشتێتی هەڵبژاردندا بۆ هەڵبژاردنی سەرۆك و جێگری سەرۆك لە ولایەتە یە کگرتووەکاندا دەدرێن بەو پێیەی کە دەنگدانی بارستەیە.

**See also : voting.**

## Bolshevism (البلشفية) بەلشەفیزم

بیرو باوەڕێکە کەلە شیکاریی لینین بۆ پەرەسەندنی سەرمایەداری پێکدێت، و بەرنامەی ڕێکخستنی حیزب و چالاکی شۆڕشگێڕەکانی پێوە دەبەسترێتەوە هەروەها بنەما سەرەکیەکەی ئەو ڕایەیە کە دەڵێت سەرمایەداری لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمەوە چووەتە قۆناغی کۆلۆنیالیستی کۆتاییەوە . وە دابەشکردنی جیهان لە نێوان دەوڵەتە سەرمایەدارە گەورەکاندا ڕێگە لە پەرەسەندنی سەرمایەداری تەواو و ناوچەیی لە ولآتانی نموونەی ڕوسیادا دەگرێت، کارگەری روسی لاواز خۆیشی پێویستە یەکەم هەل بقۆزێتەوە بۆ شۆرش بە دروستکردنی هاوپەیمانێتی لەگەڵ کۆمەڵەکانی تردا بە تایبەتی جوتیاران، وە حیزبێکی خاوەن ڕێکخستنێکی باڵآ پێویستە ململانێ ی شۆڕشگێڕی ببات بەڕێوە بە بەکارهێنانی هەر ئامرازێکی نهێنی و توندی پێویست هەروەها دەبێت ڕۆڵی حیزب و یەیکەرەکەی بمێنێتەوە پاش بەدەستهێنانی دەسەلآتی دەولەت بۆ ئەوەی تەرزێکی نوێ لە دەولەت دابمەزرێنێت هەروەها ببێتە تاکە نوێنەری ڕاستەقینەیً کرێکاران و جووتیاران و ئەو چالاکیە تێك بشکێنێت کە دژ بە شۆڕش کار دەکات ﴿ (لینین) لەماوەی زۆربەی ژیانی ڕامیارییدا رەتی ئەگەری بەرپابوونی شۆڕشێکی سۆشیالیزمی دەکردەوە کە لە روسیادا روو بدات لە بری ئەوەش هەولی بەرپاکردنی شۆڕشێکی بورجوازی دیموکراسی ریشەیی دا بۆ دروستکردنی بنەمایەکی باشتر بۆ ململانیی ئاشکرا لە پێناوی سۆشیالیزمدا . سەرەڕای ئەمەیش سالی 1917 ئەو بۆچوونەی گۆڕی هەتا ڕێگەی بۆ هەولدانێکی شۆڕشگێڕی بە شێوەیەکی زیاتر ڕاستەوخۆیانە لە پێناو سۆشیالیزمدا بدات ﴾.

ناکۆکی سەبارەت بە م مەسەلانە بووە هۆی کەرت بوون لە حیزبی کاری دیموکراسی کۆمەلآیەتی روسیدا (کە ناوەکەی گۆڕی بۆ حیزبی شیوعی یەکێتی سۆڤیەت لە سالی 1918) دا، لە کۆنگرەی دووەمیدا سالی 1903. لینین و پشتیوانەکانی زۆرینە

بوون له حیزبداو دواتر بەناوی (بەلشەفیەکان ) وە ناسـران (ئەنـدامانی زۆرینـە) بـە پێچەوانەی (مەنشیفیەکان) (ئەندامانی کەمینە) وە . پاشان ئەم زاراوەیـە مایـەوە و برا بەسەر حیزبی شیوعی یەکێتی سۆڤیەتدا،بەو شێوەیە زاراوەی (بەلشەفیەت) وای لێهات برا بەسـەر هـەموو لایەنـەکانی بیروباوەڕو مومارەسـەی شـیوعیەتی سـۆڤیەتدا .جۆزیـف سـتالینی جێگـرەوەی لیـنین بـەردەوامی بەهەوڵەکانیـدا بـۆ بـە دیهێنـانی ئامانجی (سۆشیالیزم لە یەك ولآتدا) بەشێوەیەکی دڕندانەو دیکتاتۆرانە و توند . ئەو حیزب و ڕامیاریە شیوعیانەیش کە ئاراستەیەکی هاوشێوەی ئەمە دەگرنە بەر زۆر جار بە (ستالینیەت) پێناسە دەکرێن، هەروەها ئەو ڕاو بۆچونانەیش کـە پەیوەسـتن بـە لیون تروتسکی یەوە کە لە سەرەتادا مەنشەفی بوو پاشان بوویە بەلشەفی و یـەکێك لـە ڕکابـەرەکانی سـتالین بـە (تروتـسکیەت) پێناسـە دەکرێـت . تروتـسکیەتیش بـە شـێوەیەکی تایبـەتی پێـك دێـت لـە نێـو نەتـەوەیی و پابەنـد بـوون بـە شۆڕشـی جیهانیەوە، سەرە ڕای ئەو ڕایەش کە دەڵێـت سـەرکەوتنە پـێش وەختـەکان ئەگـەری زیاتریان هەیە لـە وڵاتـە جـۆراو جۆرەکانـدا لەکـەڵ بـڕوا بـوون بـە پێویـستی دووبـارە بونیادنانەوەی کۆمەڵگاکان لە ژێرەوە و بـە شـێوەیەکی بـەردەوام وفـراوان (شۆڕشـی بـەردەوام) وە سـتراتیژیەتی چـوونە نـاوەوە . (E n trism , entryism) دزەکردن و تێکدانی حیزبەکان و بزوتنەوەکانی تر.

**See also : communism , imperialism ;marx ism;**
**Social class ; socialism**

**Bourgeoisie see:social class.**

**Bourgeoisification See:Embourge –oisement.**

## Budget (الميزانية) بودجه

لەدامودەزگا رامیارییەکانی وەك دەسەلاتە حكومیە ناوچەییەکان و دەولـەتان و کۆمەلەی ئابوریی ئەورووپی یا ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکاندا.

بودجـە دادەنرێـت بـە بـەیانی خـولیی دەرامەتـە چـاوەڕوانکراوەکان (لـە شـێوەی باجەکان و رسوماتەکان و داهاتی تردا) کە بەشێوەیەکی گشتی بە سـتراوەتەوە بـەو خەرجیە پێشنیارکراوانەوە کە هەمیشە بـۆ دوانـزە مـانگ دادەنرێـت . سـەرەڕای ئـەو وەزیفە ڕواڵەتیە (الشكلية) یەشـی بـەو پێیـەی کـە بودجـەی گشتییە ئـەوا بودجـە لەهـەمان کاتـدا دیکـۆمێنتێکی رامیاریـشە کـە گرنگیـەکی گـەورەی هەیـە، هـەروەها ئاماژەشە بۆ ئەو ناوەندە کە حكومەتەکان دەیدەنـە وەزارەتـەکانی دارایـی و سـوور بـوونی ئەنجومەنـەکانی یاسـادانان لـە سـەر پاراسـتنی مافـەکانی و دەسـکەتەکانی سەبارەت بە پرۆسەی دیاریکردنی بودجە. لەبـەر ئـەوەیش کـە زۆربـەی ڕامیاریـەکان پێك دێت لە خەرجییەکان یان گرنگی دەدات بە دووبارە دابەشکردنەوەی سامان ئـەوا زاڵ بـوون بەسـەر بودجـەدا لـە راسـتیدا واتـە زاڵ بـوون بەسـەر دەسـەلاتی جـێ بەجێکردندا.

زاڵ بوونێکی لەم جۆرەش کە بەپرۆسەیەکی درێژ بووەوە دادەنرێت بۆ مـاوەی ساڵێك زیاتر، خەرجییە پێشبینی کراوەکانیش سەبارەت بە پرۆژەکان درێژ دەبنـەوە بۆ چەند ساڵێك زیاتر ئەوا سستمەکانی بودجە پەرەی پێ دراوە بۆ مـاوەی درێـژ تـر هەروەها پێکەوە گرێدانی ئاشکرای نێوان ئامادەکردنی هاوسـەنگی و هەڵسەنگاندنی ئامانجە حكومیەکانی وەك سـستمەکانی نەخشەکێشان –بەرنامەرێژی _ هاوسـەنگی کردن.

## Buffer state (الدولة العازلة) دەوڵەتی دابڕکەر

ئەو دەوڵەتەیە کە دەکەوێتە نێوان سنوری دوو دەوڵەتی گەورەتر لە خۆیەوە و بەهۆی شوێنەکەیەوە ئەگەری هێرش کردنی هەر لایەك لەو دوو دەوڵەتە بۆ سەر ئەوی تر کەم دەبێتەوە بەهۆی هەڵوێستی بێ لایەنیەوە بەرامبەر ئەو دوو دەوڵەتەی کە ڕەنگە بە شەڕ بێن بەهۆی زەوییەکانیەوە کە دەکەوێتە نێوانیانەوە. پۆلەندا دەوڵەتێکی دابڕکەر بوو لە نێوان یەکێتی سۆڤیەت و ئەڵمانیادا لە ماوەی دوو جەنگەکەدا هەتا ئەو هاوپەیمانیەتەی کە لە ساڵی 1939 لە نێوان یەکێتی سۆڤیەت و ئەڵمانیای نازییدا مۆرکرا .

## Bureaucracy (البيروقراطية) بیرۆکراسی

ئەم زاراوە لە بەکار هێنانە زۆر باوەکەیدا مانای ئەو شێوە کار بەڕێوبردنە دیاریکراوەی هەر کۆمەڵێك لە فەرمانبەرە حکومیەکان (یان کارگێڕەکانی تر) دەگرێتەوە کە سیمایەکی دیاریکراویان هەیە کە جۆرێکە لەزیادەڕەوی لە ڕواڵەتگەراییدا، بەکارهێنانی ئاخنین و قورسی لەپەیوەندیەکانداو، ڕەقی لە لێپێچینەوەکانداو، سوور بوون لە سەر پێدانی دەسەڵات بە دامودەزگاکانیان، و سەپاندنی کۆتەکان بە سەریدا . بە دەستەواژەیەکی تر ئەوەی پێ دەوترێت (هیلّیسور) یان ڕۆتینی حکومی. زانایانی کۆمەڵناسی نموونەی کۆرزیە زاڵ بوون و شوێنەواری پەیکەرەکان و ڕێکخستنەکانی (بیرۆکراسی) یان لەم شێوەیە شیکردوەتەوە .چەمکی بیرۆکراسی لە زانستی کۆمەڵناسیدا زیاتر ڕوون و بێ لایەنە. مانا پێشینەکەشی مەیلی بەلای (حوکمی فەرمانبەران)دا هەیە (نەك حوکمی سیاسیە هەڵبژێراوەکان یان فەرمانڕەوا میراتگرەکان) هەتا بەهۆی بەکارهێنانیەوە دەگورێت بۆ زاراوەیەك کە پێناسەی شێوازێکی دیاریکراو لە ڕەفتاری کارگێڕی

دەكات  كە پەیوەستە بە چەند جۆرێكی دیاریكراوەوە لەڕێكخستنی كۆمەڵایەتی.وە دەكرێت دیاری بكرێت بە گەڕانەوە بۆ كۆمەڵێك پێوەری بابەتی. بە گشتی ئەم زاراوەیش پەیوەستە بە كارگێڕی رامیارییەوە هەروەها دەكرێت شێوەیەك لە كارگێڕی ئایینی یان پەروەردەیی یان پیشەسازی .. هتد بگرێتەوە. پێناسەی تەقلیدی بۆ بیرۆكراسی بەو پێیەی دیاردەیەكی كۆمەڵایەتیە ئەو پێناسەیەیە كەوا ماكس ویبر پێشكەشی كردوە و پۆلێنی كردوە وەك یەكێك لە سێ (جۆرە نمونەییە) كەی حوكمڕانی كردن . هەروەها پێوەرەكانی رێكخستنی بیرۆكراسی بەم شێوەیە دیاریكردووە : بوارەكانی رێپدانە رەسمیەكان كە یاساكان یان رێساكان دایدەنێن . هەوەها بنەمای قوچەكی دامودەزگا، ئەمەیش ئەو هێڵە ئاشكرایانە دەگرێتەوە بۆ سەرپەرشتیكردنی دامودەزگا باڵاكان بەسەر ئەو دەزگایانەی كە لە خوارەوەی ئەمەوەن، هەروەها ئەو كارەی پشت بە پارێزگاری تۆمارە نوسراوەكان (مەلەفەكان)دەبەستێت راهێنانی فەرمانبەران و تایبەتمەندكردنیشیان لە لێهاتوویی بەرێوبردنی نوسینگەدا. وە تەرخانكردنی گرنگی پێدانی تەواوی فەرمانبەرەكان بۆ چالاكی رەسمیان لەماوەی كاتژمێرە دیاریكراوەكانی كار كردنیاندا، وەبوونی رێسای كاری دیاریكراوو گشتی كە هەموو فەرمانبەرەكان بكرێت فێری بن. بەو شێوەیە بیرۆكراسیەت پوختەی رێكخستنی ئەقلانی بوو لە رامیاری و رێكخستندا بە پێچەوانەی ئەو رێكخستنەوە كە پشت بە چاودێری و تیرە گەری و پابەند بوونی بیرو باوەڕ یان بنەماكانی ترەوە هەیە . لە بەرئەوە پێكهاتبوو لەخزمەتكردنی پیشەیی كە ئەمیش لەسەر دیاریكردن ((التعیین)) وەستا بوو و خاوەنی بارودۆخ و ماوەیەكی دیاریكراو و مانگانەیەكی پەیوەست بە پلە و بەرەو پێشچوونێكیش بەپێی زنجیرەیەكی زانراوی ئەركەكان. هەروەك چۆن پێشو وەخت چەند سیمایەكی دیاریكراوی بۆ كۆمەڵگا دانا بوو لە نموونەی بوونی ئابوورییەكی نەختی و رێكخستنێكی فراوان بۆ ئەركەكان وداهاتەكان و فەراهەمكردنی رێگا نوێیەكان بۆ پەیوەندیكردن و قەبوڵكردنی فەرهەنگی و (ئەقلانیەت) لەوەرگرتنی بڕیارە كار گێرەیەكان نەك مەنسوبیەت و

بەرتیل) دەسەلاتی یاسادانان بەو پێیەی کە بنەمایەکی شەرعیە بۆ سەرکردایەتی و ئارەزوو بۆ ناوەندیەتی دەسەلات. بیرۆکراسیش شوێنەواری خۆی هەبووە لە ڕێکخستنی کۆمەلایەتیدا: ئارەزوو بۆ بەردەوام بوونیو گۆڕانکارییە پەروەردەییە ئاراستە کراوەکان بەرەو کارپێکردن لەبوارەکانی کارگێڕیدا لە سەر بنەمای شارەزایی، هەروەها ئارەزوو بۆ بەدیموکراسی کردنی ژیانی ڕامیاریی، ڕەنگە لەسەر بنەمای (حزبی جەماوەری) و لەئەنجامی دامەزراندنی بنەمای مەعقولیەت (نەك بیرو باوەڕ یان ئەو چاودێریەی کە لە سەر بنەمای چین یان بنەماکانی تر بێت) لە بڕیاردانەکاندا و دامەزراندنی ئاشکرا لە پۆستە کار گێڕیەکاندا . لێکۆڵینەوە تیۆری و ئەزمونیەکان لە بیرۆکراسیەتدا، لە نێوان مەسەلەکانی تردا جەختیان کردووەتەوە لە سەر لێپێچینەوەکانی وەرگرتنی بڕیارەکان لە ناو دەزگا بیرۆکراسیەکان و ڕامیارییە ناو خۆییەکانی دامەزراوە بیرۆکراسیەکاندا .

**See also : Authority : idealtype ;**
**pubilc administration .**



## Cabinet (کابینه) ئەنجومەنی وەزیران (*مجلس الوزراء*)

لیژنـەی وەزیـرە سـەرەکیەکانی حکومەتـە بـۆ مەبەسـتەکانی گفتوگـۆکردن لەسـەر کاروبارەکـانی دەسـەڵاتی جێبـەجێکردن بەشـێوەیەکی نهێنـی و وەرگرتنـی بڕیـارە سیاسیە پێویستەکان بۆ چارەسەرکردنی کاروبارە هەڵواسراوەکان، هەروەها دارشتنی رامیارییە نویێ یەکان لەو وڵاتانەدا کە رژێمی هەیە (حکومـەتی ئەنجومـەنی وەزیـران Cabinet government). ئەنجومـەنی وەزیـرانیش بـە شـێوەیەکی گـشتی سەرۆکی وەزیران سەرۆکایەتی دەکات یان لـە هەنـدێك سـستمدا سـەرۆکی دەوڵـەت . ئەنجومـەنی وەزیـرانیش لـە زۆربـەی دەوڵەتـە دیموکراسـیەکان و لـە وڵاتـە گەشـە سەندووەکاندا هەیە. ئەندامیەتیش لەو ئەنجومەنەدا بـە گـشتی کـورت دەبێتـەوە لـەو وەزیرانـەدا کـە لێپرسـراون لـە وەزارەتـە سـەرەکیەکانی دەوڵـەت، بـەو شێوەیە ئـەو ئەنجومەنە زۆربەی جار پێك دێت لەوەزیرەکانی حیزبـی دەسـەڵاتدار یـان حیزبـەکانی حکومەتی ئیئتلافی،دەشێ لەنێوان ئەندامەکانی ئەنجومەنی وەزیرانیـشدا ژمارەیـەکی کەم لەسیاسیە سەرەکیەکان لەوانەی کە پلەی بێ پۆستیان هەیە بەشدار بـن (وەکـو لـۆردی سـەرۆکی ئەنجومـەن یـان راوێـژکاری (دۆقیـە) لانکـستر،وە لەکاتێکـدا کەحکومەتی پارێزگاران لە حکومەتدا بێت،ئەوا سەرۆکی حیزب لە بەریتانیا) .

زۆربەی ئەو رێکخراوانەی کە پشت دەبەستن بەبوونی ئەنجومەنی وەزیران زۆربەی کـارو وەرگرتنـی بڕیارەکـان بـۆ لیژنـەکان رەوانـە دەکـەن (بەتایبـەتی لـە شانـشینی یەکگرتوو و فەرەنساو ئیسپانیا)، ئەگەر چی لەهەندێك لەوڵاتاندا نموونـەی ئـەڵمانیا و ئیرلەندا و پەرەسەندنی لیژنەکان پەراوێزی بـووە. دەسـەڵاتی ئەنجومـەنی وەزیـران و لەوێـشەوە لێپرسـراوێتی رامیـاریی هاوبـەش وـــ لیژنـەکانی لـە کـاتی پێویـستدا

لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر جیاواز دەبێت، لەبەریتانیادا زۆر بەهێزەو لەئەڵمانیادا کەمتر بەهێزە و لەویش کەمتر لە رێکخراوە سەرەکیەکاندا یان نیمچە سەرەکیەکاندا وەکو لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا ولەکۆماری فەرەنسی پێنجەمدا . لە چوار چێوەی رامیاریی فەرەنسیدا و سستمی رامیاریی بۆ کۆمەڵەی ئەوروپی پێویستە ئەم زاراوەیە جیا بکرێتەوە لەزاراوەی کابینە ( Cabinet)بەمانای دەستەی وەزیر یان کۆمیساری کۆمەڵەی ئەوروپی دێت کە کۆمەڵەیەکی بچوکە لەو فەرمانبەرانەی کە وەزیر یان کۆمیسار دایاندەنێت بۆ پێشکەش کردنی راوێژ و یارمەتی.

See also : Executive

## Capitalism ( *الرأسمالية*) سەرمایەداری

شێوەیەکە لە رێکخستنی ئابوری کەتیایدا ئەوانەی بە شێوەیەکی تایبەتیخاوەنی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان یان (سەرمایە)ن و دەستیان بەسەردا گرتووە موچە ئەدەن وە بە کرێکاران لەبەرامبەر بەکارهێنانی کارەکانیان لەگەڵ ئامرازەکانی بەرهەمهێناندا بۆ بەرهەمهێنانی شمەك بۆ مەبەستی ئاڵوێری بازرگانی قازانج کردو و کۆکردنەوەی بڕێکی زیاد لە سەرمایە . (کۆمەڵگا سەرمایەدارەکان) ئەو کۆمەڵگایانەن کە ئەم شێوازە لە بەرهەمهێنان تێیاندا زاڵە، بەڵام هەندێ رەگەزی تری تێدایە لەوانە، شوێنەوارەکانی پەیوەندیە دەرەبەگیەکان . هەندێك لە رواڵەتەکانی سەرمایەداری لەئەوروپای رۆژئاوایدا لەماوەی سەردەمی دەرەبەگایەتیدا بەدەرکەوتن بەتایبەتیش لەرێگەی پەرەسەندنی بازرگانی و بازرگانی کردن (Commercialization) ی بەرهەمی کشتوکاڵی، ئەمە لەکاتێکدا کەزاراوەکە بەشێوەیەکی بتەوتر زۆر جار پەیوەست دەبێت بە پرۆسەی پیشەسازیی دواترەوە. ئەو شێوەیەی سەرمایەداری کە لەماوەی سەدەی نۆزدەهەمدا لە بەریتانیا و وڵاتە

یەکگرتووەکانـدا پەرەیـسەندوە شـێوازێکی نمونـەیی پـێش کـەش دەکـات و چـەند ناوەرۆکێکی گرنگی هەیە بۆ لایەنە ڕامیارییەکانی سەرمایەداری. سـەرمایەداریش لـەم وڵاتانـەدا بـە شـێوەیەکی بیروبـاوەڕی پەیوەسـتە بـە ڕێبـازی ئـازادی و ڕامیـاریی دەسـتێوەرنەدانەوە (Laisser faire) وە کورتکردنـەوەی ئـیش و کارەکـانی دەوڵەت لە پاراستنی ئاسایشی دەرەکی و یاسـا و سـستم و چـوار چێوەی بـازاڕدا. هەروەها ئەم تێڕوانینە پێی وایە کە دەست تێخستنی دەوڵەت لە ئابوریـدا سـنوردارە بەلابردنی ئەو ڕێگرانە لە بەردەم کاری ئازادی هێزەکانی بـازاڕدا لەڕێگـەی دەرکردنـی یاساکانەوە دژ بە قۆرخکردن و مومارەسە کۆتکراوەکانەوە. بۆ نموونە، بـەو شـێوەیە ئەوا سەرمایەداری پەیوەست دەبێت پەیوەست بـونێکی بـەهێز بـە سـستمی ئـاڵوێری بازرگانی ئازادەوە هەرچەندە کە جیاوازیشە لێی.

سەرەڕای ئەم شێوازەیش بۆ پەرەسەندنی (سروشتی) پێویستیەکانی ڕامیـاریی سەرمایەداری ئـەوا بەرهـەمهێنانی سـەرمایەداری لـە وڵاتـانی تـردا لـە ژێـر بـارودۆخی ڕامیارییـەکی تـەواو جیـاوازدا پـەرەی سـەندووە. لـە وڵاتـە پیـشەسازیە بەدوادایەکـدا هاتووەکاندا، بەتایبەتی ئـەڵمانیاو یابـان، حکومەتـەکان جـۆرە ڕامیارییێکیـان بونیـاد ناوە کە بەبڕێکی گەورەتر لە دەستێوەردان دەناسرێتەوە و هەروەها چـالاکانە هـانی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری داو بەشێوەیەکی خێراتـریش دامـو دەزگـای پیـشەسازی گـەورەو بـەهێزی دروسـت کـرد . چـەند جـۆرێکی جیـاوازیش لـەڕەوتی پـەرەسـەندنی گـشتیدا هـەن بـە ئاراسـتەیەکی زیـاتر لـە سـەرمایەداری ، دەرکـەوتنی کۆمپانیـا پشکدارەکان و دانانی بەڕێوبەرەکان بویە هۆی دابڕینی موڵکییەت لەکۆنترۆڵ لە زۆرێك لـە کۆمپانیاکانـدا . هـەروەها گـۆڕینی شـێوازی موڵکـدارێتی لـە کـاتێکی دواتـردا و هەروەهابەشێوەیەکی زیادەجەختی دەکردە سـەر دامـەزراوە داراییـەکان، وای لێهـات سەرمایەداری زیاتر چڕ بویەوە و مەیلی قۆرخکاری تێدا دروست بوو، وە دابەشکردنی بەرژەوەندیەکان توندو تیژی زیاد کرد لەنێوان دامودەزگا دارایی وپیشەسازیەکاندا، لە گرنگترین پەرەسەندنە ڕامیارییەکانیشی گەشەسەندنی دەستێوەردانی دەوڵـەت بـوو

لـه شـێوەی ڕێکخـستن (Regulation) و خۆمـاڵیکردن و دابینکردنـی چـاودێریدا ئەمەیش ئاراستەیەکە وای لێهاتووە جیاکردنەوەی کەمتر ئاسـان بێـت لەهەشـتاکاندا، هەروەها مشتومڕ سەبارەت بـەوەی کـە ئایـا لێپێـچینەوەکانی لـەم شـێوەیە یارمـەتی پرۆسەکانی سەرمایەداری دەدات یان ڕێگری دەکات.

See also : corporatism (b) :ideal type ;
Exploitation ;feudalism ;free trade ;
Imoerialism ; Industiral society; interventionism liberalism ;
Marxism ;na tionalization ; social class;
Socialism ; state capitalism ; welfare state.

## Case – study method (*طريقة دراسة الحالة*) ڕێگەی لێکۆڵینەوەی حاڵەت

سستمێکی شیکاریی ڕێکخـراوە پـشت دەبەسـتێت بـە لێکۆڵینـەوەی لەسـەرخۆو تێروتەسەل بۆ حاڵەتێکی دیاریکراو (بۆ نموونە، لە زانستی ڕامیارییـدا لێکۆڵینـەوەی ڕێکخستنی حیزبێکی ڕامیاریی یـان هەڵمـەتی کۆمـەڵێکی خـاوەن بەرژەوەنـدی) بـەو پێیەی کە ئەلتەرناتیڤێکە لە شیکاریی بـەراوردکاری بـۆ کۆمەڵـە (حاڵـەتێك) ئامانجـە سەرەکیەکانی ئەم ڕێبازەش ئەمانەیە : بەو پێیەی کە ئامرازێکی فێرکارییە بۆ ئەوەی قوتابیان بتوانن توێژینەوەی گەورەترین کۆمەڵە لە گۆڕاوەکان و بەیاننامە پەیوەست بووەکان لە نموونەی جۆرێکی دیاریکراو لە دیاردە ڕامیارییەکان ئەنجام بدەن، وە بـەو پێیـەی کـە ڕێبـازێکی توێژینەوەیـە بـۆ داتاشـین و هەڵبـژاردنی گریمانـەکان و پەیوەندیـەکان لـە ڕێگـەی تاقیکردنـەوەی وردەوە بۆچـەند حاڵـەتێکی ڕوونکـراوە. وەدەکرێت لێکۆڵینەوەی حاڵەتەکان بکرێت بۆ هەر کۆمـەڵێك لـە ڕێبـازو میتۆدەکـان . لەوانەیش، چاوپێکەتنەکان یان بەڵگە بەهێزکەرەکان یـان لاساییکردنەوەکان یـاخود یاریەکان.

See also : Comparative analysis.

## Catch – all parties (احزاب اوسع الجماهير) حیزبە بنکە فراوانەکان

چەمکێکە ئوتۆکیر شهایمر پەرەی پێداوە بۆ پراکتیزە کردنی بەسەر حیزبە رامیارییە گەورەکاندا، کە هەوڵ دەدات بۆ بەدەست خستنی پشتیوانی لە هەڵبژاردنەکاندا لە رێگەی هێڵی دابەشکردنە چینایەتی یاخود رەگەزی و یان ئاینییەکانەوە ...هتد لەبری جەختکردنی لەسەر راکێشانی خەڵکی بۆ لای خۆی لەکەرتێکی دیاریکراو لە کۆمەڵگەدا (وەکو دەنگدەرانی چینی پرۆلیتار یان چینی کاتۆلیك) لەبەر ئەوە بنکە عەقائیدیەکەی دەپارێزێتەوە بەپەرە پێدانی چەند بەرنامەگەلێکی رامیاریی کرداریی‌و نەرمەوە بۆ راکێشانی کۆمەڵێکی فراوان لە بەرژەوەندییەکان. زاراوەی (**Vlokspartei**) ئەڵمانی (حیزبی گەل) کە جێبەجێکرا بەسەر دیموکراسیە مەسیحیەکاندا، هەروەها پاش کۆنگرەی باد گودیسبیرگی ساڵی 1959 جێبەجێکرا بەسەر دیموکراسی خوازە کۆمەڵایەتیەکاندا لە کۆماری ئەڵمانیای یەکگرتوودا کە چەند دەلالەتێکی زۆر هاوشێوەی هەیە .

**See also : Cleavage ; interest ; party**

## Caucus (اجتماع، تجمع) کۆبونەوە

بریتیە لەکۆبونەوەی ئەندامانی حزبێکی رامیاریی یان رێخراوێکی رامیاریی تر بۆ هەڵبژاردنی پاڵێوراوان بۆ هەڵمەتەکانی هەڵبژاردن (بەتایبەتی لەسەر ئاستی ناوچەیی: پێشتر کۆبونەوەی پاڵاوتن بۆ کۆنگرەی پالاوتن بوو لە وولاتە یەکگرتووەکاندا و، کۆبونەوەکان پاڵێوراوانی بازنە هەڵبژاردنەکانیان دیاری دەکرد لە بەریتانیاو ئەڵمانیادا، لەسەدەی نوزدەهەمدا) بۆ گفتوگۆکردنی ئەو مەسەلانەی خراونەتە بەردەم ئەنجومەنی یاسادانان یان رێکسازی ستراتیژە سیاسیەکان .. هتد. هەندێك جاریش

ئەم زاراوەیە کۆمەڵەیەکی ناوخۆیی دەگرێتەوە کە سەر بەحیزبێك بێت، کە هێزی کۆبونەوە لەناو حیزبدا گەورەدەبێت وە دەکرێت بڕیارەکانی بسەپێنێت بەو پێیەی پابەندە بە ئەندامانی حیزبەوە لەو چوار چێوەیەدا کە تێیدا کار دەکات (ئەنجومەنی نوێنەرایەتی نیشتمانی یان ئەنجومەنی شار .. هتد) .

لە هەندێك حاڵەتیشدا وا دەبێت کە بڕیارەکانی کۆبوونەوە سەپێنەر بن بۆ ئەوانەی کە دەسەلاَت دەگرنە دەست (لە ئەنجومەنی وەزیراندا،بۆ نموونە) . سەرەڕای پەیوەندی زاراوەکەش بە ژیانی ڕامیاریی ئەمریکیو ئوسترالیەوە بەتایبەت ئەوا لەژیانی ڕامیاریی بەریتانیا و ...هتد جێبەجێکراوە، بە تایبەتی لەسەر ئاستی ژیانی ڕامیاریی ناوخۆییدا . هەروەها زاراوەکە لە ولاَتە یەککرتووەکاندا جێبەجێ دەبێت بەسەر کۆمەڵێکی لاوەکیدا لەناو کۆمەڵێك لە نوێنەرانی حیزبدا کە کۆدەبنەوە لەسەر بنەمای گرنگی پێدانی هاوبەش و بە ڕێك و پێکی بۆ ڕێکخستنی ستراتیژ یان گفتوگۆکردنی لەسەر گیرو گرفتە هاوبەشەکان.

See also : Faction ; party

## Cell (الخلية) شانە

یەکەی بنچینەییە بۆ ڕێکخستن لە حیزبێکی ڕامیاریی یان لەبزوتنەوەیەکی ڕامیاریدا کە هەمیشە سروشتێکی نهێنی هەیە زۆر جاریش سنوری ئیش کردنەکەی گەڕەکێك یان شوێنێکی کار دەبێت. شانەکانیش هەمیشە بچووکن زۆر جار (لە سێ کەسەوە بۆ بیست ئەندام لە خۆ دەگرێت) ئەم ئاستە لە ڕێکخستن چالاکەو دەکەوێتە ژێر دیسپلینێکی توند تۆڵەوە . پەیکەری شانەکەیش پێك دێت لە کۆمەڵە پەیوەندیەکی شاقوڵی نەك ئاسۆیی لەنێوان یەکەکانی ڕێکخستندا بۆ ئاسانکردنی کارگێڕی ناوەندی و کەم کردنەوەی زیانەکان بۆ کەمترین ئاست کە ڕەنگە بە هۆی کەم بوونەوەی مەیلدارییەوە یان ئاشکرابوونی چالاکیە تێکدەریەکانەوە . ئەم

زاراوەیەش بە شێوەیەکی تایبەتی جێبەجێ دەبێت بەسەر یەکەکانی ڕێکخستندا لە حیزبە شیوعیە جۆربە جۆرەکاندا سەرەرای ئەوەیش کە ساڵی 1939 بە شێوەیەکی رەسمی لە یەکێتی سۆڤیەتدا دەسبەرداری بوون.

See also : Bolshevism ;party .

## Cession وازهێنان (التنازل)

گواستنەوەی خۆ ویستانەی هەرێمێك لە رێگەی فەرمانڕەوایەکەوە یان حکومەتێکەوە بۆ فەرمانڕەوایەك یان حکومەتێکی تر. ئەو زەویەش کە وازی لێدەهێنرێت (بۆ نموونە )، بەشێك دەبێت لە رێکسازیەکی ئاشتیانە یان گۆڕینەوەی زەویەکان یان فرۆشتن لەبەرامبەر برێك پارەدا، یان وەکو لە زەمەنە مێژوویيە کۆنەکاندا برگەیەك بووە لە گرێ بەستی ژنخوازی شاهانەدا سەرەڕای ئەوەیش ارودۆخەکان ڕەنگە وا لەفەرمانڕەوایەك یان حکومەتێك بکەن کە دەست لە هەرێمێك هەڵبگرێت (تەنازولی لێبکات) ئەوا خودی کرداری تەنازول کردن جیاواز دەبێت لە رزگار کردن بە هۆی بوونی هەڵبژاردنێکی خۆویستی ڕەسمییەوە.

لە نموونەکانی واز لێ هێنان: گوێزانەوەی هۆنگ کۆنگ لە چینەوە بۆ بەریتانیا بە پێی ریکەوتنامەی نانکنگ (1842)، وە گێڕانەوەی ئەلمانیای ئەلزاس – لۆرین بە پێی رێکەوتنامەی فرسای (1919)، وەکڕینی لویزیانا لەفەرەنسا لە لایەن ولاَتە یەکگرتووەکانەوە (1803)، هەروەها کڕینی دورگەی (العزراو) لە دانیمارك لە لایەن ولاَتە یەکگرتووەکانەوە (1917) .

See also : Treaty .

## Charisma (الموهبة القيادية) بەهرەی فەرماندەیی

لە بنەرەتدا زاراوەیەکی لاهوتیە واتە (بەهرە یان بەخششێکە لەلایەن خواوە) بەڵام ئێستا مانای ئەو ڕواڵەتە کەسێتیە نائاساییانەی سەرکردەیەکی ئەفرێنەر یان شۆڕشگێڕ دەگەیەنێت کە شوێنکەوتەکانی بڕوایان وایە، ،خاوەنی توانا ئایینیەکان یان جادوویەکان بێت. هەروەها ئەم زاراوەیە بە شێوەیەکی زۆر دەگمەن بەو هێماو دامودەزگایانە دەوترێت کە پەیوەستە بەم جۆرە سەرکردایەتیەوە.

دەشێ ماوەی بەهرەی فەرماندەیی سنووردار بێت.هەروەها ڕەنگە دەستەوسانی لەهێنانەدی ئامانجەکاندا بڕوای پشتیوانەکان لاواز بکات یاخود سەرکەوتنی بزوتنەوەکە دەبێتە هۆی دروستبوونی سەرکردایەتیەکی خاوەن مۆرکێکی ڕێکخراوەیی یان دامەزراوەیی . زۆرینەی بە کارهێنانە زانستیەکانی دوای (ویبر) **Weber** دەکەون لەجیاکردنەوەی سەرکردایەتی بەهرەداردا سەبارەت بەشێوە تەقلیدیەکان و شێوە ئەقلانی و یاساییەکان، وایش دەردەکەوێت کە قسە کردن لەبارەی ئەو دامودەزگایانەوە کە پەیوەستن بەو بەهرەی سەرکردایەتیەوە کە پێشتر ئاماژەمان پێکرد ببێتە هۆی سڕینەوەی ئەو جیاکارییە. سەرکردەکانی نموونەی هیتلر و گاندی‌و فیدڵ کاسترۆ ناویان وەکو نموونەی ئەم جۆرە سەرکردە بەهرەدارانە دەهێنرێن، سەرەڕای ئەوەیش کە زاراوەکە زۆر جار بە شێوەیەکی گشتی بۆ هەر کەسێتیەک بەکار دەهێنرێت کە تێیدا سیفەتێکی سەرنج ڕاکێش و یان جادوویی لە کەسێتییدا هەبێت.

**See also : Authority :**
**leadership ; legitimacy .**

## Chauvinism (الشوفينية) شۆڤینیزم

ئەزعەی نیشتیمانپەروەریو خۆ بەزل زانینی نەتەوەیی لەڕادەبەدەرە، هەروەها

ئـەو هەڵـسەنگاندنە ناواقیعیانــەش دەگرێتــەوە بـۆ خاسـیەتەکانی وڵاتــی کەســی شۆفێنیو ڕقبوونەوە لەنیشانەکانی وڵاتانی تر. ڕەنگە ئـەم زاراوەیـەش لـە نـاوی ئـەو سەربازە فەرەنسیەوە وەرگیرا بێت کە ناوی (شۆڤان) ەو لـە دەیـەی سیەکاندا لـە سەدەی نوزدەهەمدا کەسێتی یەکی شانۆیی فەرەنسی بوو کە نەزعەیـەکی نەتـەوەیی دەمارگیرانـەی هـەبوو. هـەروەها زاراوەکـە، هـەتا ئەگـەر بـە ڕادەی زیادەڕۆییـەکی کەمتریش بێت ئەوا نزیکە لە زاراوەی (**Xenophobia**) وە کە مانای ڕق بوونـەوە لە خەڵکانی بێگانە دەگەیەنێت.

هــەروەها زاراوەیــەکی داتاشــراو لــەوەوە هەیــە کــە هاتووەتــە نــاو بــواری بەکارهێنانەوە لە بواری بەرگریکردن لە مافەکانی ژنان کە زاراوەی شۆڤینیزم بەکار دەهێنرێت بۆ تانەو تەشـەر دان لـەو پیاوانـەی کـە گومـانی ئـەوەیان لێ دەکرێت کە لە ڕاو بۆچوونەکانیاندا تەبەنی ئەو ڕاو بۆچـوونانە بکـەن کـە پێیـان وایە پیـاوان لـە چـەند لایـەنێکی دیـاریکراوەوە مـەزنترن لـە ژنـان : لـە شـوێنی کارکردندا یان لە ڕووی فیکریەوە .. هتد.

See also : feminism ; notionalism ; xenophopia .

## christion democracy دیموکراسییەتی مەسیحی (*الدیمقراطیة المسیحیة*)

بزوتنەوەیـەکی ئایدۆلۆژییـە گوزارشـت لـە ئایـدۆلۆژیای ئـەو حیزبـە پارێزگارانـە دەکات لەژمارەیەك دەوڵەتی ئەورووپی و ئـەمریکایی لاتینـدا کـە تێیانـدا بـیرو بـاوەڕی کـاتۆلیکی بـەهێزە. نموونـەی ئـەم حیزبانـەیش حزبـە دیموکراسـیە مـە سـیحیەکانن لەئیتـالیا و ئەڵمانیادا و حزبی گەل لە نەمسا. ڕیشە مێژووییەکانی ئـەم بزوتنەوەیـەش دەگەڕێتەوە بۆ حیزبە ڕامیارییە کاتۆلیکیەکان لە هەردوو سەدەی نۆزدەو بیستدا، وە هەڵوێستە بەرگرییەکانیان لە کەنیسە و ڕێنماییەکانی سەبارەت بـە کێشە ڕامیـاریی و

کۆمەڵایەتیەکان، ئەمە لە کاتێکدا بە شێوەیەکی سەرەکی ئەم دیاردەیە کە سەر هەڵدانی دەگەڕێتەوە بۆ ماوەی پاش ساڵی 1945 کە بە هۆی ئارەزووی وولاتە ئەورووپیەکانەوە پێگەیشت لە بەستنەوەی نموونە رامیارییەکان بە بنەما ئەخلاقیە مەسیحیەکانەوە لە پاش جەنگی جیهانی دووەمەوە، وە لە هەندێك لە ولاتانی (نموونەی کۆماری ئەڵمانیای یەکگرتوو) ئەم زاراوەیە بە ئەنقەست وای لێهات کە زۆر رێبازی خاوەن ئاراستەی جۆر بە جۆری دەگرتەوە سەرەڕای ئەمەش کە حیزبە دیموکراسیە مەسیحیەکان لە زۆرینەی ولاتاندا بەراست ڕەو دەژمێردرێن لە رووی هەڵوێستی رامیارییە پارێزگارانەیانەوە سەبارەت بە کومەلگاو پاراستنی خێزان و هەروەها بە هۆی متمانە نەبوونی بە شێوەیەکی بەر فراوان بە سۆشیالیزم و دوژمنایەتی کردنی شیوعیەتەوە، وە ئەو زۆر کات دەستێوەر دەدات لە رامیاریی ئابوری و چاودێری کۆمەڵایەتیدا. هەروەها دەوڵەتی دیموکراسیەتی مەسیحی هەوڵی هاوسەنگی دەدات لە نێوان ناکۆکیە چینایەتیەکان و هەڵوەشاندنەوەیان، وەئەم حیزبە رامیاریانە لە رێگەی چینەکانی ناو کۆمەلگاوە پشتگیرییەکی فراوان لە هەڵبژاردنەکاندا بە دەست دەهێنن.

See also : christian socialism

## Christian Socialism (الاشتراكية المسيحية) سۆشیالیزمی مەسیحی

هەڵوێستێکی ئایدۆلۆژییە پێی وایە کە پەیوەندیگەلێکی پێویست هەیە لە نێوان نموونە مەسیحیەکان و ئامانجە سۆشیالیستیەکاندا، لەبەر ئەوە ئەم هەڵوێستە هەوڵی هێنانەوەی پاساو دەدات بۆ سۆشیالیزم لە بری پاساو هێنانەوە بۆ مارکس . هەروەها سۆشیالیزمی مەسیحی، چ لە شێوەی حیزبێکی سەربەخۆدا بێت یان لە شێوەی مەیلێکدا بێت لە ناو حیزبەکانی تردا (لەناویشیدا حیزبە دیموکراسیە مەسیحیەکان یان حیزبە سۆشیالیستیەکان دا) جەخت دەکاتەوە لە سەر پابەندی

ئەخلاقی لە بەرامبەر کۆمەڵگەدا بە دابین کردنی پێداویستەکانی هاولاتیان و هەروەها تەمویل لەرێگەی دووبارە دابەشکردنەوەی باجەوە بە پێی پێویست، سۆشیالیزمی مەسیحی لە هەندێك لە دەوڵەتاندا پەرەی سەندووە ئەمەیش لە چوار چێوەی ئەو بزاڤانەدا کە بانگەشەی چارەسەری ئاشتیانە یا بانگەشەی دامالینی چەکی ئەتۆمی دەکەن. لەو مەسەلە گرنگانەیش دانەنانی یەکێتی کۆمەلایەتی مەسیحی لە باڤاریا بەحیزبێکی سۆشیالیستی مەسیحی، سەرەرای ئەوەی ناوەکەیشی بریتیە لە حزبی باڤاری برا ی یەکێتی دیموکراسی مەسیحی لەئەڵمانیا.

See also : christian democracy ;
Socialism ; welfare satae.

## Citizen (المواطن) هاوولاتی

ئەندامێکە لە دەوڵەتێکدا کە مافە مەدەنی و رامیارییەکانی پارێزراوە و پێویستە لە سەریشی پابەندی هەبێت سەبارەت بەو مافانەی کە هەیەتی، ئەمەیش بە پێچەوانەی کەسانێکی ترەوەیە کە ئەو مافەیان نییە، لەوانەیش ئەو کەسانەی بەشێوەیەکی کاتی نیشتەجێی ئەو ولاتەن و ئەو ماف و ئیمتیازاتانەیان نییە. رادەی پێدانی مافەکانی هاولاتی بوونیش دەکەوێتە سەر دەوڵەتەکەو ئەو سستەمەی کە بەرێوەی دەبات. لە رابردوودا لە هەندێك دەوڵەتاندا مافی هاوولاتی بوون تەنها بە دەوڵەمەندەکان و نەجیب زادەکان نەبێت نەدەدرا، لەهەندێ دەوڵەتی تریشدا ئافرەتان هەلاوێر دەکران لە هەموو یان زۆربەی مافەکان و پابەند بوونەکانی هاولاتییەتی. ئاین یان ریشەی رەگەزیش لەو پێوەرانەی تر بوون بۆ هەلاوێردەکردن. کۆیلەکان لە ولاتی گریکی کۆندا مافەکانی هاولاتییان نەبوو هەروەها لە ولاتە یەکگرتووەکانیشدا لە پێش جەنگیناخۆوە بەهەمان شێوە بوو . دەکرێت مافەکانی هاولاتێتی جیا بکرێتەوە لە مافەکانی بوونی رەگەزنامە چونکە هەموو هاوولاتیەکان

هەمان مافەكانی ئەوانەیان نییە كە نیشتەجێن لە دەوڵەتێكدا ( Nationals )،
لەم بارەیەوە یاسا گەلێك هەیە كە ئەو پێناسە یاساییانەی هاوڵاتی بوون و هاووڵاتی
نەبوون دەخاتە روو و جیایان دەكاتەوە كە دەكرێت بەكار بهێنرێن بۆ
یەكلاییكردنەوەی ئەو كێشانەی سەبارەت بەم چەمكە دروست دەبن.

## مافە مەدەنییەكان (الحقوق المدنية) Civil Rights

ئەو ئازادی و ئیمتیازانەیە كە هاوڵاتی لە كۆمەڵگەدا هەیەتی و بێ بەشبوون
لێیان بە بێبەشی لەهەلومەرجی هاوڵاتی دەژمێردرێت. ئەم بێبەش كردنەیش بە هۆی
رەگەزی كەسەكە یان چینەكەیەوە یان ئایین یان بە هۆیەكی كۆمەڵایەتی ترەوە
دەبێت .دەكرێت ئەم بێبەشكردنەیش كارێكی بە ئەنقەست بێت بۆ سزادانی ئەو
كەسانەی كە هەستاون بە ئەنجامدانی چەند تاوانێكی دیاریكراو . وردەكاریەكانی
هەریەك لەو ماف و ئیمتیازانەیش دەكەوێتە ناو ئەو كۆمەڵە مافە مەدەنیانەوە كە لە
كۆمەڵگەیەكەوە بۆ كۆمەڵگەیەكی ترو بە پێی تێپەڕبوونی كات دەگۆڕێن .
مافەكانی دەنگدان و پاڵاوتن لە هەڵبژاردنەكاندا و دابین كردنی یەكسانی لە
لێپچینەوەكان و پاراستنی یاساییدا ( The riyht to the due process
of Law ) هەروەها مافی ئازادی لە جیاكاریی رامیاریی و كۆمەڵایەتیەكاندا.
مارشاڵ لە كتێبەكەیدا كە ناونیشانی (Citizenship and social class)
(هاوڵاتی بوون و چینی كۆمەڵایەتی) هەڵگرتووە كە چاپخانەی زانكۆی كیمبرج لە
ساڵی 1950 دەریكردووە ئەو بیرۆكەیەی پەرە پێداوە كە مافە مەدەنیەكان
پەرەیان سەندووە لە مافەكانی هاوڵاتیەكی تەقلیدیەوە ـــ یەكسانی لە بەردەم
یاسادا و ئازادی قسەكردن و ئازادی ئایینەوە بۆ مافە رامیارییەكان لە نموونەی مافی
دەنگدان و مافە كۆمەڵایەتیەكانەوە كە پەیوەستە بە پەرەسەندنی دەوڵەتی
خۆشگوزەرانیەوە لە سەدەی بیستەمدا.

وەلە حاڵەتی گومانکردن لە مافەکانی مرۆڤ ئەوا ئەرکی داداگاکانە کە هە ستن بە یەکلاییکردنەوەی ئەو ناکۆکیانە بە گەڕانەوە زۆرجار بۆ دەستور یان بۆ پێشینەیەك یان بۆ یاسای گشتی (وەکو لە بەریتانیا) دا هەیە. هەروەها بزوتنەوەی مافە مەدەنیەکان لە وولاّتە یەکگرتووەکاندا بە تایبەتی گرنگیداوە بەجەخت کردن لەسەر مافە مەدەنیەکان و لابردنی جیاکاری رامیاریی و کۆمەلاّیەتی بە ناوی دانیشتووانە رەش پێستەکانەوە .پێویستە جیاکاریش بکرێت لە نێوان مافە مەدەنیەکان و مافەکانی مرۆڤدا: بە چاو پۆشین لەوەی کە یاسایین یان دەستووریین کە بە مافی هەموو تاکێك دادەنرێ کە رەگەزی نەریتی ئایینی رەگەزنامەی هەر چییەك بێت ...هتد . ئەمە لە کاتێکدا زۆر دەستوور هەن کە کۆمەڵە ئەحکامێك لە خۆدەگرن بۆ پاراستنی هەردوو جۆری مافەکان :راگەیاندنی مافەکانی مرۆڤ (لە دێباچەی دەستوری فەرەنسی) دا، و دەستوری ئەمریکی رێکسازیەکانی یەکەمی، دەستوری ئەڵمانی، هەروەها راگەیاندنی مافەکانی مرۆڤ کە لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە دەرکراو چەند مافێك دیاری دەکات کە هەندێکیان دەکەونە ناو یەکێك لەو دوو گروپەوە.

See also : citizen .
Civil society see: Society.

## Civil war شەڕی ناوخۆ (الحرب الاهلية)

هەڵگیرسانی کۆمەڵە کارێکی دوژمنکاری و چەکدارانەیە لە نێوان دوو کۆمەڵەی گەورە لەرووی رێژەییەوە (یان زیاتر)لە دەوڵەتێکدا کە هەریەك لەو دوو کۆمەڵەیە خاوەنی رێکخستنێکی رامیاریی بن، زۆر جاریش ئەو دوو کۆمەڵە ململانێ دەکەن لەسەر مافی فەرمانڕەوایی کردن لە کۆمەڵگەدا یان مافی یەکێك لەو دوو کۆمەڵە بە جەنگ هاتووە بۆ جیابوونەوە .شەڕی ناوخۆ جیا دەکرێتەوە لە یاخی بوون بەهۆی

داواكاريەكانی كۆمەڵە یاخی بووەكەوە بە مومارەسەكردنی دەسەڵاتی ڕامیاریی، هەروەها ئەم شەڕە جیاوازیشە لە شۆڕش بەهۆی نزیكی هاوسەنگییەكی نزیكراوەوە هێزەكانەوە لە هەردوو لادا سەرەڕای ئەوەی كە شۆڕش دەكەوێتە پێش یان دەكەوێتە پاش شەڕی ناوخۆوە یان هاوكاتی دەبێت.

لەنموونەی جەنگە ناوخۆییەكانیش لە وولاتە یەكگرتووەكان لە ساڵەكانی 1861 – 1865) دا و ئەو شەڕە ناوخۆیەی كە كەوتە پاشی شۆڕشی بەلشەفییەوە ساڵی 1917، هەروەها شەڕ لە نایجیریا لە دوای هەوڵەكانی هەرێمی بیافرا بۆ جیابوونەوە لە دەیەی شەستەكانی سەدەی بیستەمدا و هەروەها جەنگ لە ئەپیوبیادا كە تێیدا جیاخوازەكان لە هەرێمی ئەریتریادا لەدەیەی هەشتاكانی سەدەی بیستەمدا بەشداریان تێدا كرد .

**See also : Insurrection : revolution**
**Secssion ;War.**
**Class see : social class**

## Classification (*التصنیف*) پۆلێنكردن

كرداری كۆكردنەوەی دیاردەكانە لەسەر بنچینەی ڕواڵەتێكی جیاو هاوبەش تیایاندا، بۆنموونە : پۆلێن كردنی كۆمەڵگاكان بۆ سەرمایەداری یان هەر سستمێكی تر هەروەها پۆلێن كردنی سستمە حیزبیەكان بۆ سستمی تاك حیزبی یان دوو حیزبی یان فرە حیزبی هەروەها پۆلێن كردنی دەنگ دەرەكان بۆ چەند گروپێكی كۆمەلایەتی یان تەمەنی .هەروەها ڕەنگە پۆلێن كردنی سستمێكی ڕوون بۆ هێماكان بگرێتە بەر ئەمە جگە لەوەی هەروەها دەچێتە ناو هەر ناولێنانێكەوە بۆ دیاردە سیاسیەكان.

زۆرجار توێژینەوەیەك بە شێوەیەكی گاڵتەجاڕیی پێناسە دەكرێت بەوەی كە (تەنها پۆلێن كردنێكە) (mere classitication) ڕەخنەشی لەسەر ئەوەیە كە

کۆکردنـەوەی چـەند برگەیـەکی هاوشـێوە پێکـەوە و دانـی نـاوێکی هاوبـەش پێـی تەلتەرناتیڤێکی خراپە بۆ ڕاڤەکردن. بەلام لەوانەیە پۆلێن کردن دەستپێشکەرانە بێت لە دەرخستنی هەندێك لە لایەنەکانی دیاردەکان و داپۆشینی هەندێکی تریاندا . لەبەر ئەوە پێویستە سستمی پۆلێن کردن بە شێوەیەکی وورد و تاوتوێ بکرێت نـەك تـەنها لـە پێنـاو جێگیرکـردن و روون کردنـەوەو ئاسـانی جێبەجێکردنیـدا بـەڵکو لـە پێنـاو تواناکانیشدا لە بەرهەمهێنانی گریمانەی بەسوود و ورددا، لە هەموو شتێکیش گرنگتر، پەیوەندیی بەو مەبەستە تیۆریانەوە کە بۆی دانراوە.

**See also : conceptual framework ;hypothesis; ideal type; theory ;typolopy**

## Cleavage (الانشقاق) جیابوونەوە

بارێکی دابەشبوونی بنەڕەتی و بەردەوامە لە نێوان ئەندامانی کۆمەڵێکی ڕامیـاریی یان سستمێکی ڕامیارییـدا کـە پەیوەندییـەکی پتـەوی ڕامیـاریی هەیـە وەك چـینێکی کۆمەلایەتی ئاینی یان ناسنامەی نەتـەوەیی یـان بنەچـەی رەگـەزیی زمـان.لەوانەیـە جیابوونـەوەکان هۆکـاری هەڵگیرسـاندنی شـەڕە ناوخۆییـەکان و جیاوازیـەکان بـن سەبارەت بە ڕامیاریەکان و ململانێ ئایدۆلۆژییەکان و ...هتد، هەروەها ڕەنگـە ببێتـە بناغـەی دابـەش بوونـەکان لـە نێـوان حیزبـە ڕامیارییەکانـدا و هۆکـاری دامەزرانـدنی کۆمەڵەکان یـان بزاڤـە خـاوەن بەرژەوەندیـەکان ئەمـە سـەرەڕای ئـەوەیش کـە ئـەو بزاڤانـە لـە چـەند حاڵـەتێکی پـەرگیردا دەبـن (وەکـو ئێرلەنـدای بـاکور و بـەلجیکاو سریلانکا) هەروەها دەبێتە بناغەی کلتورە لۆکاڵی و ناوچەییە ڕامیارییـە جیاوازەکـان لە کۆمەڵگەدا . ئامانجی تێك هەڵکێشانی ڕامیـاریش بریتیـە لـە زاڵ بـوون بەسـەر ئـەو دابەش بوون و جیابوونەوانەدا تاڕادەی ئەوەی کە سستمە ڕامیارییەکە بـەردەوام بـێ و لەکاردابێ. لە کاتێکیشدا کە تاك پەیوەندی هـەبێت بـەدووان یـان زیـاتر لـەو بەشـە

جیاوازانەوە ئەوا دەکەوێتە بەرگێژەڵوکەی ئەو جیابوونەوە یەکتر بڕەکانەوە، کاتێك کە ڕووبەڕوی، بڕیارەکانی دەنگدان دەبێتەوە.بۆ نموونە کەسێکی کاسۆلیکی لە چینی کرێکار لە ئیتالیادا سەرسام دادەمێنێت لە کاتی دەنگدانیدا لە نێوان حزبێکی سوشیالیستی یان شیوعیدا بە هۆی ئینتیما چینایەتیەکەوە یان حزبیدیموکراسی مەسیحیدا بە هۆی ئینتیما ئاینیەکەیەوە.

**See also : Interests ; interest group ; Movement:party ; pluralism; .Political culture ; political Integration**

## Clientelism مەحسوبیەت (*المحسوبية*)

کۆمەڵێك پەیوەندییە لە نێوان سەرپەرشتیارهەوادارەکانیان کەتێیدا سەرپەرشتیارەکان کەخاوەن پلە و پایەیەکی بەرزو سامان و دەسەلاتن هەڵدەستن بە پێش کەش کردنی چاودێری لە شێوەی پاراستن و گەیشتن بە بەرژەوەندیەکان کە لە لایەن دەوڵەتەوە یان حزبەوە پێش کەش دەکرێن و هەروەها پاداشتە مادییەکان و کارەکان و ناوبانگ .... هتد بۆ هەوادارەکانیان لە بەرامبەر پشتگیری سیاسیدا.

ئەمە لە کاتێکدا کە نموونەی ئەم جۆرە پاداشتانە زۆر جار پێشێل کردنی یاسایە بە تایبەتیش یاسای هەڵبژاردنەکان مەحسوبیەت پەیوەندیەکی توندو تۆڵی بە گەندەڵیەوە هەیە هەتا لە کاتێکیشدا کە شێوەکانی چاودێری و پشتگیری کردنیش نزیك بن لە یاساییەوە ئەوا پەیوەندیە مەحسوبیەکان بە شێوەیەکی کرداری ڕێ لە بەشداری کردنی دیموکراسی و هاوولاتی بوون بە شێوەیەکی ڕاست و دروست دەگرێت . لە کاتێکیشدا کە مەحسوبیەت تەشەنە دەکات ئەوا پەیوەندیە مەحسوبیەکان بەردەوام دەبن لە ڕێگەی شێوازە تەقلیدیەکانەوە بۆ دەسەلات یان بەزۆرە ملێ .. مەحسوبیەت، لە هەندێك حاڵەتیشدا لەو پەیوەندیە دەرەبەگایەتیانە دەچێت کە لە نێوان دەرەبەگ و شوێن کەوتەکەیدا هەیە. هەندێك لە تایبەتمەندیەکانیش لە زانستی

مرۆڤایەتی و کۆمەلآیەتیدا پێیان وایە کە مەحسوبیەت قۆناغێکی پێویستە لە پەرەسەندنی دەولەتی ناوەندی نویدا.
شیکاریکردنی مەحسوبیەت پەرەی سەندوە بە تایبەتی بەو پیبەی لقێکە لە تیۆری ئالوگۆر و چڕ بوەتەوە لە ئالوگۆڕکاری پەیوەندیەکانیدا وە لە رۆلیدا بەو پیبەی کەسەرچاوەیە بۆ تێهەلکێش کردنی رامیاریی و نوێکردنەوە . وە لەم گۆشەیەوە وا دەردەکەوێت کە مەحسوبیەت دیاردەیەکی سەربەخۆیە لە چین لەبەر ئەوەی ئەو ئاراستە رامیاریانە لە خۆ دەگرێت کە هاوڕێك نین لەگەڵ دابەشکردنە چینایەتیەکاندا، ئەمە لە کاتێکدا تیروانینە بەر فراوانەکانی تر وای دەردەخەن کە مەحسوبیەت دەکرێت یەکێك لە ئامرازەکان بێت بۆ مانەوەی دەولەت لەگەڵ پشتگیرگیری کردنی بەرژەوەندیەکانی چینێکی کەمینەدا وە لە رێگەیەوە ئەندامەکانی چینێکی هەژمونـدار دەتوانن پارێزگاری لە شوێنەکانیان بکەن.
مەحسوبیەت فاکتەرێکی گرنگە لە ژیانی رامیارییدا لە جیهانی سێ یەمدا کە خاوەن زەوی و زارەکان کۆمەڵە پێگەیەکی بەهێز داگیر دەکەن لە کۆمەلگە گوند نشینەکاندا، لەئەمەریکای لاتیندا، وە لەوکۆمەلگایانەدا کە پەیوەندی کۆمەلآیەتیەکانی تر لاواز دەبن یان دەتوێنەوە (بۆ نموونە لە ناوچە شارنشینەکاندا کە پەیوەندیە مەحسوبیەکان جێگەیپەیوەندییەکانی کۆمەلگای خاوەن دەرامەتە گوندییەکان دەگرێتەوە.) وە لە و کۆمەلگایانەدا کە فشارەکانی نوێگەرییان لەسەرە. هەروەها مەحسوبیەت دەکرێت کە لە سستمە نوێترەکانیشدا دیاری بکرێت. هەروەها ئەم زاراوەیە بەکاردێت بۆ پێناسە کردنی چەند لایەنێك لە ژیانی رامیاریی و حزبی لە ولایەتە یەکگرتووەکاندا، ئەمە جگە لەوەی ئەمە بە شێوەیەکی بەر بلأو پێناسە دەکرێت بەوەی کە (رامیاریی ئامێرە) .

**See also : Authority ; corporatism (b) :**
**ideal type: eychaange theory : factio;**
**feudalism ;machine politics ;modernization**
**; politial development political integration ;populism; social ;**
**state .**

## هاوپەیمانیەتی داخراو (التحالف المغلق) Closed coalition

هاوپەیمانیەتێکە تێیدا هەموو حیزبە بەشداربووەکان نزیك دەبن لەیەکەوە سەبارەت بە ڕەهەندێکی ڕامیاریی دیاریکراو (پێوەری چەپ ـــ ڕاست) بۆ نموونە. حزبێکیش هەڵاوێردە ناکرێت کە بکەوێتە سەر ئەم ڕەهەندە لە نێوان دوو حیزبی بەشدار بوودا. بەڵکو حاڵەتەکە (داخراو) دەبێت لەیەك ڕەهەنددا (ڕامیاریی ئابوری)، بەڵام کراوە دەبێت، لە ڕەهەندێکی تردا (ڕامیاریی دەرەکی).

## ئیئتیلاف (الائتلاف) Coalition

کۆمەڵێکە لە دوو ڕەگەزی ڕامیاریی یان زیاتر (دەیشکرێت ، چەند کەسێك یان چەند حیزبێکی ڕامیاریی بن یان کۆمەڵە بەرژەوەندیەك یان هەتا کۆمەڵە دەوڵەتێك) پێك دێت کە لە ڕێگەی کارێکی هاوبەشەوە ئامانجێکی سود بەخش بە ئەنجام بگەیەنرێت بە شێوەیەکی ئاڵوگۆڕکراو بە شێوەیەکی گشتیش ئەم ئەنجامە بەدی نایەت بە بێ پێك هێنانی ئەم جۆرە کۆمەڵەیە هەروەها زاراوەیەکە بە شێوەیەکی تایبەتیش مانای حکومەتێك دەگەیەنێت لە دوو حیزب یان زیاتر بە مەبەستی دابین کردنی زۆرینە یەکی کارا لە ئەنجومەنی یاساداناندا و تەسك کردنەوەی ڕامیاریە حزبیەکان لە کاتی قەیران دا یان بە هەر هۆیەکی تر. توێژینەوەی پێکهێنانی ئیئتیلاف بوارێکی لاوەکی گرنگ بوو لە زانستی ڕامیارییدا، دەسەڵاتی ڕێبازە تیۆرییانەی کەپشتییان بە تیۆری یاریەکان، و تیۆری سازش و ڕێبازە شێوەییەکانی تر دەبەست زیادی کرد سەرباری لێکۆڵینەوەی حاڵەتەکان و لێکۆڵینەوە ئەزموونیە بەراوردییەکان بۆ پێك هێنانی ئیئتیلاف، توێژینەوەکانی (و . و ریکر) و (ا . دوسوان) گرنگن بە تایبەتی لە پەرە پێدانی لەو گریمانانەی کە پەیوەستن بە قەبارەی ئیئتیلافەوە. ڕەنگە ئەوەیش بچوکترین کۆبونەوەی مومکین بێت لە

ئیتیلاف لەو ڕەگەزانەی کە لە 50٪ دەنگەکان تێدەپەڕێنن لە ئەنجومەنی یاساداناندا یان لە دەزگایەکی تردا، واتە (سەرکەوتن بە کەمترین ڕادە یان بچوکترین کۆبونەوەی مومکین لە ئینتیلافی ئەو ڕەگەزانەی کە 50٪ ی دەنگەکان بەدەست دەهێنن لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە حیزبەکان یان ڕەگەزەکانی تر یەك لەیەکەوە نزیکن لە ڕەهەندێکی ڕامیاریی پەیوەندی داردا، واتە (سەرکەوتن بە کەمترین ڕادەو داخراو) . هەروەها تۆێژینەوەکانی تر نموونەی توێژینەوەکانی (بریدهام ولیفر)، جەخت لە سەر گرنگی کۆمەڵە ئالۆزەکان دەکاتەوە لەو فاکتەرانە وەکو ڕادەی توانای مامەڵەکردنی حیزبە سیاسیەکان لە ئیتیلافدا بەو پێیەی کەفاکتەری یەکێن، هەروەها درێژی کاتیش لە هەر زنجیرەیەکی ئینتیلافەکاندا ئێستا گرنگییەکی تیۆری گەورەی پێ نەدراوە.

وایش دەردەکەوێت کە حکومەتی ئینتیلافی بە گشتی و بە شێوەییەکی گەورە پەیوەستە بە سستمە ڕێژەییەکانەوە بۆ هەڵبژاردن چونکە ئەمە وا دەکات لە ئەگەری بەدەست هێنانی زۆرترین پشکی فەرمانڕەوایی بە تەنها لە لایەن خۆیەوە کەمتر بکاتەوە . هەروەها ئینتلافەکان لە ئەنجومەنەکانییاسادananda دروست دەبن بە بێبوونی پەیوەندی بە حکومەتی ئیتیلافەوە (لە کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەککگرتووەکاندا) .

ئینتیلافە هەڵبژاردنیەکان نموونەی هاوپەیمانێتیحزبی (لیبراڵ) و حیزبی دیموکراسی کۆمەلایەتی لە بەریتانیا لە هەڵبژاردنەکان ساڵی 1983 و 1987 دا یان ئیبتلافەکان لە نێوان کۆمەڵەی حیزبە جۆراوجۆرەکان لە هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی گەل لە کۆماری ئەڵمانیای دیموکراسیدا ساڵی 1990 زۆر جار بە هاوپەیمانیەتیە هەڵبژاردنیەکان پێناسە دەکرێن. کاریگەری ئەگەری بەرەو زیاد چوون و سەرکەوتنی پاڵێوراوێك بە هۆی پاڵێوراوێکی ترەوە.

**See also : closed coalition ;**
**game theory minimal –wining coalition ;**
**mini-mum-winning coulition;open coalition**

## هاوپەیمانییەتیە هەڵبژاردنیەکان (*تحالفات انتخابية*) Coat – tails effect

ئەم زاراوەیە ئاماژە دەکات بە ئەگەری روو لەزیاد بوونی ئەوەی کە پاڵێوراوی پایەیەك هەڵدەبژێرێت بەهۆی جەماوەریی پاڵێوراوێکی ترەوە. کە زۆرجار بۆ پلەیەکی باڵا دەبێت . لەخودی پسولەی پێشنیازکراودا. ئەم زاراوەیە لە بنچینەدا لە وولاتە یەکگرتووەکاندا سەری هەڵدا بۆ ئاماژەکردن بەپاڵێوارێکی سەروکایەتی خاوەن بنکەیەکی جەماوەری فراوان (پاڵێوراوێك کەهەوڵ دەدات بۆدووبارە هەڵبژاردنەوەی پاڵێوراوانی حیزبەکەی بۆ کۆنگرێس و هەروەها بۆ پلەکانی فەرمانڕەوایی ولایەتەکان .. هتد کە بە بێ ئەو ئەگەری ئەوە زۆرە کە هەڵنەبژێررێن، بەو شێوەیە ناکرێت زاراوەکە جێبەجێبکرێت تەنها بەسەر ئەو ڕەنگدانەوانەدا نەبێت کە لە هەمان کاتدا بە لانی کەمەوە ناوی دوو پلە لەخۆ دەگرێت یان بۆ هەڵبژاردنی بازنە فرە ئەندامیەکان.

## شیکاریکردنی کۆمەڵە لقییەکان (*تحليل المجموعات الفرعية*) Cohort Analysis

بریتیە لەدابەشکردنی کۆمەڵێکی کۆمەڵایەتی بۆ چەند کۆمەڵێکی ناوچەیی لە سەر بنچینەی چەند ماوەیەکی زەمەنی کە کۆمەڵە ناوچەییەکان توانیویانە تێیدا چەندین ڕواڵەت یا شارەزاییەکی دیاریکراو بە دەست هێناوە ، دەکرێت دەنگدەران دابەش بکرێن بە پێی ئەو ساڵەی کە تێیدا ئە ندامانی هەر کۆمەڵەیەکی لقیی بۆ یەکەمجار دەنگیان داوە لە هەڵبژاردنە گشتی یەکاندا.

شیکاریکردنی کۆمەڵە لقییەکان ڕێگە دەدات بەتاوتوێکردنی جیاوازیی لە هەڵوێستەکان و رەفتارەکاندا لە گەڵ گریمانەی ئەوەی کە شارەزایی هاوبەش (لە

جەنگ و بێ بازاڕی ئابوری یان بوژانەوەی ئابوری یان شێوازێکی دیاریکراو لە سەرکردایەتی ڕامیاریی) هەمیشە کاریگەریدروست دەکات لەڕەفتاری ڕامیاریدا.

**See also : cross- sectional analysis;Iongitudial studies.**
**Collective action proble seeipublic goods.**

## Collective choice دەرفەتی کۆمەڵی (*الخيار الجمعي*)

زاراوەیەکە زۆر جار بەکار دەهێنرێت بۆ ئەوەی کۆمەڵە بوارێکی تیۆری هەڵبژاردنی گشتیو تیۆری هەڵبژاردنی کۆمەلآیەتی .

**See also : public cholic theory ;social choice theory**

## Collectivism کۆمەڵگەرایی (*الجماعية*)

ئەو ئایدۆلۆژیا یان پیادەکردنەیە کە ڕاستەوخۆ دژ بە تاکگەرایی دەوەستێتەوە کەڕێکخستنی کۆمەلآیەتی لەسەر بناغەی دەستەبەسەراگرتنی بەکۆمەڵی بەرهەمی ئابوری و بڕیارە ڕامیارییەکان پەیڕەو دەکاو بەتایبەتی پەیوەستە بەشێوەکانی سۆشیالیزمەوە.

نوسەرەکان ئەم زاراوەیە بە شێوەیەکی جیاواز بەکار دەهێنن بە تایبەتی لە کاتی دانانی جیاوازییەکان لە بیروباوەڕی سۆشیالیزمدا. کۆمەڵگەرایی زۆر جار جیا دەکرێتەوە لە سەندیکایی (Syndicalism) لە سەر بنچینەی ئەوەی کە سەندیکایی پێك دێت لە دیموکراسیەتی لامەرکەزیە هەڵبژێراوەکان وە پەیوەست دەبێت بە سۆشیالیزمی دەوڵەتەوە لە سەر بنچینەی ئەوەی کە سەندیکایی پێك دێت لە بەشداریکردنی کۆمەڵی ڕاستەقینە لە وەرگرتنی بڕیارەکاندا، لە کاتێکدا کە

سۆشیالیزمی دەوڵەت پێك دێت لە کارگێڕی بە نوێنەرایەتی لە بری گەل نەك لە لایەن گەلەوە. ئەم بەکارهێنانە جۆراو جۆرانەیش توانای پیادەکردنی کۆنترۆڵ کردن بە شێوەیەکی کۆمەڵی دەگەیەنێ لەسەر ئاستێکی دیاریکراوی کۆمەڵ بەلاَم نەك لەسەر ئاستێکی تر.

See also : Anarcho –syndicalism ;com –munism ;
individualism ;nationlization ;
socialism ;state socialism

## ئاوەدانگەری ـ کۆلۆنیالیزم ـ (الاستعمارية . الكولونيالية) Colonialism

داگیر کردنی ناوچەیەکی دواکەوتوو لە دەرەوەی سنوری دەوڵەتە داگیرکەرەکەوە . دەکرێت ئەم داگیر کردنەیش بە بەکارهێنانی هێز یان بەنیشتەجێکردنی ئاشتیانەی ناوچەیەکی پڕ پشتیوان.

ئەو مەبەستانەیش کە نیشتەجێکردنی داگیرکاری دیاری دەکەن بریتیە لە ئیستغلال کردنی داهاتە ئابوریەکانی ناوچە داگیر کراوەکە: زەوی یان دەستی کار یان کەرەستەی خاو. هەروەها ناوچە داگیر کراوەکە دەکرێتە بازارێکی وابەستەکراو بۆ هەناردەکان لەلایەن دەوڵەتە داگیرکەرەکەوە، وە سوودەکانی کۆلۆنییەکە شاراوەیە بۆ مەبەستە رامیارییەکان یان ستراتیژیەکان. ئاوەدانگەری بە ڕاستیەك جیا دەکرێتەوە لە داگیرکەر ئەویش ئەوەیە کە ناوچەی داگیرکراو زۆر جار خەڵکی تێدا نییە پێش پرۆسەی نیشتەجێکردن یان کەسانێك تێیدا نیشتەجێن کە کۆمەڵێکی رەگەزی جیاوازن ئەمە لە کاتێکدا کە هەرێمە کۆلۆنیالیزە کراوەکان کەسانێك تێیدا نیشتەجێن کە لەهەمان رەگەزی دەوڵەتە داگیرکەرەکەن لە ئیمپراتۆریەتی نەمسا – مەجەر دا و بەپێداگرتن لە نیشتەجێکردنی کۆلۆنیالی بەسەر ئیستیغلال کردنی رامیارییدا، بەلاَم لە هەندێك لە ئیمپراتۆریەتەکاندا ئەوا هەندێك لە هەرێمەکان لە ڕووی سیاسی و ئابوری و کلتوریەوە تێهەڵکێش دەکرێن لەگەڵ دەوڵەتە دایکەکەدا، وە

جەختكردنەوە لەسەر نیشتەجێكردن لە پرۆسەی دروست كردنی ئۆردوگاكاندا كە ئەمەیش كارێكە هەرگیز ڕوونادات لە داگیركردنی ئاوەدانگەرایدا.
زاراوەی (ئاوەدانگەرایی ناوخۆیش) مانای پیادەكردنی ئەم ڕامیاریەیە لەلایەن دەوڵەتێكەوە بەرامبەر هەرێمێك لە ناو هەمان ئەو دەوڵەتەدا. وەكو ئەوەی داگیركراو بێت لە پێناو ئیستیغلال كردنی ئابوریدا.

See also : colonization ;imperialism.

## دروستكردنی ئۆردوگاكانی نیشتەجێكردن (*بناء المستوطنات*)
## Colonization

پرۆسەی دروستكردنی ئۆردوگاكانی نیشتەجێكردن بۆ دانیشتوانی دەوڵەتە داگیركەرەكە لەو هەرێمانەدا كە لە دەرەوەی سنورەكانی دەوڵەتی دایكەوەن.

See also :colonialism.

## كۆمۆنوێلس (الكومونويلث) كۆبەندی گەلانی بەریتانی
## Commonwealth

ئەم زاراوەیە لەمانا زۆر بەكار هاتووەكەیدا ئاماژە دەكات بۆ هەر كۆمەڵەیەكی ڕامیاریی سەربەخۆ . لە لایەنی مێژووییشەوە ئەم ناوە نراوە لە ماوەی حوكمی كرومویل لە سەردەمی جەنگی ناوخۆیی ئینگلترا (1649–1660) هەروەها ناولێنانەكە بە شێكە لە ناو نیشانی ڕەسمی ئوستراليا و هەندێكی تر لەویلایەتەكانی ئەمەریكا وەكو ماشۆستس. هەروەها ئەم زاراوەیە بە شێوەیەكی بەربلاو بەكار دەهێنرێت بۆ پێناسەكردنی ڕێكخراوی ئەو وڵاتانەی كە هەموویان پێشتر بەشێك بوون

لە ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا کە بە شێوەیەکی خۆویستانە لەو پەیوەندیەدا دەمێننەوەو دان بە شازادەی بەریتانیادا دەنێن وەکو (سەرۆکی ئەو پەیوەندیە) هەروەها بەڕێوبەرایەتیەك هەیە بۆئەم پەیوەندیە کە بارەگاکەی لە لەندەنە و (سالی 1965 دامەزراوە) بە شێوەیەکی ڕێك و پێك و بەردەوام کۆبونەوە دەبەسترێت بۆ سەرکردەکانی دەوڵەتانی ناو پەیوەندیەکەو وەزیرانی دارایی و پەروەردە ... هتد، ئەمەیش وەکو میکانیزمێکی تێهەڵکێشکردن وایە .

See also :colonialism; imperialism.

## commune ژیانی هاوبەش (کۆمیون)

کۆمەڵەیەکە کارو پەیوەندیە کۆمەلآیەتیەکانی ڕێك دەخات لە ڕێگەی سستمێکەوە بۆ وەرگرتنی بڕیارەکان بە شێوەیەکی کۆمەڵی و هەروەها پیادەکردنی موڵکایەتی هاوبەش و کۆنترۆڵی شمەکە بەرهەم هاتووەکان و کەلوپەلەکانی تر دەکات.

ئەوانەی کە ڕاسپاردەیان داوە بەم شێوازی مومارەسەکردنە نوسەرانێکن وا دادەنرێن کە تۆباوی بن بە تایبەتی سۆشیالیزمە تۆباویەکان کیبۆتز (Kibbutz) ی ئیسرائیلیش بە بەردەوامی ناو دەهێنرێت بەوەی کەنموونەیەکی نوێیە.

هەروەها زاراوەی (کۆمیون) بە مانای ناوچەیەکی بنەڕەتی لە کارگێڕی ناوچەیی دێ لە فەرەنسا، سەرەڕای ئەم بەکارهێنانەش، کۆمیۆنی باریس یان کۆمۆنەی پاریس بە کاردەهێنرێت بۆ پێناسەکردنی کۆبونەوەیەکی یاخی بووی دیار لە ململانیی هێزە شۆڕشگێڕیەکاندا لە نێوان هەر دوو سالی (1792- 1794) یان وەسفکردنی 72 ڕۆژەی بەڕێوبردنی شیوعیەتی شۆڕشگێڕی لە پاریس سالی 1871 لە ماوەی شەڕی فەڕەنسی – پرۆسیدا لە کاتێکدا کە کۆمۆنە لە شارەکانی تری فەرەنسادا ڕاگەیەنرا .

Seealso : communism;local
Auyopianismgovernment

## کۆمۆنیزم (الشیوعیة) شوعیەت Communism

بیروباوەڕێکە بانگەشە بۆ موڵکایەتی هاوبەشی هەموو موڵکایەتیەکان دەکات، یان ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و ئاڵوگۆڕ یان شێوەیەك لە کۆمەڵگە پیادەی ئەمە دەکات . کۆمەڵگەی کۆمۆنستی لە شێوە تەواو پەرەسەندوەکەیدا تێیدا چینەکان نامێنێت و پەیوەندیە ئابوری و رامیارییەکانیش شێوەیەکی ئیستیغلالیانەیان نامێنێت و دابەشکردنەکانیش لە سەر بنچینەی پێداویستیەکان دەڕوات بەڕێوە .

جۆری ئەو ڕێکخستنە ڕامیاریەش کە مارکس وێنای کردوە سستمی نواندنی دەسەلاْت پێدراوی پشت بەستوو بە بڕیارە دیموکراسیەکان بۆ کۆمیونە ناوچەییەکان لە خۆ دەگرێت کە ڕێ دەدات بە ڕاوێژکردنی بەر فراوان لەگەڵ دەنگدەراندا و گەڕانەوە بۆیان.

وا دیارە مارکس و ئینگلز ئەم ووشەیان تەبەنیکردووە لە مانیفستۆی کۆمۆنیستی دا (Communist Manifesto) ساڵی 1841 بۆ خۆلادان لە ئاماژەو تێکەلاْویی پرۆژە تۆباویەکان کە پەیوەستن بە چینی ناوەڕاستەوە و سۆسیالیزم پێوەی گرێ دراوە) . زۆ جاریش هەر دوو ووشەکە بە شێوەیەکی ئاڵوگۆڕکراو بەکار دەهێنرێت، بەلاْم دەکرێت ڕوبەڕوی دوو جیاوازی سەرەکی بینەوە : شیوعیەت کار دەکات بەو پییەی کە یەکێکە لە شێوەکانی سۆشیالیزم و جیاوازە لە شێوەکانی تر، بە تایبەتی لە جەختکردنەوەی لەسەر ئەوەی کە وەرچەرخانی کۆمەلاْیەتی و ئابوری بنەڕەتی مەرجێکە بۆ وەرچەرخانی ڕامیاریی نەك دەرئەنجامێکی ئەو بێت، یان سۆشیالیزم مانای حاڵەتی گوێزانەوەی کۆمەڵگەیەك دەگەیەنێت لە هەوڵدانیدا بەرەو شیوعیەت نموونەی بە دیهێنانی هەڵوەشاندنەوەی دابەشکردنی چینایەتی.

زاراوەی (کۆمۆنیزمی سەرەتاییش) بەکار دەهێنرێت بۆ پێناسەکردنی ماوەیەك لە ڕێکخستنی کۆمۆنیستی کەپێش کۆیلایەتییەو پشت بەستووە بە کۆمەڵە خێزانی و موڵکایەتیە تیرەییەکان . هەروەها زاراوەکە بەکار دەهێنرێت بۆ شێوەی بەرهەم

هێنانی کشتوکاڵ و جوتیاری کە لە کۆمەڵگەی گوندنشیندا لە ڕوسیای پێش شۆڕش و زۆر ناوچەی ئاسیادا هەبوو. ئەم شێوە ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیانەش هانی ئەوەی دا کە دەکرێت پەرە بە دەوڵەتێکی شیوعی نوێ بدرێت بە بێ ماوەیەکی پێشینی لەدروستکردنی سەرمایەداری .

زاراوەی (کۆمۆنیزمی ئەورووپی)ش گوزارشت لەو بەرنامەیە دەکات کە هەندێك لە حیزبە شیوعیە ئەورووپیەکان کە (نموونەی ئەمە هەر یەکە لە ئیتالیا و فەرەنسا و ئیسپانیا و) پێش کەشیان کرد لە دەیەی هەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی بیستەمدا و تێیدا داوای میتۆدێکی شۆڕشگێڕی پلەبەندی دەکەن لە ڕێگەی دامودەزگا دیموکراسیە پەرلەمانیەکانەوە.

**See also : Bolshevism ;collectivism ; Commune ;democracy ; expoloitation; Marxism ; Social class ;social democracy ;socialism ;Utopianism.**

## community (*الجماعة*) کۆمەڵە

زاراوەیەکە بە شێوازی جیاواز پێناسە دەکرێت، هەندێك جار بە هەمان ئەو مانایەی کە زاراوەی (**Society**) (کۆمەڵگە) یان (**Social group**) (کۆمەڵەی کۆمەڵایەتی) زۆر جاریش مانای کۆمەڵەیەك دەگەیەنێت کە بە شێوەیەکی توند و تۆڵ پەیوەستە بە ناوەنەوە یان پەیوەندی خزمایەتی (نزیکایەتی) یان هەست کردن بە شوناسی هاوبەش .. هتد بە پێچەوانەی ئەو پەیوەندیانەوە کەوا کەمتر وابەستەبوونی تێدایەو زیاتر ناکەسیتی و بازرگانیە و خەسڵەتی ئەو پەیوەندیانەیە کە لە کۆمەڵگا نوێ کاندا هەیە. لە مانای کۆتایشدا کۆمەڵگەی ئازادو زۆر جاریش وا پێناسە دەکرێت کەوا کەمتر هەستی کۆمەڵی بوونی تێدایە، تیۆری کۆمەڵایەتی

ئازادش ناتوانێت دەرك بە بەهای كۆمەڵ (جەماعە) بكات.

ئەم زاراوەیە لەزانستی رامیاریدا بەو كۆمەڵە ناوچەییانە دەوترێت كە دەكەونە ناو كۆمەڵگەوە و لە سەر بنچینەی ناوچەكە دیاری دەكرێن (بۆ نموونە شار یان گوند) یان لەسەر بنچینەی رەگەز دیاریدەكرێن (بۆ نموونە كۆمەڵە ئەفریقییە كارییبیەكان یان ئاسیایەكان لە كۆمەڵگە ئەوروپییەكاندا) یان لەسەر بنچینەی پیشەیی (بۆ نموونە كۆمەڵە چینایەتیەكان) . زۆر جاریش ئەم پێوەرانە كۆدەبنەوە لە گوزارشتی (Mining Community) (كانزاكاران) كە مانای ناوچەیەك دەگەیەنێت تێیدا فاكتەری كانزاكاریی رۆڵێكی گرنگ دەگێڕێت. هەروەها كۆمەڵەی رامیارییش هەر بەم پێیە وەك كۆمەڵەیەكی كۆمەڵایەتیی پێناسە دەكرێت كەكلتورێكی رامیاریی هاوبەشیان هەیەو، تێیدا ئەندامەكانی پلەیەكی بەرز لە چالاكی رامیاریی پیادە دەكەن.

See also :comuinty Studies :liberalism ;
political culture ;society ; status ;subcommunity

## Community Studies لێكۆڵینەوەكانی كۆمەڵگا (*دراسات المجتمع*)

پێشی كۆمەڵگا، بەواتای ناوچەیەكی ناوخۆیی دێت كە سستمێكی كۆمەڵایەتی دیاریكراوی باشی تێدایە و زۆربەی مامەڵە كۆمەڵایەتیەكانی ئەندامانی تاكەكانی تێدا ئەنجام دەدرێت، زانستی رامیاریی یەكەیەكی هەیە كە خاوەن قەبارەیەكی مومكینی كارگێڕیە بۆ مەبەستی شیكاریی، بەلام ئەوەندە ئالۆزیی هەیە كەجێگای گرنگی و وروژاندنی بایەخ پێدان بێت.

بەو شێوەیە زاراوەی (لێكۆڵینەوەكانی كۆمەڵگە) بوویە لقێكی گرنگ لە زانستی سیاسشیدا بە تایبەتی زانستی كۆمەڵناسی رامیاریی.

زۆربەی لێکۆڵینەوە ڕامیارییەکانی کۆمەڵگەکان (نەك حوکمیی ناوچەیی) ئەمریکین، وە جەختیان کردووە لەسەر لایەنەکانی هێزی کۆمەڵگەو پەیکەرەکانی و ڕێگاکانی لەوەرگرتنی بڕیارەکاندا. وە لە زۆرترین ئەو باسانەی کە کاریگەریان لەم بوارەدا هەیە نوسینەکانی (فلوید هنتر) و (روبرت دال) و (مایپو کرینسن) و (جون کافینتا) ن. هەروەها بەریتانیا و ئەورووپاو دەوڵەتە نوێگەرەکان پاش ماوەی کۆلۆنیالیستی ئەو شوێنانە بوون کە تێیدا نموونەی ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەیان تێدا ئەنجامدرا.

مشتومڕێکی بەرفراوان هەیە سەبارەت بە ڕێگاکانی لێکۆڵینەوەکان و دەرئەنجامەکان، لەم بارەیەوە ڕەخنە لە بەکارهێنانی (میتۆدی پشت بەستوو بەناوبانگ) گیراوە بە هۆی ئەو مەیلەیەوە کە هەیەتی بۆ وێناکردنی هەژموونی دەستە بژێر بەسەر کۆمەڵگەدا، ئەمە لە کاتێکدا (میتۆدیپشت بەستوبەبڕیارەکان) تۆمەتبار کرا بە لایەنگیریی دەرئەنجامە فرەییەکان. هەروەها بیرۆکەی دانانی خشتەی کار لە ڕێگەی (نائامادەگی بڕیارەکانەوە) بەوەی کە ڕەفتارێکی وەکو پێویست نییە یان زیادەڕۆیی دەکات لە تەنها گرتنە بەری میتۆدی ڕەفتاریدا، بە پێی هەڵوێستی ڕەخنەگرەکان.لە پشت بواری ئەم ڕاو بۆچوونانەیشەوە سەبارەت بە باشترین ئامرازەکانی لێکۆڵینەوەی هێزی ڕامیاریی ڕێژەیی تاکەکان، ئەوا گرنگی پێدانی هەندێك لە توێژەوەکان گۆڕا بۆ هێز وەك کاریگەرییەکی پەیکەر. توێژینەوە ئەزموونیەکانیش بەشێوەیەکی گشتی هەوڵیاندا بۆ دانانی ئەو دەرئەنجامەی کە تەنها بەند نییە بەکۆمەڵگەیەکی دیاریکراوەوە کە لە ژێر توێژینەوەدایە ئەمەش چەند هەوڵێکە کەڕەخنەی لێگیراوە لە سەر بنچینەی ئەوەی کەژیانی ڕامیاریی کۆمەڵگەی هەڵبژێراونوێنەرایەتی کۆمەڵگاکانی تر ناکات لەسەر ئاستی وڵاتی. بێگومان لێکۆڵینەوەکانی کۆمەڵگە تەنها بەندە نیە بەلێکۆڵینەوەی هێزی کۆمەڵگاوە. وە لە لایەنەکانی تری ژیانی ڕامیارییدا کەلە ئەندامێتی ڕێکخراوەکانی کۆڵیوەتەوە. هەروەها لەناستەکانی بەشداری ڕامیاریی و جیاوازییە ڕەگەزیەکان لە ژیانی ڕامیارییدا لەکۆمەڵگەدا، وە پەیکەری حیزبە ڕامیارییەکان و ڕەفتاریان لە سەر ئاستی

کۆمەڵگەدا.

See also : Behaviouralism ;community ;
Elite ; local government ;non –decisions;
Polyarchy; power; reputational approach; structuralism

## شیکاریی بەراوردکاریی (التحلیل المقارن) Comparative Analysis

ڕێگایەکە لە شیکاریکردندا بەکار دەهێنرێت لە زانستە کۆمەڵایەتیەکاندا بۆ پێناسەکردنی زانیارییەکان و پۆلێن کردنیان و ڕاڤەکردنیان بە دانانی تێبینیەکان سەبارەت بە ڕووەکانی لێکچوون و جیاوازیانەی کە هەن لەومادە جیاوازانەدا کە شیکاریی دەکرێن (گروپەکانی فشاری کشتوکاڵی و دادگا دەستوریەکان، پرۆسەکانی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی و ڕامیاریی (**Political socialization**) و بیروباوەڕە شۆڕشگێڕیەکان)، یان لە هەمان برگەدا لە ڕێگەی ماوە زەمەنیەکانەوە (ژمارەی پاڵێوراوە سەرکەوتووەکان لە هەڵبژاردنە گشتییەکانی بەریتانیادا لەسەدەی بیستەمدا، وە بڕیارە دژەکان کەسەرۆکەکانی وولایەتە یەکگرتووەکان وەریان گرتووە (بۆ نموونە) .

هەروەها دەکرێت لە نموونەی ئەم بەراوردانە ئەوزانیارییانە دەربکرێن کە پەیوەستن بە هۆکارەکانی ئەو جیاوازیانە وڕووەکانی لێکچوون و شوێنەوارەکانی و نەخشە کێشانی پرۆژە پۆلێنیەکان و دۆزینەوەی پەیوەندییە نوییەکان، بەراورد کردن هە تا ئەو ڕادەیە بنەڕەتیە لە شیکار یکردنی زانستی بۆ دیاردە ڕامیارییەکان، ئەمە لە کاتێکدا کە شیکاریی بەراوردکاریی دادەنرێت بە بوارێکی دیاریکراوو گرنگ لە زانستی ڕامیارییدا کە شێواز گرفتی خۆی هەیە. شیکاریی بەراوردکاری بەو پێیەی ڕێگەیەکە لە زانستی ڕامیارییدا کۆنە و دەگەڕێتەوە بۆسەردەمی ئەرستۆ بەلانی کەمەوە، ئەمە

له کاتێکدا کەوا گەشەکردنی خۆیی بوارێکی تایبەتیکراوە لەم لقەدا کەدەکرێت کە مێژووەکەی دیاری بکرێت لە دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە کاتێك زانایانی ڕامیاریی هەوڵیاندا نیزامی ترو (زانستی) تربن، وە کۆتەکانی پێناسەی دامەزراوەیی یان ڕامیاریی ژیانی ڕامیاریی ڕۆژئاواییان تێپەڕاند کە لە ڕابردوودا پێکهێنەری لقەکە بوون.

وای لێهات کەدانراوەکان لە بەراوردی ئەنقەستدا جەوهەری ئەو بوارە لقیە گرنگەی پێك دەهێنا لە زانستی ڕامیارییدا ئیتر ئەگەر پەیوەست بێت بە بەراوردی دامودەزگا نیزامیەکان بۆ سستمە ڕامیارییەکان (بواری گرنگی حوکمی بەراورد بە گشتی) یان پەیوەست بێت بە دامودەزگا ناڕەسمیەکان (کە دەکرێت بڵێین بە تەنیشت حوکمی بەراوردەوە، کایەی ڕامیاریی بەراوردکاریی پێك دێنێ) .

ژمارەیەك گرفتی مەنهەجی گرنگی دیاری کردووە، بەراوردیش خۆی بەچوار چێوەیەکی چەمکیانەی یەکەمی یان پلانێکی پۆلێنکاریی دادەنێت کە دەکرێت بە پیی ئەو بڕگانە هەڵبژێرێت بۆ بەراوردو ڕەتکردنەوەی. ئەمە لە کاتێکدا یەکێك لە ئامانجەکانی شیکاریی بەراوردکاریی بریتیە لەدۆزینەوەی پەیوەندیەکانی پۆلێنکردنە نوێیەکان لە بەر ئەوەی کە هەر نەخشەیەکی یەکەمی لەم شێوەیە پێویستە کاتی بێت و شیاوی چاکسازی بێت. ئاستی بەراوردیش گرفتێکی ترە. ئاستی زۆر گشتیدەبێتە هۆی فەرامۆشکردنی وردەکاریی گرنگ و بەرهەمهێنانی ئەحکامە گشتیە زۆر تەنگەکان لە چوار چێوەیەکدا وەکو ڕاڤەکردنێك سودی نابێ. هەروەها پێویستە بەراوردەکە هەموو ڕووەکانی وێکچوون بگرێتەوە لە نێوان دوو حاڵەتدا یان زیاتر هەروەها چەند جیاوازیەکی پێویست بۆ ئەوەی وا لەبەراوردکردنەکە بکرێت کە بەهایەکی هەبێت. بوونی ڕووەکانی لێکچوون یان جیاوازیەکان بریتیە لەو کە پێویستە ڕاڤە بکرێن بە شیکاریی بەراوردکارییو بڕیارێك کە پەیوەندی بە ستراتیژیەتی گەڕانی بەراوردەوە هەبێت لەسەر بنچینەی هەموو حاڵەتێك. هەروەها گیروگرفتەکانی زمان و ڕاستی بەراوردکردن لە نێوان پێکهاتە یان پرۆسەکاندا وا دەردەکەوێت کەهاوشێوە بن لە کلتورە جیاوازەکان و فەراهەم بوونی زانیارییەکان و

دەستێوەردانی لایەنگیریی هەموو ئەمانە شیکاریی بەراوردکاریی ئاڵۆز دەکەن.

See also : comparative government ; comparativ
Politics ;ethnocentrism
Politics analysis

## Comparative Government حوکمی بەراوردکراو (الحکم المقارن)

سەرەڕای بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە بە شێوەیەك کە شیاوی هاوتاکردنە لەگەڵ زاراوەی (ڕامیاریی بەراورد کراو) دا ((Comparative politics بۆ نموونە، ناونیشانی کتێبەکە کە دانراوە بۆ خولێکی لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی دەکرێت حوکمی بەراوردکراو جیا بکرێتەوە بەشێوەیەکی سود بەخش وەك لێکۆڵینەوەی دەوڵەتەکان و دامودەزگاکان و پرۆسە حکومیەکان لەسەر بنەمای بەراوردکردن. زانا ڕامیارییەکان ئەوانەی کەجەخت دەکەنەوە لەسەر ڕەوشی تایبەتی و جیاوازی دەوڵەتێك وەك ڕێکخستنێکی ڕامیاریی بەپێچەوانەی ڕێکخراوە ناحکومیەکانەوە لەم بەکار هێنانەدا. بەو شێوەیە ئەوا بەراوردکاریی لە نێوان ڕێکخراوەکاندا (بۆ نموونە وەکو ئەرستۆ ئەم کارە دەکات) و قۆناغەکانی پەرەسەندنەکانیان لە نێوان ئەنجومەنە یاسادانانیەکان و حکومەتەکان و دەزگا قەزاییەکان و پیشەیەکان و وە لە نێوان سستمی حوکمی ناوچەیی و لامەرکەزی و وە لەنێوان دەستورەکاندا و هەروەها ڕەنگە کاریگەری ڕێکخستنە کۆمەڵیەکان حیزبەکان و گروپەکانی فشار کە هەوڵ دەدات بۆ بەکارهێنانی دەسەلآت لە ناو دەوڵەتێکدا یا کاریگەری تێیدا. سەباری سستمەکانی هەڵبژاردن وە هەڵبژاردنی سەرکردایەتی و جیاوازیەکانی و شۆڕشەکان و شەڕی ناوخۆ هەمووی دەکەوێتە ناو چوار چێوەی حوکمی بەراوردکراوەوە.

See also : comparative analysis ;
Comparativepolitics ;government (b) : The Study area.

## Concept (المفهوم) چەمك

بریتیە لەو تۆڕی مانایە کەزاراوەکە دەیگەیەنێت و نوێنەرایەتی بیرۆکەیەك دەکات لە بارەی کۆمەڵە شتێك یان دیاردەیەك یان پرۆسەیان پەیوەندیەك ... هتد لەوانەیش بۆ نموونە چەمکەکانی چین و بەرژەوەندی و رامیاریکردنی کۆمەڵگە و هێز. چەمکەکان ئەو رەگەزانەن کە لێیانەوە زانیارییە ئاڵۆزەکان بونیاد بنرێن سەبارەت بە پەیوەندیەکان کەڕاڤەکردنیان پێك دێنێ. بەو شێوەیە تیۆر یا یاسای زانستی پێك دێت لە کۆمەڵێك چەمکی پەیوەست بەیەکەوە . هەروەها پێویستە پێ لەسەر ئەوە دابگرێت کە ووشەکان تەنها ناونانی چەمکەکانن و خودی ووشەش لەوانەیە ژمارەیەك چەمکی جیاواز بگەیەنێت کە خەڵکی جیاواز بەکاری دەهێنن.

**See also : Conceptual framework ;**
**essentially contested**
**Concepts ; law (a) : scientific law ;**
**operatioalization ;**
**Theory.**

## conceptual Framework (الاطار المفاهيمي) چوارچێوەی چەمکی

زاراوەیەکە زۆر جار جێبەجێ دەبێت بەسەر کۆمەڵێك چەمکدا کە ئامرازێکی پۆلێنکردن بۆ شیکار یکردن پێش کەش دەکات ئەمە لە کاتێکدا کە ئەم زاراوەیە بۆ خۆی نابێتە تیۆرێك یان راڤە کردنێکی پەرەسەندوو بۆ ئەو دیاردانە. رەنگە جیاوازییەکی زۆر زەق ودیار نەبێت (بۆ نموونە) لە نێوان چوار چێوەی چەمکیی مارکسیزم و لە نێوان ئەو تیۆرە زۆرتر دیاریکراوەدا کە پەرەی پێداوە، ئەمە لە کاتێکدا چوار چێوەکە دەکرێت دابنرێت بە کۆمەڵێك کەرەستە کە پێیان پێکهاتەکانی دەرئەنجامی تەواو کراو (تیۆر) و هەڵدەبژێررێت. بەو شێوەیە تیۆرەکە پوختە

دەکرێت یان دەگۆڕێت بە بێ گۆڕنکاریەکی پێویستە لە چوار چێوە چەمکیەکەدا کە ناوەڕۆکەکەی گوزارشتی لێدەکات.

See also :classification ;
]concept ; ex-planation;model :theory .

## Condominium حکومەتی هاوبەش (الحکومة المشترکة)

حکومەتی هەرێمێکە (وەك کۆلۆنییەك یا پارێزگەیەك) کە تێیدا سەروەری دابەش دەکرێت لە نێوان دوو دەوڵەتی دەرەکی دا بەلانی کەمەوە لەسەر بنەمایەکی دوو لایەنە. میسر و شانشینی یەکگرتووی سودان لەسەر ئەم بناغەیە حوکم کرا لە پێش سەربەخۆیی بوونی لەساڵی 1956، هەروەها حکومەتێکی هاوبەش لە فەرەنسا و شانشینی یە کگرتوو حکومڕانی هەرێمی هبریدزی کرد.

See also : protectorate.

## Confederatiom کۆنفیدرالیزم (الاتحاد الفیدرالی)

شێوەیەکە لە شێوەکانی حوکم کە تێیدا چەند دەوڵەتێکی سەربەخۆ ڕێك دەکەون لە سەر پێدانی چەند دەسەلاتێکی دیاریکراو و سنوردار بە دەسەلاتێکی هاوبەشی نوێ لەگەڵ هێشتنەوەی قەوارە لێك دابڕاوەکانی سەروەری سەربەخۆی لە هەموو بوارەکاندا، تێپەڕاندنی هەرێمایەتیی دەوڵەتە هاوبەشەکان ڕوکارێکی ئاساییە، بەلام جەوهەری نیە بۆ یەکێتیەکی کۆنفدراڵی.

یەکێتی کۆنفدراڵیش جیاواز دەبێت لە یەکێتیەکانی تر لە پارێزگاریکردنی دەوڵەتە

پێکهاتووەکانی یەکێتی کۆنفدراڵی بەسەروەریەوە لە هەموو کاروبارەکاندا جگە لە چەند دەسەلاتێکی دیاریکراونەبێت کە بە شێوەیەکی ڕەزامەندانە سازشی لێ دەکات بۆ دەسەلاتی کۆنفدراڵی.

ئەمە لە کاتێکدا کەوا یەکێتییە کۆنفدراڵیەکان بەرەو ئەوە دەڕۆن کە لە ڕووی کردارییەوە و کەمتر هەمیشەیی بن لە یەکێتییەکان وە هەمیشە پاش ماوەیەك هەڵدەوەشێتەوە یان دەگۆڕێت بۆ یەکێتییەکان. لە نموونەی ولایەتە کۆنفدراڵیەکانیش ولایەتە ئەمریکیە سەربەخۆ نوێ یەکان لە نێوان ئیمزاکردنی بەندەکانی یەکێتی کۆنفدراڵی و دانانی دەستوری ئەمریکی (1781–1789) و کۆنفدراڵیەتی باشور لە جەنگی ناوخۆیی ئەمریکیدا و یەکێتی کۆنفدراڵییە جیاوازەکان لە نێوان ولایەتە ئەڵمانیەکاندا لە سەدەی نۆزدەهەمدا پێش دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتی دووەم.

See also : Federation ; sovereignty .

## Conflict Approach ڕێبازی ململانێ (*منهج الصراع*)

ڕێبازی ململانێ لە شیکاریی ڕامیارییدا بە تایبەتی جەخت لە سەر ئەمانە دەکاتەوە :–

* ڕەفتاری ڕامیاریی تاکەکان و کۆمەڵەکان بە زمانی مشت ومڕ لە نێوانیاندا لە پێناو ئەو بەهایانەی کە بە ئامرازە ڕامیارییەکان دابەش دەکرێن.

*ئەو پرۆسانەی کە ململانێکەیان یەکلایکردوەتەوە سەبارەت بە ڕامیارییەکان و ئەولەویەتەکان و ڕێگاکانی بەدیهێنانی ئامانجەکان و هەڵبژاردنی سەرکردەکان.

*شوێنەواری ململانێ لە پەیکەری سستمی ڕامیارییدا.

وە لە ژیانی ڕامیاریی نێو دەوڵەتیدا کە ململانێ لە چەمکە سەرەکیەکاندا بوو، لە لێکۆڵینەوەو توێژینەوەدا دەکرێت توێژینەوە لە پەیوەندیەکاندا بکرێت لە نێوان

سستمه ڕامیارییەکان دەوڵەتان بە گشتی بە زمانی ڕێبازەکانی. نموونەی ئەم جۆرە ڕێبازانەش بەکارهێنانی ئەو نموونە شێوەییانە دەگرێتەوە وەکو تیۆری یارییەکان و شێوازە جۆراوجۆرەکانی بیرکارین کەدەکرێت تیایاندا گۆڕانەکانی ڕەوشی ململانێکە بپێورێت، هەروەها تیۆری سازش کردن و، لێکۆڵینەوەی پەیوەندییەکان، و شێوازەکانی وەك یارییەکان لاساییکردنەوە.

See also : Bargaining theory ; game theory ; political system ;politics ; simulation

## Consensus ڕێکەوتنی ڕاوبۆچوونەکان (*اتفاق الاراء*)

حاڵەتی ڕێکەوتنە لە کۆمەڵگەیەکی ڕامیارییدا (بەڵام مەرج نیە کەلەزەوییەکدا هاوبەش بن) . پەیوەستە بەمانەی کە دیێ یان هەموویان: دیاریکردن و پێکهێنانی کۆمەڵگەی ڕامیاریی) (واتە ئەو کۆمەڵانەی کەتیایەتی پێکەوە دێنە ناوەوە)، و ئامانجەکانی کۆمەڵگە، وە ئەو ڕێو شوێنانەی کەبڕیارە پەیڕەو بکرێن بۆ گەیشتن بە بڕیارە ڕەسمیەکان لە کۆمەڵگەدا یان لە پێناویدا،هەروەها ئەو ڕامیارییەی کە کۆمەڵگە تەبەنی دەکات. لە کاتێکدا کە ناکرێت بە شێوەیەکی ورد ڕێکەوتنی ڕاوبۆچوونەکان بپێورێت ئەوا ئاماژەکانی ئاوا بوونی یان دیار نەمانی ئەمانە دەگرێتەوە: گەشەکردنی بزوتنەوە جیاخوازیەکان،زیادبوونەکان لە ڕوودانی کاری ڕاستەوخۆ یان شێوەکانی تری توندو تیژی ڕامیاریی، بەشداری ڕامیاریی، یان گەشەکردنی پشتگیری حیزبەکان یان ئەو بزوتنەوانەی کە دژ بە ڕژێمن.
وە لە چوار چێوەی شیکاریی ئەو سستمانەدا کە (دیفید ئەیستن) پەرەی پێداوە ئەوا ڕێکەوتنی ڕاو بۆچوونەکان پەیوەست دەبێت بە بڕی پشتگیرییەکان بۆ ڕژێم یان کۆمەڵگەی ڕامیاریی.
زۆر جار ئەم زاراوەیە بەکار دەهێنرێت لە چوار چێوەی (ڕامیاریی ڕێکەوتنی

ڕاوبۆچونەکاندا) بۆ ئەوەی ئاماژە بکات بەڕێسایەك بۆ مشتومڕو بڕیاری ڕامیاریی کە دەرئەنجامەکانی ڕێکەوتنیان لێ دەکەویتەوە، بە پێی توانا،بە پێچەوانەی جۆرەکانی ڕامیاریی ململانێ وە کە دەرئەنجامەکانی بە هۆی کۆمەڵە کردارێکەوە یەکلایی دەبێتەوە.

See also : conflict approach

## Conservatism (النزعة المحافظة) نەزعەی پارێزکاری

بیروباوەڕێکە لەبەهای دامودەزگاکان و ئەو پیادەکردنانەی کە هەن نەك بە مانای نەپاریکردنی هەر گۆڕانێك بەڵکو سوور بوون لەسەر پارێزگاری کردن لەوەی کە بەهایەو پیادەکردنی چالاکیە ڕامیارییەکان بەو پێیەی کەتۆڕێکی گونجاون لەنەریتە پێك هاتە ناسکەکان کەبە شێوەیەکی گونجاولیی تێ ناگەین بەزمانی تیۆری ڕووت یا میکانیکی . هەروەها تاك پێی وایە کە ئەو بە شێوەیەکی سروشتی بونەوەرێکە لە دروستکراوی کۆمەڵگە و هەڵگری ئەو مافە تاکییانە نیە کە کۆمەڵگای لێ بنیادنراوە بەشێوەیەکی دەستکرد.

کاری حکومەت بریتیە لەپاراستنی ئەو کۆمەڵە دامەزراوییانەی کە هەن نەك ئاراستەکردنیان و چارەسەرکردنی ستەمکارییەکان و یەکلایی کردنەوەی گرفتەکان لە ڕێگەی چوار چێوەی دامەزراوەوە بە پێی توانا. پێش هەموو شتێکیش ئەو بانگەشانەی کەدەکرێن بۆ وەرچەرخانی جەوهەری لە کۆمەڵگەو دەوڵەتدا و بەتایبەتی ئەو بەرنامانەی کەبیرۆکەی ئەبستراکت و تۆباوی لە خۆ دەگرن بۆ چاکردنی کۆمەڵایەتی ڕامیاریی دژ دەوەستنەوە لەگەڵ نەزعەی پارێزکاریدا.

نەزعەی پارێزکاریی لەپەرەپێدانی ڕەخنەکانیدا بۆ تێوەردانانی ڕووت و گۆڕانکاری ڕیشەیی وا دەردەکەوێت کە بە شێوەیەکی ئایدۆلۆژیی دژی نەزعەی ئازادە بە تایبەتیش لە هەڵوێستیدا بەرامبەر بە تاك.

ئەو دژ یەکیە روون و ئاشکرایە لە نێوان بیرۆکە پارێزکارەکان و ئازادەکاندا دەبێتە هۆی ئاڵۆزی و پشێوی لە ناو حیزبە پارێزگارە ئازادەکاندا. وەکو لە بەریتانیا، کاریگەری ڕاستی نویی وەرگرتووە. هەروەها وا دەردەکەوێت کە رەگەزە کرداری و نائایدلۆژیایەکی لە نەریتە پارێزکاریەکاندا لە ململانێدا بن لەگەڵ هەوڵەکانی خستنە ڕووی نەزعە پارێزکاریی بەو پێیەی کە ئایدۆلۆژیایەکی ڕێکخراوەو بنچینەیەکی فەلسەفی توندو تۆڵی هەیە.

نەزعەی پارێزگاریی بنەماکانی نایەکسانی و دابەشکردنی چینەکان و ڕێکخستنی هەرەمی قەبوڵ دەکات. لەبەر ئەم هۆیەش زاراوەی (پارێزکار) (Conservation) درێژ دەبێتەوە بەشێوەیەکی نامەحکەم بۆ وەسفکردنی ئەو هەرەمە چەسپاوانەی کەدژی هەموو بانگەشەکانی چاکسازییە جا سروشتی ڕامیارییان هەر چۆنێك بێت. لەم مانایەشدا ستەمکارە ڕاستڕەوو توندڕەوەکان لە سستمە کۆمۆنیستەکانی بەپارێزکار وەسف کردووە.

See also : contract theory: heirarchy ;
Ideology ; new right ; pargmatism radicalism

## دیموکراسی کۆمەڵگە فرە پیەکان (*دیمقراطیة المجتمعات المتعددة*)

## Consociatioal Democracy

شێوەیەکە لە دیموکراسیەت دەکرێت جیا بکرێتەوە لەو کۆمەڵگە دیاریکراوانەدا کە چەند بەشێك یان کۆمەڵەو رەگەزێکی جیاوازیان تێدایە بۆ نموونە، تایفە ئایینیەکان و کۆمەڵە زمانی و رەگەزییە گەورەکان و کۆمەڵە هەرێمی یان چینییەکان یان کلتوریە ئاشکراکان .کۆمەڵگە فرە پییەکان لە هەندێك حاڵەتدا پەرەیان بە شێوازێك لە سستمی دیموکراسی داوە کە جیاوازە لەو جۆرە دیموکراسیەی کە هەیە

لەسەر بوونی زۆرینە بە پالاوتنی بەشدار بوون لە دەسەلاتدا (بۆ نموونە لەرێگەی ئیئتیلافەوە زۆر جاریش _ وەکو لەنەمسادا چەندین ساڵ بەردەوام بوو – ئیئتیلافە گەورەکان) . ئەم بەشداریکردنە لە دەسەلاتدا پێك دێت لە دابینکردنی رێژەیی فراوان بۆ ناوەندە رامیارییەکان و ئەوانی تر لە دەوڵەتدا (نەك تەنها وەزارەتەکان بەڵکو پلە خزمەتگوزارییە مەدەنیەکان و کورسییەکانی دەزگا گشتییەکان کە سەرپەرشتی دەزگا رادیۆییەکان دەکات .... هتد)، هەروەها پێك دێت لە رێز گرتنی سەربەخۆیی بەشەکان لەکاتێکدا ئەگەر ئەمە بواری مومارەسە بوو (بۆ نموونە بە تایبەتکردنی ماوەی پەخش بۆ هەموو بەشە سەرەکیەکان لە وێستگەکانی رادیۆ حکومیەکاندا) هەروەها رێزگرتنی ئاڵوگۆڕکراو بۆ مافەکانی هەموو بەشێك و بەرژەوەندیەکانی و دانان بە مافیدا لەدژ وەستانەوەی لەگەڵ ئەو بڕیارانەدا کە کار دەکەنە سەر بەرژەوەندیە ئۆرگانیەکانی (بۆ نموونە هەرێمە زمانیەکان لە بەلجیکای ئەمڕۆدا و بە تایبەتی لەوەدا کە پەیوەندی بە رامیارییە کلتوریەکان و پەروەردەییەکانەوە هەیە) .
بەو شێوەیە دیموکراسیەت کۆمەڵگە فرەییەکان شێوازێکە لە حوکمڕانی کە تێهەڵکێشکردنی رامیاریی ئاسان دەکات لە کۆمەڵگەیەکدا کە بە بێ ئەم جۆرە فەرمانڕەواییە گرژی و ئاڵۆزی سەر هەڵدەدات لە ئەنجامی بەرژەوەندیە جیاوازەکانی بەشەکانەوە. ولاتانی فرە زمان و فرە بیروباوەڕیش زۆر جار حاڵەتی ئاشکرا پێش کەش دەکەن لە دیموکراسیەتی بەشە فرەییەکان : هۆڵەندە و بەلجیکا و نەمساو سویسرا و، هەروەها لوبنان و قوبرس هەتا رادەیەك پێش ئەوەی گرژییە ئایینیە نەتەوەییەکان لە هەر یەکێکیاندا ببێتە هۆی بەرپا بوونی جەنگی ناوخۆو تێك دانی ئەو رێ و شوێنانە کە گیرا بوونە بەر بۆ بەشداریکردنی بەش و لایەنە جیاوازەکان لە دەسەلاتدا. دەکرێت بووترێت کە کۆمەڵەی ئابوری ئەوروپی لە چەند لایەنێکی دیاریکراوەوە زۆر رووکاری دیموکراسیەتی کۆمەڵگە فرەییەکانی پێش کەش کردووە.
خوێنەر دەتوانێت شیکارییەکی تێرو تەسەل تر سەبارەت بە دیموکراسیەتی کۆمەڵگە فرە ییەکان لەکتێبی (ئەرینت لیجفارت) دا ببینێتەوە : دیموکراسیەت لە

کۆمەڵگە فرە بییەکاندا (نیو هیفن، ولآتە یەکگرتووەکان، چاپخانەی زانکۆی ییل 1977).

**See also : cleavaye ; democracy ;**
**Ninority : political integration ;veto .**

## تیۆرەکانی پیلانگێڕی (*نظريات التآمر*) Conspiracy Theories

کۆمەڵە سستمێکی باوەڕە ئەو بیرۆکەیە دەگرێتەوە کە چەند دیاردەیەکی کۆمەلآیەتی دیاریکراووگرنگ بە تایبەتی ئەو دیاردانەی کە دادەنرێن بەوەی زیان بەخشن یان خراپن دەر ئەنجامی پیلانگێڕی چەند ئەندامێکی دیاریکراون لە کۆمەڵگەدا کە زۆر جار دادەنرێن بەوەی کە بەکرێگیراوی دەوڵەتێکی بیانی بن. لایەنگرانی ئەم تیۆرە زۆر جار بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئەوان بەڵگەیان پێیەو بە بێ هیچ گومانێك سەبارەت بەکەسەکان و ئەو ستراتیژانەی پەیوەستن بە پیلانگێڕیەوە، زۆر جاریش وای دادەنێن کە ئەرکی سەر شانیانە ئەو پیلانە ئاشکرا بکەن کە دزیویانەتەوە و تێکی بشکێنن لەهەندێك حاڵەتی تردا بوونی پیلان بەوە دیاری دەکرێ کە ئەوانەش کەزیانی (مادی و نامادی یان) لێ دەکەوێت بەرپرسیارێتی ئەوە دەخەنە ئەستۆی پیلانگێڕیی ئەوانەی دەسکەوتیان دەبێ،لەوانەشە کەپیلانگێڕییەکە شاراوەبێ.

نموونەی زۆریش هەیە لە مێژوودا لە سەر تیۆرەکانی پیلانگێڕی کە بە شێوەیەکی بەر فراوان بلآو بونەتەوە (بۆ نموونە دژایەتی کاتۆلیکیەت، گەلگەرایی لەهەندێك لەشێوەکانیدا، ئەمە لە کاتێکدا کە دژایەتیی سامیەت لە شێوە نوییەکەیدا (بۆ نموونە، کە پشت بە پرۆتۆکۆلەکانی دانایانی زایۆن) دەبەستێ و دژایەتیی کۆمۆنیزم لەوولآتە یەکگرتووەکاندا ئەو بە دوادا گەڕانانەی کە (جۆزیف مکارثی) هەستا

پێیان دوو نموونەن لەو نمونانەی کە زیاتر گرنگن لەسەدەی بیستەمدا لە ڕووی کاریگەرییەکەیانەوە لە کۆمەڵگەدا.

## بازنەی هەڵبژاردن (*الدائرة الانتخابية*) Constituency

کۆمەڵەی ئەو دەنگدەرانەی کە مافی ئەوەیان هەیە نوێنەرێك بۆ خۆیان هەڵبژێرن.بەوشێوەیە ئەوا ئەوان لە هەڵبژاردنە گشتییەکاندا کۆمەڵێکن لە دانیشتوان کە لە ڕووی جوگرافیەوە دیاریکراون و دێن و دەچن لە نێوان بازنەیەك لەهەڵبژاردنە ناوچەییەکاندا بۆ بازنە گەورەکان لە بەریتانیا و لە هەڵبژاردنی نوێنەرەکاندا بۆ پەرلەمانی ئەورووپی و لە وڵاتە یەکگرتووەکان و هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی پیران و ...هتد.

هەروەها لە هەندێك لە ڕێکخراوە ڕامیارییەکاندا بازنەی هەڵبژاردن کۆبونەوەیەك دەبێت کە بە وەزیفە یان بە پێوەرەکانی تر دیاری دەکرێت بۆ نموونە سەندیکایەك لە ناو یەکێتی سەندیکا کرێکاریەکاندا.

هەروەها مانایەکی لاوەکی ئاماژە دەکات بۆ کۆمەڵێك یان بەشێك لە کۆمەڵگەدا کەڕامیار سەربەخۆ لەو ڕێ و شوێنە نیزامی یان هەڵبژاردنیەکان دەسەڵاتی لێوەردەگرێ: ووتە بێژێك بە زمانی سوپاوە لە حکومەتێکی ستەمکاردا یان نوێنەری ڕێکخراوێکی لاوانی سەر بە حیزبێك لە کۆنگرەی ساڵانەی حیزبدا یان پاڵێوراوێك لە کەمینەیەکی ڕەگەزیدا هەڵدەبژێرێت بۆ ئەندامیەتی ئەنجومەنی یاسادانانی نیشتیمانی، (بۆ نموونە) .

See also : Approtionment ;gerryman dering.

## Constitution دەستور (الدستور)

بەیانێکی جەوهەریە سەبارەت بەو یاسایانەی کە حوکمی وەزیفەی دامودەزگاکان دەکات لە کۆمەڵێکی ڕامیارییدا وە پەیوەندیەکان لە نێوانیاندا یان ڕاگەیاندنێك بەو کۆتانەی کە دانراون لە سەر دەسەلاتی دامودەزگاکانی لەم شێوەیەدا هەمیشەیش لیستێکی تیایە سەبارەت بە مافەکانی هاولاتیان. وە لەزۆربەی حاڵەتەکاندا دەستور بەڵگەنامەیەکی نوسراو و پۆلێنکراوە، ئەمە لەکاتێکدا لە هەندێك دەوڵەتدا لە نموونەی شانشینی یەکگرتوو دەستورێکی (نەنوسراو) یان هەیە چونکە یەك بەڵگەنامەی پۆلێنکراو نییە کە دەستورەکە لە خۆ بگرێت وە لەبەر ئەوەی دەستور وا دادەنرێت کە بە شێوەیەکی بەشی پێکهاتووە لەعورفە نەنوسراوەکان.

دەکرێت دەستورەکان بەچەندین ئامرازی دروست بکرێن لەوانەیش بەکار هێنانی عورفی دەستوری یان سەپاندن لە دەوڵەتێکی بیانیەوە یان مەرسومێکی یاسادانان یان جەختکردنەوەی گەل لەسەر بڕوانامەیەکی دەستوری لە ڕێگەی ڕاپرسیەوە دەکرێت کە دەستورەکان چاکسازیان تێدا بکرێت بە شێوەیەکی مەشروع بەو شێوازەی کە جێگیرکراوە لە هەمان دەستوردا، زۆر جاریش ئەم پرۆسەیە ئاڵۆز گران دەبێت بە شێوەیەکی ئەنقەستانە ئەمەیش بۆ جەختکردنەوە لەسەر بالا دەستیی حوکمە دەستوریەکان بە بەراورد لەگەڵ یاسا ئاساییەکان. سەرەڕای ئەوەیش کە ئەم ڕێکسازیە زۆر ئاسانترە لە دەستورێکی نەنوسراودا لە کاتێکیشدا کە ڕێکسازیی دەستورەکان ئاسان دەبێت ئەوا پێیان دەوترێت دەستورە (نەرم) ە کان. زۆربەی دەستورەکانیش دێباچەیەکیان هەیە کە ئەو مەسەلانە ڕوون دەکاتەوە لە نموونەی ئەو هۆکارانەی کەپێویستن بۆ دانانیدەستورەکە و ئەو بنەما ئایدۆلۆژیانەی کە پشتیان پێ دەبەستێت و وە بانگەشەکانی بە موڵکداریەتی ئەو زەویانەی کە هێشتا نەخراونەتە سەر ئەو زەویانەی کە دەستوریان بەسەر جێ بەجێ دەبێت (لە نموونەی دیباچە یاسای (بنەڕەت) ی کۆماری ئەڵمانیای یەکگرتووە پێش یەکگرتنەوەی

ئەڵمانیا ساڵی 1990 کە دیباچەکە باس لەوە دەکات کە یاسای بنەرەت کاتییە لە چاوەڕوانی یەکگرتنی کۆتایدا) . لە زۆر دەوڵەتیشدا پرۆسەی پێداچوونەوەی یاسایی هەیە کە دادگاکانی دەستوری یان دەزگایەکی هاوشێوە ئەبیات بەڕێوە کە دەکرێت هەر یاسایەك یان کارێك لە لایەن حکومەتەوە یان کۆمەڵەکانی ترەوە یان تاکەکانەوە بخرێتە لاوە ئەگەر یاساکە یان کارەکە دژ وەستایەوە لەگەل ڕاڤەی قازییەکانی دەستوردا.

## یاسای دەستوریی (القانون الدستوری) Constitutional Law

بریتیە لەو ڕێساو ڕێو شوێن و بڕیارە یاساییانەی کە پەیوەستن بەو ڕێساو ڕێ وشوێنانەوە کە سەبارەت بە پەیکەرەکانی حکومەت و دەسەلاّتەکانی و فەرمانە سەرکیەکان و پە یوەندیەکانانی نێوانیان.

لە کۆمەڵگە ڕامیارییانەدا کە دەستورێکی نوسراویان هەیە ئەوا خودی دەستور سەرچاوەی سەرەکیە بۆ یاسای دەستوری، وە لە هەموو دەوڵەتەکاندا ئەوا بڕیارەکانی دادگاکان کە ڕاڤەی ئەم جۆرە ڕێسایانە دەکات سەرچاوەیەکی گرنگە.

لێکۆڵینەوەی یاسای دەستوری لە بەریتانیادا بنەما گشتیەکانی عەقیدەی دەستوری دەگرێتەوە لە نموونەی سەروەری پەرلەمان و حوکمی یاسا (بەریتانیا دەستورێکی پۆلێنکراو و نوسراوی نیە)، و یاساو عورفەکان وڕێسای ڕێکارەکان کە پەیوەستن بە پەرلەمانەوە و لەوانەیش دەسەلاّتیش و هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجومەنی گشتی و دەسەلاّتەکانی شا وحکومەتی جێبەجێکردن و ڕۆڵی دادوەری لەوەدا کە پەیوەندی بە مەسەلە دەستوریەکان و مافەکانی هاوولاّتیان و ئەرکەکانیانەوە هەیە لە بەرامبەر حکومەتدا. هەروەها ئەم بابەتە لە وولاّتە یەکگرتووەکاندا لێکۆڵینەوەکانی دەستور ڕاڤەکردنی ناوەڕۆکەکانی لەدادوەری و پەیوەندیە یەکێتییەکان و فەرمانەکانی سەرۆك و دەسەلاّتەکانی و حکومەتی

جێبەجێکردنەکەی و کونگریس دەگرێتەوە.

See also : Adminstrative Law ;constitution ; judicial review;rule of Law.

## Constitutionalism (الدستورية) دەستوریەت

ئەم زاراوەیە دوو مانای هەیە کە یەك پەیوەستە بەوی ترەوە یەکێکیان تایبەتە بەدەستوریەتەوە بەو پێیەی کە پیادەکردنەو ئەوی تریشیان بەو پێیەی هەڵسەنگاندنێکی ئیجابییە بۆ ئەو پیادەکردنە.

دەستوریەت بەو پێیەی کە پیادەکردنە بریتیە لە رێکخستنی کردارە رامیاری و دامودەزگاکان لەسەر بنچینەی دەستورێك کە شێوازی دامودەزگا رامیارییە نیزامیەکان دیاری دەکات و هەروەها پێوەرە رامیارییە بنەڕەتیەکان بۆ کۆمەڵگە بەرجەستە دەکات. دەستور تەنها پەیوەندیەکانی دەزگاکانی دەوڵەت یەك بەیەکەوە رێك ناخات بەڵکو هەروەها دەسەڵاتەکانی حکومەتیش دیاری دەکات بە پێی هەڵسەنگاندنی خۆی بەمەیش هاولاتی دەپارێزێت. دەرکردنی کۆتی لەم شێوەیەش تەحکیمکردن لە دەزگا قەزاییەکاندا دەخوازێت (بۆ نموونە دادگای بالآ لەولآتە یەکگرتوەکان و دادگای دەستوری لە کۆماری ئەڵمانیای یەکگرتوودا کە دادگا پێداچوونەوەی یاسایی بەسەر کارەکانی حکومەتدا جێبەجێ دەکات، هەروەها سیستمی ئاسایی داداگاکان و چارەسەرە مەدەنی و سزاییەکان لە بەریتانیادا، سەرە رای جێبەجێکردن (Enforcemennt) . لەکاتێکدا کە یەکێتی سۆڤیەت (بۆ نموونە) دەستورێکی هەیە ئەوا میکانیزمی دیاریکراو بۆ سەپاندنی یان قەبوڵ کردنی دەسەلآتە رامیارییەکان کۆتی نادیارن. سەرەڕای ئەوەیش کە دەستوریەت بە تەنها بوونی نیە لە سستمەکانی حوکمی دیموکراسیدا بەلآم مەرجێکی بنەڕەتیە لە دەوڵەتی دیموکراسیدا.

هەروەها دەستوریەت بەو پێیە کە زاراوەی هەڵسەنگاندنی بیرۆکەیەکە ئەوانەی کە حەز بە پارێزگاری لە باڵا دەستیی دەستور دەکەن لەناو لێکۆڵینەوەیەکی دیاریکراودا یان پێشکەشکردنی بۆ ئەوەی ببێتە پارێزەری هاوولاتی لە حکومەتی ستەمکار بەو پێیەی کە بەیانێکە بە پەیوەندیە رامیارییەکان بە تایبەتی کاتێك کە نموونەی ئەم بەیانەیان پاراستنە لەشێوەیەکی قایل کەردا بوونی نەبێت. وە جەخت لەسەر (حوکمی یاسا) دەکات بەو پێیەی چەمێکی بنەڕەتیە کە دەستوریەتی لێوە هەڵدەهێنجرێت.

See also : corstitution ; rule of Law

## شیکاریی ناوەڕۆك (*تحليل المحتوى*) Content Analysis

شێوازێکە بەکار دەهێنرێت لە زانستی کۆمەڵناسیدا بۆ پێوانە کردن و پۆلێن کردنی تایبەتمەندیەکان لە برگەی پەیوەندییەکاندا بە پێی کۆمەڵێکی بابەتی لەو کۆمەڵانەی کەپێشتر پاڵفتەکراون. ئەوانەیە کەیەکەی پێوانەیش لە دەقدا، ووشە یان رستە یان بیرۆکە، یان لە پەیوەندی نازارەکیدا پەیوەندی و هێمابێت. هەروەها شیکاریی ناوەڕۆك بەکار هاتووە لە زانستی رامیارییدا بۆ لێکۆڵینەوەی جیاوازیی لە بیرۆکەکاندا لەووتارەکانی قەبولکردنی ناونانی پاڵێوراوەکاندا بۆ سەرۆکایەتی ئەمەریکا و شیکاریکردنی بانگەشەو بەراوردکردنی زانیارییە هەڵبژاردنیەکان بۆ حیزبەکان لە هەڵبژاردنەکانی بەریتانیادا.

See also : politicol communication

## تیۆری گریّ بەست (نظرية العقد) Contract Theory

بریتییە لەوەسفکردنی ئەو پەیوەندیە کۆمەڵایەتی و رامیارییانەی کە کۆمەڵگە یان دەوڵەت یان هەردووکیان دەرئەنجامێك پێش کەشکەش دەکەن بۆ پەیماننامە ئاڵوگۆڕکراوە سەپێنراوەکان لەنێوان تاکەکاندا یان کۆمەڵەکاندا. بەندەکانی ئەم ڕێکەوتنەش یان (پەیمانی کۆمەڵایەتی) یە نوێنەرایەتیی پابەندبوونەکانی ملی کەچی دەکەن لەلایەن ژێر دەستەکانەوە هەروەها لەوانەشە کە چەندین کۆت بسەپێنێ بەسەر دەسەڵاتەکانی حکومەتدا، پێویستە تەنها بەو شێوەیە هەڵسوکەوت بکات کەلە بەرژەوەندی گەلدا بێت یان پێویستە بە پێی کۆمەڵە بنەمایەکی دەستووری دیاریکراو حوکم بکات.

تیۆری گریّ بەست جێگەیەکی ناوەندیی لەفیکری رامیاریی ئەورووپیدا داگیر کردوە لەکۆتاییەکانی سەدەی یازدەهەم تا کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەم. هەندێکیش ڕیشەکەی زۆر جار دەگێڕنەوە بۆ بیری گریکی بەڵام بە شێوەیەکی ئاشکرا جیا دەکرێتەوە لە ڕاوبۆچوونەکانی پەیوەندیە دەربەگایەتیەکاندا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە نێوان پاشاو دەربەگ و شوێنەکەوتەدا . وە لەگەڵ پەرەسەندنی تیۆری گریّ بەستدا بایەخەکان لە ئەرکە ئاڵوگۆڕکراوەکانی کۆمەڵە پایەدارەکانەوە دەگۆڕیچت بۆ گواستنەوەی سروشتییەکان لەڕێگەی قەبوڵکردنی خۆویستی بەخشراو لەلایەن ئەو تاکانەوە کەژێرو پایەی پەسکان دارن ئەو مەڵبەندە وردەیشی کە دراوە بە گریّبەستی کۆمەڵایەتی جیاوازیەکی فراوان هەیە لە نێوان نوسەرە جیاوازەکاندا لەم بارەیەوە. هەندێکیان پێیان وایە کە گریّ بەستە ڕوداوێکی کرداریيەو دەکرێت لە ڕووی مێژووییەوە جیا بکرێتەوە (تاجکردنە سەر پاشا) یان ڕوداوێکە کە حەتمەن لە سەرەتای کۆمەڵگەوە یان حکومەتەوە ڕویداوە لە کاتێکی تۆمارنەکراودا. هەندێکی تریش پێیان وایە کە گریّ بەستە کە وەهمی و گریمانییە (وەکو ئەوەی گریّ بەستێك بێت کە بەکرداری ڕووی دابێت) یان تۆباوی (گریّ بەستەکە نموونەیەکی پێوەری

پێشکەش دەکات کە دەکرێت حوکم لەسەر شەرعیەتی حکومەت بکرێت بە بەراورد کردن پێی) .

تیۆری گرێ بەست لەم سی ساڵەی دواییدا ژێنراوەتەوە هەتا وای لێهاتوە ئێستا نموونەکانی گرێ بەستە گریمانەیی ونمونەییەکان بە تەواوی بلاوبونەتەوە لە تیۆری هەڵبژاردنی کۆمەڵی و فەلسەفەی رامیاریی و رەوشتیدا.

See also : convention (b) : procedural convention ; fendalism ; Law (c) :inatural Law ; state .

## Contradiction دژیەکیی (التناقض)

بریتیە لەپەیوەندیی ململانێ لە نێوان رەگەزەکانی سستمێکدا (سستمی بیروباوەری تاکێك یان سستمێکی کۆمەلایەتی) بەشێوەیەك کە نەکرێت ئامانج یان مەرجی جەوهەری ئەو سستمە تێر بکرێت بۆ نموونە هەندێك پێی وایە کە شەرعیەتی دەوڵەت لە کۆمەڵگای سەرمایەدارە پێشکەوتووەکاندا بە شێوەیەکی بەشی پشت دەبەستێت بە پێش کەش کردنی خودی دەوڵەت بەجیاولە بواری تایبەتی بەرهەمهێنان، بەلام کۆکردنەوە لە نێوان کێبەرکیی ئابوری دەرەکی و داخوازیە رامیارییەکاندا دەوڵەت ناچار دەکەن کە دەخالەتی راستەوخۆ بکات لە بەرهەمهێناندا بۆ پشتگیری بەشە پیشە سازیە لاوازەکان. بەم شێوەیە شەرعیەتی سستمی ئازاد دەکەوێتە مەترسیەوەو بەمەش دژ بەکیەکە دیار و ئاشکرا دەبێت.

مارکسیەکان ئەم زاراوەیە بە بەردەوامی بەکار دەهێنن لە شیکاریکردنی ئەو هێزانەی کە وەرچەرخان دروست دەکەن لە سستمێکدا بە تایبەتی ئەو هێزە بۆماوەییانەی لە خودی سەرمایەداریدا کە ململانێیەك دروست دەکەن خودی سستمی سەرمایەداریش دەخەنە بەردەم هەرەشەوە. واتە رەوشێکیلەبار بۆ شۆڕشدەرەخسێنن. نموونەی ئەم جۆرە شیکارییەش دەکەوێتە بەردەم رەخنەوە بەوەی کە لە توانای سستم کەم دەکاتەوە لە لەخۆگرتنی فشارو سازان لەگەڵی بە

بــەکارهێنانی زاراوەی بــەهێزی (دژیــەکی) کــەوا باشــترە کــە زاراوەی (مەیلــە دژیەکەکان) بەکار بهێنرێت.

See also : Dialectic ; legitimacy ; Liberalism; marxismm .

## Convention (a) The Institution کۆنگرە (ا) دەزگا ﴿المؤتمر، المؤسسة﴾

هەندێك جار کۆبونەوەی کۆمەڵە رامیارییــەکان بــۆ مەبەستە جیاوازەکــان بــە (کــۆنگرە) وەســف دەکرێــت کاتێــك بــە شــێوەیەکی نیزامــی بــۆ ئامــانجێکی ئاشــکرا (دەبەسترێت) . دوو جۆری سەرەکیش لەم کۆنگرانە هەیە : کۆنگرە دەستوریەکان کە نوێنەرەکان کۆ دەبنەوە بۆ دارشتنەوەی دەستورێکی نیشتمانی یان هەرێمی نویێ لــە ولاتە یەکگرتووەکاندا ساڵی 1787 وە لە ئەڵمانیا ساڵی 1919 (دەستوری فایمار)، وە لە کۆماری ئەڵمانیای یەکگرتوودا ساڵی 1948 – 1949 (دەستوریەکان) وکــو کۆنگرەکــانی پــالأوتن وەکــو ئــەوەی کــە حیزبــە سیاســیە ســەرەکیەکان لــە وولاتــە یەکگرتووەکان دەیگرن بۆ هەڵبژاردنی پالێوراوەکان بۆ هەڵبژاردنی سەرۆك و جێگری سەرۆك، لەحاڵەتیکۆنگرە هەرێمایەتیەکاندا، وە دارشتنەوەی بەرنامەیەك بۆ نمایش وکردنی پێشنیازەکانی رامیارییەکان.

See alao :Constitution : convention (b) ; Procedural convention .

## Convention (b) : procedural convention رێسا پیادەکردەییەکان ﴿القواعد الأجرائية﴾

بریتین لەو ڕێسایانەی کە چەند پێوەرێک یا پیادەکردنێک دەخەنە ڕوو کە پەیوەندییە ڕامیارییەکان ڕێک دەخەن و پابەند بوونەکان بەسەر ڕەگەزە ڕامیارییەکاندا دەسەپێنن بەڵام نەخراوەتە یاسایەکەوە یان بە کۆتە یاساییەکان دەوری نەگیراوە.

ڕێسا ڕێکارییەکان بۆ ئاراستە کردنی ڕەفتارەکان سەر هەڵئەدەن لەکاتێکدا کەڕێسا زیاتر شێوەیی و بێدەنگ یان پەنهان دەبن. ئەمەیش نەنوسراو دەبێت و لەپێشینەیەکەوە پەرەدەسەنێت بەڵام لەوانەیە کە مەسەلەکانی ڕێکەوتنی نێوان ڕەگەزە ڕامیارییەکان بێت.لەوانەیشە ڕێکسازی بکرێت یان دووبارە لێک بدرێتەوە لەگەڵ گۆڕانی باروددۆخەکاندا بەڵام ئەگەر بەزێنرا ئەوا ڕەنگە قەیرانێکی ڕامیاریی بخاتەوە یان پێویستییەك دروست دەکات بۆ بنەمایەکی یاسایی زیاتر دیاریکەر بۆ حوکمدان بەسەر ئەم جۆرە حاڵەتانەدا لە ئایندەدا لەکاتێکیشدا کە ڕێسا ڕێکارییە زۆر جار نەنوسراون وە لەبەر ئەوەی دادگایەکی سەرپشکراو نییە بۆ دیاریکردنی ئەوا ناوەڕۆکەکەی زۆر جار دەبێتە مەسەلەیەکی ئیجتیهادی ئەمەیش سیمایەکە کە نەرمی لە جێبەجێکردندا دەچەسپێنێ و بەڵام لەوانەیشە ببێتە هۆی ناکۆکی.

لە ئائامادەبوونی دەستورێکی نوسراویشدا ئەوا سستمی پەرلەمانی بەریتانی دەوڵەمەندە بە ڕێسا ڕێك کارییەکان. دەسەڵاتی سەرۆك وەزیران لە هەڵبژاردنی کاتی هەڵوەشانەنەوەی پەرلەماندا (کە ملکەچی کۆتی پێنج ساڵەیە کە یاسای پەرلەمانی ساڵی 1911 سەپاندویەتی و ئەرکی وەزیر بە پابەند بوون بە بڕیارەکانی ئەنجومەنی وەزیرانەوە یان دەست لە کارکێشانەوە یا ئەوەی پێی دەوترێت (یاسا و نەریتی پەرلەمان) کە لە کتێبی ئەرسکین مەی پێناسەکراوە بە **Parliamentary practice**)) (پیادەکردنی پەرلەمانی) هەموو ئەمانە وەك ڕێکاریی وەسف دەکرێن. وە لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا یاسا ڕێگە دەدات بە مافی هەڵبژاردنی سەرۆك بۆ دەستەی دەنگدەران (**Electoral college**) بەڵام ئەو ئەندامانە بە پێی ڕێسا ڕێکارییەکان پابەندن بەوەی کەدەنگەکانیان بدەن بەو پاڵێوراوەی کە زۆرترینی

دەنگەكانی جەماوەر لە ولایەتەكەیاندا بە دەست دەهێنن. هەروەها مانایەكی هاوشێوە هەیە بۆ ئەم زاراوەیە لە فەلسەفەی ڕامیارییدا.

شیكاركردنی هەڵبژاردنی ئەقڵانی زاراوەی (Convention) واتای ڕێكخستنی ئاڵوگۆڕكراو بۆ كار لەلایەن ژمارەیەك لە تاكەكان بە بێ بەكارهێنانی ڕێكەوتنێكی ڕوون یان پەیماندانێكی سەپێنەر. لەوانەشە داننان بە بەرژەوەندییەكی ئاڵوگۆڕكراوە بەس بێ بۆ بەرهەم هێنانی كارێكی ڕێكخراو بەبێ گەیاندنێكی ڕوونی ئەم دانپێدانانەیش. بەم شێوەیە ئەم زاراوەیە شوێنێك داگیر دەكات لە نێوان گرێ بەست (Contract) و (custom) نەریتدا لە بریان بەكار دێت لە ڕاڤەكردنی ڕەفتاری كۆمەڵایەتیدا.

هەروەها زاراوەكە بە مانای ڕێكەوتنەكانی نێوان دەوڵەتەكانیش بەكاردێ كەشێوەی پەیماننامەیان هەیە ڕێكەوتنامەی ئەورووپی بۆ مافەكانی مرۆڤ و ڕێكەوتننامەكانی جنێف سەبارەت بە ڕێساكانی جەنگ.

See also : conturact theory ;convention
: the institution ;custom ; pact;protocol (a) :
ceremonial ;protocol (b) :
agreement, rational analsis ; treaty .

## گریمانەی لێك نزیك بوونەوە (فرضية التقارب) Convergence Thesis

بیرۆكەی ئەوەی كە پێویستییەكانی حكومەتی نوێ حەتمەن دەوڵەت و كۆمەڵگا سەرمایەداراری و سۆشیالیزمەكان ناچار دەكات كە وایان لێ بێت تا ڕادەیەكی زۆر لەیەك بچن واتە لێك نزیك ببنەوە. ئەم پێداویستیانەش زیادبوونی پێویستی بۆ پلانرێژییە ئابوری و كۆمەڵایەتی دەگرێتەوە لەكۆمەڵگا سەرمایەدارەكاندا لەگەڵ

بەکارهێنانی حەتمی هێزەکانی بازاڕ لەکۆمەڵگا سۆسیالیستەکاندا بۆ بەدیهێنانی ماقوڵیەت و گەشەی ئابوری و گرنگی ڕوو لەزیاد بووی فاکتەرە نێو دەوڵەتیەکان بەرامبەر ئابوریەکانی هەموو دەوڵەتەکان و کۆمەڵگاکانیان، وە بڵاو بوونەوەی گرفتەکان وەك ئایدز و بەکارهێنانی مادە بێ هۆشکەرەکان و تاوانە نێو دەوڵەتیەکان لە ڕێگەی سنورەوە. ئەم پێداویستیانە، بەپێی تیۆرەکە، هانی پەرەسەندنی ڕێکخراوە بیرۆکراتیەکان دەدات، چ لە کۆمەڵگە سەرمایەداریەکاندا یان سوشیالیستیەکاندا، هەروەها داڕشتنی ڕامیارییە ئەقلانیەکان و جێ بەجێکردنیان بۆ ڕوبەڕوبوونەوەی ئەم جۆرە بەرەنگاریی و ڕامیارییانەی کە نزیك دەبنەوە سەرەڕای بوونی جیاوازیە ئایدۆلۆژیەکان لەنێوان جۆرەکانی کۆمەڵگەدا. ئەم گریمانەیەش پەرەی پێدرا لە دەیەی پەنجاکان و شەستەکاندا کاتێك کە پلانرێژیی رەواجی زیاتری پەیدا کردو بڵاوبویەوە لە دەوڵەتە سەرمایەدارییەکاندا بەڵام ڕووداوەکانی ئەم دواییە لەیەکێتی سۆڤیەتی و ئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا ئامارە دەکات بەوەی نزیك بوونەوە، ئەگەر بوونیشی هەبێت، ئەوا بەرەو نموونەیەکی سەرمایەداری دەچێت نەك بەرەو نموونەی (ئابوری تێکەڵ) بۆ سەرمایەداریی دەوڵەت.

## هاوبەشیگەرایی (*الشركاتية*) : (أ) ئایدۆلۆژیا (*العقيدة*) Corporation (a) : Ideology

ئایدۆلۆژیایەکە هەندێك جار پێی وایە کەبەتوندی پەیوەست دەبێت بەفاشیزمەوە بە تایبەتی فاشیزمی ئیتالیی، ئەمە لە کاتێکدا بەشێوەیەکی توندو تۆڵ تر پەیوەست دەبێت بە تیۆری کۆمەلایەتی کاسۆلیکییەوە. پێویستە بەڕێوبەرو کرێکارەکان لە کۆمپانیاکاندا یان (سەندیکاکاندا) ڕێکبخرێت و کەنوێنەریەتی هەموو پیشەیەك یان لقێك لە پیشەسازیدا بکات. هەروەها پێویستە پەرلەمان بگۆڕێت بە ئەنجومەنێکی یەکگرتوو کە نوێنەرایەتی بەرژەوەندیەکانی کۆمپانیا جۆراوجۆرەکان

بکات. بەو شێوەیە وا دادەنرێت کارگێڕی تێهەڵکێش کراو بۆ بەرژەوەندییە ئابورییەکان جێگەی ململانێی رامیاریی بگرێتەوە، کاتێکیش کە ئەم جۆرە پیادەکردنانە لە ئیتالیا دامەزران لە ژێر کۆنترۆڵی دەوڵەتی فاشیستیدا مانەوە.

See also :Anarcho – syndicalism ;christion Democracy ;corpatism (b) :ideal type.

## هاوبەشی گەرایی (*الشركاتية*) (ب) جۆری نمونەیی
## Corporatism (b) Ideal Type

جۆرێکی نمونەیی لەکاری دەوڵەت کە لەدیموکراسیەتە ئازادە رۆژئاواییەکاندا جێ بەجێ دەکرێت و بە تایبەتیش لە کۆتاییەکانی دەیەی شەستەکاندا و دەیەی هەفتاکاندا بڵاو بوویەوە.

بەرژەوەندیەکان لەم نموونەیەدا لەرێگەی ژمارەیەکی دیاریکراو لە پەیوەست بوونە هەرمیە زنجیرەییەکانەوەنوێنەرایەتی دەکرێن کە حکومەتەکان راشکاوانە یان بە شێوەیەکی نهێنی دانی پێدا دەنێن بەو پێیەی کە سەرچاوەی شەرعی سەرەکییە بۆ داواکردنی رامیارییە کان، جیاوازیش هەیە لە نێوان شێوازەکانی هاوبەشیگەرایدا: یەکێك لە شێوازەکان زۆر جار پێی دەوترێت (فرەیی هاوبەشیگەرایی) کە رەنگە مامەڵە لەگەڵ دەوڵەتدا بکات بەو پێیەی ئامرازێکە بۆ جێبەجێکردنی رامیارییە بەرفراوانەکان کە کۆبونەوەی بەرژەوەندیە پەیوەندی دارەکان لەسەری رێك دەکەون. نموونەیەکی تریش هەیە کە پێی دەوترێت (هاوبەشیگەرایی حکومی) کە سەرنج رادەکێشێ بۆ سوودەکانی دەستەبژێرە حکومیەکان کە لە ئەنجامی تێهەڵکێشی کۆمپانیاکانەوە دێنە ئاراوە.

See also : Ideal type ; pluralism ;
state correspondence
rules See :Operationalization corporation See :
verification.

**counter-ruvolution** **شۆرشی دژ** *(الثورة المضادة)*

هەوڵدان بۆ گێڕانەوەی ئەو بارودۆخەی کە پێش ڕوودانی شۆڕشێکی سەرکەوتووە هەبووە، ئەمەیش لەڕێگەی بەکارهێنانی هێزەوە.

See also: Revolution.

**coup d,etat** **کودەتای چەکداریی** *(انقلاب مسلح)*

بریتیە لەگۆڕینی ڕژێمێك لەڕێگەی کاری نایاسایی و نادەستورییەوە لەلایەن هەلگری یان کۆمەڵە هەلگرێکی پلەی ڕامیاریی یان سەربازیەوە. زۆر جاریش کودەتای چەکداریی توندو تیژی لەخۆدەگرێت لەگەڵ ئەوەشدا کەڕەنگە سنوردار بێت. لەوانەشە کەپیلانێك لەپێشەوە هەبێت بۆدەستخستنی پایە ڕامیارییەکان یاسەربازیەکان بۆ هاو سۆزەکانی وەك وەزارەتە گرنگەکان یان سەرکردایەتی سەربازی ستراتیژیی یان کۆنترۆلکردنی دەزگاکانی پەیوەندیە گرنگەکان.

کودەتای چەکداریی وەکو شۆرش وایە مادەم مەبەستەکەی بریتییە لەگۆڕینی سستمی حوکم بە شێوەیەکی کت و پڕو نایاسایی بە شێوەیەکی ڕێژەیی. بەلاّم جیاوازە لە شۆڕش چونکە داوای پشتگیری جەماوەر ناکات بۆ جێبەجێکردنی گۆڕینی سستمی حوکم (سەرەڕای ئەوەی کە جێ بەجێکەرانی کودەتا هەوڵی شەرعیەت پێدانی ئەم جۆرە گۆڕانکاریی دەدەن لەڕێگەی لەڕێگەی ڕاپرسی یان خۆپیشاندانی جەماوەریەوە، ئەم لە کاتێکدا نمونەی ئەم جۆرە وەرچەرخانەی کە پێشنبینی ئەوە

دەکرێت کە لە ئەنجامی شۆڕشەوە ڕوودەدات. زاراوەی (Putsch) کودەتا ئاماژە بۆ جۆرێك لە کودەتای چەکداری دەکات. لە نموونەی کودەتای چەکداریدامەزراندنی ئیمپراتۆریەت لە لایەن ناپلیۆن بۆناپۆرت و لویس ناپلیۆنەوە لە فەرەنسا و لابردنی کرومیل لە دەسەلات لە ئینگلترا و کودەتای سەربازی لە نایجیریا لە سالی 1966–1967، و کودەتای سەربازی لە چیللی 1973.

See also : palace revolution ;plebiscite ;
Putsch ; regime ; revolution .

## Critical Election (الانتخابات الحاسمة) هەڵبژاردنە یەکلاکەرەوەکان

ئەو هەڵبژاردنانەیە کە تێیدا وەرچەرخانێك لە هاوپەیمانیەتیدا ڕوودەدات کەنیشانەدارە لەسەر شێوازێکی پوختەکراو و بە شێوەیەکی ریشەیی لە پەیوەندیەکانی ناو سستمی حیزبدا. شتێکی قورسیشە کەهەڵبژاردنە یەکلاکەرەوەکان دیاری بکرێت لە کاتێکدا کەئەنجام دەدرێن و ئەم سیفەتە لەکاتێکی دواتر دەدرێت کەتیایدا لە کاتێکدا دەکرێت تێبینی شێوازێکی ماوە درێژتر بکرێت لە پەیوەندیە حیزبیە گۆڕاوەکاندا.

See also : Dealignment ; realignment .
Cross – cutting cleavage See : cleavage .

## Cross-Sectional Analysis (التحليل القطعي النموذجي) شیکاری بڕگەیی نموونەیی

شیکاریی بە بەکارهێنانی بەراوردەکان لە هەمان خاڵی زەمەنیدا بۆ چەند بوارێك

یان ئەو حاڵەتانەی کە نوێنەرایەتیی چەند قۆناغێکی جیاواز دەکەن لە گەشەکردن یان گروپە لقیە جیاوازەکان لە فاکتەری بابەتی توێژینەوەکە ئاگایی رامیاریی لای منداڵێك و هەرزەیەك کەسێکی پێگەیشتوو لە تەمەنی کارداو خانەنشینێك خانەنشین و یان بەباشزانیەنەکانی پێشنیاز بۆ جووتیارەکان لە هەریەکە لە دەوڵەتانی ئەندام لە یەکێتی ئەورووپیدا.

See also : cohort analysis ; longitudinal

## Cube Law یاسای شەش پاڵو (قانون المكعب)

یاسایەکە پەیوەندیەکی بیرکاری دەخاتە روو لە نێوان پشکی کورسیەکان لە ئەنجوومەنی یاسادانانَدا کە حیزبێك بە دەستی دەهێنێت و هەروەها رێژەی دەنگەکان کە پێی دەدرێت بە مەرج:

أ دەبێت سستمی زۆرینەی سادە بەکار هاتبێت.

ب تەنها دوو حیزب ململانێ بکەن.

لەحاڵەتی ململانێی دووحیزبدا کە (أ) و (ب) ن لە هەڵبژاردنەکاندا یاسا پێشبینی دەکات ئەگەر ئەو دەنگەکانی دابەشکرد بەرێژەی س: ص ئەوا ئەو کورسیانەی کەبەدەستی دەهێنن بە رێژەی س 3 : ص 3. ئەو توێژینەوانەیش کە تازە لە بەریتانیاو وولاّتەکانی تردا ئەنجام دراون ئامارە دەکەن بەوەی کەسستمی زۆرینە بەکار دەهێنن کە یاسا لە باشترین بارودۆخدا تەنها ئامارەیە بەکاریگەریەکی نزیکەیی و دەرئەنجامە هەڵبژاردنیەکان کاریگەر دەبن بە چەند فاکتەرێکی ئاڵۆز کە زۆر جار دەبێتە هۆی دەرئەنجامی جیاوازییەکی جەوهەری لەو دەرئەنجامانەی کە یاسای شەش پاڵو پێشبینیان دەکات.

See also : psephdogy.

## یاسای دەنگدانی کەڵەکە بوو (التصویت التراکمی) Camulative Law

سستەمێکی دەنگدانە کە تێیدا دەنگدەران زیاتر لە یەکدەنگیان دەدرێتێ بۆ هەر هەڵبژێراوێك و دەکرێت ئەو دەنگانەیش تایبەت بکەین بە پێدانی یەك دەنگ بەچەند هەڵبژێراوێك هەر یەکەی دەنگێك یان پێدانی هەر هەڵبژێراوێك دەنگێك یا زیاتر یا دوو دەنگ یا زیاتر. بۆ نموونە. ئەگەر هەر هەڵبژێراوێك سێ دەنگی هەبوو ئەوا لەوانەیە یەك دەنگ بداتە هەر هەڵبژێراوێك بۆ پاڵێوراو یان هەر سێ دەنگەکە دەدرێت بە یەك پاڵێوراو یان یەك پاڵێوراو دوو دەنگی دەست دەکەوێ و پاڵێوراوەکەی تریش یەك دەنگ. ئەم سستەمەش (بۆ نموونە) لە هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنەکانی یاساداناندا لەسویسراولوکسمبۆرگ و ئەنجومەنی یاسادانانی ولایەتی ئەلینویز و هەندێك لەئەنجومەنەکانی شارەکانی ئەڵمانیا وەکو شاری میونیخ بەکار هاتووە.

See also : Electoral system ;second ballot system

## custom (التقلید ـــ العرف) داب

بریتیە لەو ئەو پێوەرانەی کە لەو کارانەدا هەن کەبەشێوەیەکی تەقلیدی ئەنجام دەدرێن و یان ئەو کارانەی کە چەند رەگەزێك بەرجەستە دەکەن لە کلتورو دابەکانی دەزگایەکدا.

ئەم پێناسەیە وا دەکات کە زاراوەی (Custom) بەزەحمەت جیابکرێتەوە لە زاراوەی (Habit) (نەریت) (conventio) . پێویستیشە کە جیاوازیەکی گران نەخرێتە نێوان ئەم زاراوانەوە. بەکارهێنانەکان جیاوازدەبن و مانای وردی ئەو زاراوەیەش کە نوسەرێکی دیاریکراو مەبەستیەتی روون دەبێت لەرەوتە بەکار هاتووەکەدا.

بەلأم لەناو شیکاریی ڕامیارییدا هەندێك جیاوازی فراوان هەن کەبەکاردێن و زۆرجار جیادەکرێنەوە : ڕەفتاری ئاشنا (Habitual be haviour) دەبڕی بیرکردنەوە نیە زۆرجاریش بەبێ ئاگایی ئەنجام دەدرێ لەکاتێکدا شوێن دابەکان دەکەوێ (Convention) چونکە بەبەشداریکردنێك دادەنرێت لە کاری چالاکی دامەزراوەیەکدا. هەروەها چۆن دەکرێت کەهۆکارەکان چەند بدرێتە ڕەفتارێکی تەقلیدی بەلأم ئەوەندە هەیە پەیوەستە بە مەودایەتییەوە یان بە بەهای ئاهەنگێکەوە زیاتر لەوەی بە توانستێکی وەزیفی کارێکی دیاریکراوە . بەو شێوەیە ئەوا ئەو تەرزە بنەڕەتیە جیاوازانە بۆ قسەکردن کە هەر ئەندامێك لە پەرلەماندا بەکاری دەهێنێت بەشێوەیەکی گشتی مەئلوف دەبێت و شێوە خوازراوەکانیش لە ووشەکان بۆ بۆنە ئاهەنگیەکان لە پەرلەماندا تەقلیدین (Habitual) بەلأم قسەکردن لە چوار چێوەی ڕێکارە ئەوا نەریتی دەبن (Conventional) .

زاراوەی یاسای نەریتی (Customary Law) بەمانای ئەو زاراوە تەقلیدیە نەنوسراوانە دێت کەبۆ سەپاندنی مافەکان و ئەرکەکان و یەکلاکردنەوەی ناکۆکیەکان بە بێ بەکارهێنانی یاسای پۆلێنکراو یان پرۆسەکی یاسادانانێکی دیاریکراو. لە تیۆری یاسایشدا ڕۆڵی نەریت (Custom) (لەمانای بەرفراوانی پیادەکردنی کۆمەلأیەتی گشتیدا) خاڵێکی جیاوازیی گرنگ دەبێت: بۆ نموونە، لە نێوان ئەوانەدا کە پێیان وایە یاسا شتێك نیە بێجگە لە نەریتێك و دانەرانی یاسایش یاسا (دانانێن) بەڵکو لە نەریتە چەسپیوەکانی کۆمەڵگادا (دەیدۆزنەوە) وە لە نێوانی ئەوانەدا کە یاسا بەکارێکی سەربەخۆو جیا دادەنێت کە سەربەخۆیە لە نەریت

See also : Convention (b) :
procedural convention ;Law (b) ;stipulative law ;
Legislature ; norm ; positivism ; protocol (a) : ceremonial.

# D

## Dealignment چوونە دەرەوە (الخروج)

پرۆسەیەکە تێیدا بەشێك لە دەنگدەران دەنگ نادەنە حیزبێك بەپێی پشتگیری کردنی بۆ دابەش بوونێکی کۆمەڵایەتی جەوهەری (چینێکی کۆمەڵایەتی یان تایفەیەکی ئایینی یان کۆمەڵەیەکی رەگەزی یان زمانی) بەڵکو ئەندامانی بەشەکە لەبەر چەند هۆکارێکی زیاتر کرداریی دەدەن، بەمەش بەشێوەیەکی ریشەیی کار دەکەنە سەر هێزی رێژەیی حیزبەکان لە هەڵبژاردنەکاندا.

See also : Electoral volatitlity;
party identification ; reali

## Decision بڕیار (القرار)

هەڵبژاردنێکە کە تاکێکە یان رێکخراوێك یان دامەزراوەیەك ئەنجامی دەدات و بەمەش سنورێك دادەنێت بۆ راوێژکردن بە هەڵبژاردنی ئامانجێك یان ئامرازێکی جێبەجێکردنی ئامانجێك لە کۆی کۆمەڵێك ئەڵتەرناتیڤی بینراودا.
کۆتە جیاوازەکانیش دەوری ئەلتەرناتیڤە بینراوەکان دەگرن لەژینگەو لەناو پەیکەری وەرگرتنی خودی بڕیارەکانەوە،لەوانەشە کەئەو رێساو رێکارەکانیش کەتەحەکوم بە پرۆسەی وەرگرتنی بڕیارەکانەوە دەکەن بەهەمان شێوە کۆمەڵە فاکتەرێکی گرنگ دەبن لە هەڵبژاردنی هەر بڕیارێکدا.
لەژیانی سیاسیشدا بڕیارەکان لە زۆر شێوەدا وەردەگیرێن وەلە چەندین ئاستی

جیاوازدا: رامیاریەکان و دەنگەکان (بۆ پاڵێوراوەکان بۆ وەرگرتنی پلەکان و بۆ پێشنیارە جەوهەری و لێپێچینەوەیەکان) و جێبەجێکردنی بڕیارە جێبەجێکردنیەکان و بڕیارە ڕێکخستنیەکان.

See also : Decision –making analysis ; incrementalism ; non-decision; policy

## Decision – شیکاریکردنی وەرگرتنی بڕیارەکان (*تحلیل اتخاذ القرارات*) making Analysis

بریتییە لەشیکاریکردنی سستم و پرۆسە رامیارییەکان و رەفتاری رامیاریی لەگەڵ جەختکردنەوە لە بڕیارە رامیارییە وەرگیراوەکاندا و پەیکەرەکانی ناو وەرگرتنی بڕیارەکان و ئەو فاکتەرانەی کەوا کار لەدەرئەنجامەکانی پرۆسەکە دەکەن و تێچوونە رامیارییەکان بۆ بڕیارەکان و هەڵبژاردنی رەگەزەکان بۆ قۆناغەکانی وەرگرتنی بڕیارەکان. سەرەڕای ئەوەیش کە ئەم زاراوەیە وەکو هاو واتایەك لەگەڵ زاراوەی شیکاریی رامیارییدا بەکار دەهێنرێت (Policy- analysis) ئەوا بە بایەخ پێدانەکانی بەو بڕیارانەی کە لەخۆیاندا رامیاریی نین جیا دەکرێتەوە (بۆ نموونە، بڕیارەکانی دەنگدان) وەبەجەختکردنەوەی لە قۆناغی بڕیارەکاندا لەدانانی رامیارییەکاندا لە کاتێکدا کە شیکاریکردنی رامیاریەکان بایەخیش دەدات بەو پرۆسانەی کە پێشی بڕیارەکان دەکەون و بەدوایدا دێن (جێبەجێکردن، بۆنموونە) .

وەسفکردنی دەرئەنجامی پرۆسەیەك رامیارییەکی ئاڵۆزە بەوپێیەی کەبڕیارێکە لەوانەیە ئەوە بگەیەنێت کە پرۆسەکە لەپرۆسەی مێمنی و هەڵبژاردنی تاکی دەچێت. وە هەندێك نموونەی وەرگرتنی بڕیارەکان بە تایبەتی نموونەی (فاکتەری ئەقڵانی) بەشێوەیەکی ڕوون تەبەنی ئەم هەڵوێستە دەکات هەندێکی تریش خۆیانی لێ لادەدەن و لەبری ئەمە جەخت لەسەر لایەنێك لەو پرۆسە ناوخۆییانە

دەکەنەوە کەبەشداری لە ئەنجامەکەدا دەکات. بۆ نموونە، شێوازە ڕۆتینیەکان و ڕێکارییەکان لە نمونەی (پرۆسەی ڕێکخستنیدا) یان ئەو ستراتیژانەی کە تەبەنی کراون لەلایەن ڕەگەزە ململانێکەرەکانەوە لە ڕژێمدا، لەنموونەی (سازشی ڕامیارییدا) . لەم نموونە بنەرەتیانەداو لەدەرەوەیدا ڕێبازی جۆراو جۆر لە شیکاریدا بەکارهاتووە: شێوازە شێوەییەکان بۆ تیۆری یارییەکان و هەڵبژاردنی ئەقڵانی، دیاریکردنی گۆڕاوەکان یان قۆناغەکان لە پرۆسەی وەرگرتنی بڕیارەکاندا، و لێکۆڵینەوەی حاڵەتەکان بۆ بڕیارەکان و وەرگرانی بڕیارەکان کە هەندێکیان پشتی بەستوە بەپرۆسەکانی لاسایکرنەوەی تاقیگەیی. لێکۆڵینەوەی باکگراوەندە کۆمەڵایەتی و ئابورییەکان و بەهاکان وهیواکانی ژیاننامەی بڕیاردەرەکان و ئەو لێکۆڵینەوانەی کەپشت دەبەستن بە نموونەکانی پەیوەندیکردن و لێشاوی زانیارییەکان لە ناو سستمەکەدا، لێکۆڵینەوەی پەیوەندیەکان لە نێوان پەیکەرە دەزگاییەکان و شێوازەکانی وەرگرتنی بڕیارەکان وە کۆمەڵێکی بەرفراوان لە لێکۆڵینەوەکان لەجۆرە جیاوازەکانی بڕیارەکانی دەنگدان. چەند نمونەیەکیش هەیە لە هەر یەکێك لەم جۆرانە لە شیکاریکردنی وەرگرتنی بڕیارە ناوچەیی و نیشتیمانی و نێو دەوڵەتیەکان. ئەم مەودایەش ڕێبازەکان نوێنەرایەتی ناوەندێتی وەرگرتنی بڕیارەکان دەکات لە زانستی ڕامیارییدا و ئامادەبوونی شیکەرەوەکان بۆ سوود وەرگرتن لە بەشداریکردنەکان لە لقەکانی ترەوە.

See also : Bargaining theory ; community studies ; decision ; decision;incrementilism ; non –decisin;policy ;policy analysis ; psephology ; rational choice analysi ; simulation.

## Decision Theory (*نظرية القرارات*) تیۆری بڕیارەکان

بوارێکە بۆ گەڕانی نیزامی گرنگی دەدات بە پەرەپێدانی بنەماکانی هەڵبژاردنی

ئەقلانی حاڵەتەکان کە دەکرێت تێچوونەکان و سودەکان و ئەگەرە و چەندێتییە بەراوردکراوە ئاڵوگۆڕکراوەکان بدرێتە پاڵ دەرئەنجامە مومکینە جیاوازەکان.

## یاسادانانی سەرپشکراو (*التشریع المخول به*) Delegated Legislation

یاسادانانێك یان ڕێساوفەرمانێکە کە هێزی یاسا دانانی هەیە و لێپرسراوێك دایدەنێت (وەکو وەزیر) یان دامەزراوەیەك بەپێی ئەو دەسەڵاتانەی کە سەرپشکراوە تێیاندا لەلایەن دامەزراوەیەکی بالاترەوە (بۆ نموونە ئەنجومەنی یاسادانان) . یاسادانانی لەم شێوەیە کە بەپێی ڕێپێدانێکی سەرپشکراو دەرکراوە هەمیشە دەکەوێتە ژێر تاوتوێکردنی ئەو دامەزراوەوە کە سەرپشکی کردنەکەی بەخشیوەوە و دەکرێت هەڵوەشێنرێتەوە لەلایەن دامەزراوەکەوە. لە پەرلەمانی بەریتانیدا، هەلی تاوتوێکردن و هەڵوەشاندنەوە لەڕێگەی مەرجدانانەوە دەبێت بەوەی کە بڕیارێکی ئیجابی دەکرێت ڕابگەیەنرێت پێش ئەوەی کاریگەری یاسا سەرپشکراوەکە دەست پێبکات یان بەو مەرجەی یاسا سەرپشکراوەکە کارپێکردنی پاش ماوەیەکی دیاریکراودەست پێدەکات ئەگەر لەو ماوەیەدا بڕیارێکی سلبیدەرنەکرا کە یاسا سەرپشکراوەکە هەڵوەشێنێتەوە.

مەبەستەکانی یاسای سەرپشکراو بەتایبەتی بریتیە لە فەراهەمکردنی کاتی ئەندامانی لیژنەی یاسادانان و هەوڵەکانیان و ڕێچکەدان بەڕێسا تایبەتمەندەکان تا جێبەجێ بکرێن بەتایبەتی لەمەسەلە هونەریەکاندا (پێوەرەکانی سەلامەتی بۆ نموونە) دابین کردنینەرمی بۆ نموونە، لە حاڵەتە نائاساییەکاندا وەك جەنگ.

**See also : Devolution .**

## Democracy ديموكراسيەت (*الديمقراطية*)

شێوەیەکە لە حوکمڕانی کەتیایدا گەل (Demos) لە گریکیدا) دەسەلاتی ڕامیاریی بە کردەوە پیادە دەکات بەو پێیەی ئەو دەسەلاتەیە کە ڕامیارییەکان دادەنێت (دیموکراسیەتە ڕاستەوخۆکان) یان لەڕێگەی هەڵبژاردنیەوە بۆ ئەوانەی کە ڕامیارییەکان دادەنێن لە بری ئەو (دیموکراسیەتی نوێنەرایەتی) .

نموونە نمونەییەکانی دیموکراسیەتە ڕاستەوخۆکانیش دیموکراسیەتی ئەثینی لە سەدەی چوارەمی پێش زایین و نموونەی (کۆبونەوەی شار) لە نیو ئینگلاند لە هەر دوو سەدەی هەڤدەو هەژدەدا . لەم دوو حاڵەتەشدا هاوولاتیان بە شێوەیەکی خولی کۆدەبوونەوە بۆ گفتوگۆکردن لەسەر کێشەکان و وەرگرتنی ڕاپۆرتەکان لەفەرمانبەرە جێبەجێکەرەکانەوە و وەرگرتنی بڕیارەکان، گەشەکردنیش لە قەبارەی دانیشتوانی شارەکان و دەوڵەتەکان و ئەو پانتاییانەی تێیدا دەژین و ئاڵۆز بوونی ئەوکێشانەی کە توێژینەوە ودووبارەکردنەوە دەخوازن سەرباری نەتوانایی دانیشتوان یان ئارەزوو نەبوونیان لە تەرخانکردنی کاتی زیاتر بۆ بەشداریکردنی ڕامیاریی بوویە هۆی دانانی کۆت لەبەردەم بەرفراوان بوونی دیموکراسیەتی ڕاستەوخۆدا.

هاوبەشیکردنی دیموکراتی ئێستا بە تایبەتی لە ڕێگەی هەڵبژاردنی نوێنەرەکانەوە هەندێك جاریش بە ڕاپرسی پاڵپشت دەکرێت. کۆمەڵێکیش ئەوەیان ڕوون کردووەتەوە کە دەست خستنی بەرفراوانی تەکنیکی زانیاریی نوێ لەوانەیە دەستەبەری ئامرازەکانی دەربڕینی ڕێك و پێکی ویستی میللی بکات کە پرۆسەیەکە هەندێك جار پیی دەوترێت (دیموکراسیەتیدوور) .

بە شێوەیکی گشتی دیموکراسیەت بەگەڕانەوە بۆ بنەما کردەیی و بنەڕەتییەکان پێناسە دەکرێت کەوا دیارە بۆ پیادەکردنی پێویستە .هەروەها پێویستە لەسەر ئەوانەشی کە پلەو پایە ڕامیارییەکان وەردەگرن کار بکەن لە پێناوی بەرژەوەندییەکانی گەلدا. دەبێت حکومەتیش لەڕێی حوکمی یاساوە حوکم بکات

ئەوانەی کە پلەوپایە رامیارییەکان وەردەگرن دەبێت بەر پرسیابن لە بەردەم گەلدا.
دەبێت حکومەتیش لە ڕێی حوکمی یاساوە حوکم بکات ئەوانەی کە پلەو پایە
رامیارییەکان وەردەگرن دەبێت بەر پرسیارین لەبەردەم گەلدا کە لەتوانایدا هەیە
دوریان بخاتەوە، ڕاستەوخۆ یا لە ڕێگەی نوێنەرەکانیەوە و دەبێت کە دەرفەتی
بەشداری کردن یەکسان بێت: پێویستە کە هەموو هاولاتیەکان بتوانن کە دەنگدان
پیادە بکەن و دەنگی هەر یەکەیشیان بەیەکسانی بژمێرێت. دەبێت کە ناکۆکییەکان
لە رامیاریدا بە پێی بنەمای بڕیاری زۆرینە یەکلایی بکرێتەوە ڕەنگە لەگەڵ مەرجێکی
زیادەشدا کە ئەویش بوونی زۆرینەیەکی تایبەتە. بۆ نموونە بۆ گۆرانکاریە
دەستورییەکان (لەگەڵ بوونی نموونەی دیموکراسی وا کە بە نموونەی (یەکخەر) یا
نموونەکانی (ڕێکەوتن لە رادا) کە بەردەوامیگفتوگۆکان دەخوازێت هەتا دەبێتە
بڕیارێك کە قەبوڵکراو بێت بۆ هەمووان نەك کۆتایی هێنانی گفتوگۆیەك دژ
بوەستێتەوە لەگەڵ ئیرادە) .

پێویستیشە کە بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵەکانی کەمینە هەندێك پاراستنی پێ
ببەخشرێت بۆ پارێزگاریکردنی کۆمەڵێك لە ئازادییە مەدەنییە سەرەکییەکان بۆ
نموونە ئازادی قسەکردن و کۆبونەوە. دەبێت تاکەمترین رادە شوێنەواری کاریگەریی
نا ڕاست لە دەنگدەر کەم بکرێتەوە: مەبەست لەمەش بریتیە لە دەنگدانی نهێنیو
کۆتەکانی سەر خەرجی هەڵبژاردن و ئەو یاسایانەی کە پەیوەندییەکانی ئامرازەکانی
ڕاگەیاندنی جەماوەر ڕێك دەخات لە کاتی ماوەی هەڵبژاردندا.

ئەم پێوەرانە بە شێوەیەکی جیاواز لە پەیژەی گرنگیدا ڕێك دەخرێن لای
شیکەرەوە جیاوازەکان سەرباری ئەمەش ئاشکرایە کە هەر سستمێکی رامیاریی
هەموو پێوەرێك قایل ناکات.

ڕێکخراوە جیاوازەکان کە پلەی جیاوازی هێزیان هەیە، دەستی تێوەر نەدەن بۆ
نموونە لە نێوان هاولاتیو برەیاری حکومیدا. بۆیە جێبەجێکردی زاراوەی
(دیموکراسی) بەسەر هەر دەوڵەتێکدا تووشی چەند و چون دەبێ.

چەمکە ئازادەکانی دیموکراسیەتیش پێ لەسەر بەهای ماف و ئازادییە تاکییەکان دادەگرن، لە چوار چێوەی سیستمی نواندن داو لەڕێگەی پێشبڕکێی هەڵبژاردنی نێوان حیزبەکانەوە . تیۆرسێنە ڕۆژ ئاواییەکانیش بە گشتی پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە ئەو پێوەرانەی کە پەیوەستن بە دەرفەتێکیکردارییەوە بۆ کارکردنە سەر کردەکانی وەرگرتنی بڕیارەکانەوە لەوانەیە هەندێکی تر وەك هەندێك لە سۆسیالیست و مارکسیستەکان ئەم پێوەرە کردەییانە کەم بایەخ لە قەڵەم بدەن مادام پەیوەندییە چینایەتیە چەوساندنەوەییەکان و نا یەکسانی لە هێزی ڕامیاریی کرداریدا هەر ماون: بەرژەوەندییەکانی گەل (کە حیزبی دەسەلآتدار لێکی ئەداتەوەوبەو پێیە ڕەفتار دەکات) ئەوەك هەڵبژاردنە کردارییە بایەخدارەکانی ئەم جیاوازییە چەمکیانە خۆی لە پشت دوو زاراوەی جیاوازدا حەشار دەدات (دیموکراسیەتی ئازاد) و (دیموکراسیەتی گەل) زاراوەی یەکەم بۆ وەسفی سیستمە ڕامیارییەکان بەکاردێت وە سیستمە باوەکانی دەوڵەتە ئەورووپییە ڕۆژئاواییەکان و ئەمریکا، زاراوەی دووەمیشی (لەلایەن هاوسۆزەکانەوە) بۆ ناردنی جۆری ئەو سیستمە بەکار دێت کە تا کاتێکی نزیك لە دەوڵەتە سۆسیالیستیەکانی ئەورووپای ڕۆژهەلآتدا پیادە دەکرا.

توێژینەوە ئەزموونییەکان سەبارەت بە دیموکراسی ئەمانە لەخۆ دەگرێت: لێکۆڵینەوەکانی ڕەفتاری پێشنیازو ڕکابەریی نێوان حیزبەکان، تاقی کردنەوەکانی کاریگەریی چالاکیی کۆمەڵەکانی فشار، لێکۆڵینەوە بەراوردکارییەکان بۆ ئەو هۆکارانەی کە لەوانەیە بەرەوسستمێکی دیموکراسی جێگیرمان و بەرێت و بەردەوامیی پێبدات، کاری تیۆریش ئەمانە دەگرێتەوە: بنیات نانی بەها پەیوەندیدارەکان بە دیموکراسیەتەوە، نمونەکانی هەڵبژاردنی ئەقلآنی ڕەفتاری هەڵبژاردنی و وەرگرتنی بڕیارەکان بە شێوەیەکی دیموکراسیانە.

**See also :Aristocracy ;autocracy ;direct**
**Democracy ; dictatorship ;joriity ; oligarchy ; psrticipation ; poly-**
**Archy ;populism ;representation ;rule oflaw ;totalitarianism.**

Democratic socialism See: Social democracy.

## Demorgraphy (الديمغرافيا) ديمۆگرافیا

بریتیە لە لێکۆڵینەوەی لایەنە ئامارییەکانی دانیشتوان بەتایبەتی شیکردنەوەی ژمارەکانی دانیشتوان و دابەش بوونیان لە ناوچەیەکی دیاریکراودا: پێکهاتەی تەمەنی و ڕەگەزیی دانیشتوان. ڕواڵەتەکانیان کە سەبارەت بە هاوسەر بوون و پیشەو ڕواڵەتە کۆمەڵایەتیە پەیوەندارەکانی تر، قەبارەیە خێزانییەکان و ڕێژەکانی لە دایك بوون و مردن و کۆچکردن و ئەو گۆڕانکارییانەی کەبەسەر هەموویاندا دێت بە تێپەڕبوونی کات. دیموکرافییەکان شوێن ئەم جۆرە لێکۆڵینەوە و هۆکارە ئابوری و کۆمەڵایەتی و ڕامیاریانە کەوتوون هەروەها شوێنەواری ئەو گۆڕانکارییانە لە تایبەتمەندییەکانی دانیشتواندا و کۆمەڵێك شێوازی ماتماتیکی تایبەتیان پەرە پێداوە بۆ شیکردنەوەی زانیارییەکانیان.

## Depepndency Theory (نظرية الاعتمادية) تیۆری پشت پێبەستن

زاراوەیەکی گشتییە بە ژمارەیەك تیۆر دەوترێت کەلێکدانەوەی لێك چوو بۆگرفتە ئابوری و ڕامیاریی و کۆمەڵایەتییە بەردەوامەکانی جیهانی سێ پێشکەش دەکات بە تایبەتی لە ئەمەریکای لاتینیدا، دەوترێت کە ئەم تیۆرە لە ئارادایە کاتێك کە سستمی ئابوری وولاتێك پارچە دەبێت و ڕەگەزە سەرەکییەکانی بایەخداتر دەبن. لە بەر ئەوە زیاتر لە لایەن هۆکارە دەرەکییەکانەوە کاری تێدەکرێت وەك بڕیارەکانی کۆمپانیا فرە ڕەگەزەکان و پێویستیەکانی وولاتە سەرمایەدارییە پێشکەوتووەکان و گۆڕانکارییەکان سستمی سەرمایەداریی نێو دەوڵەتی، لەبەر ئەوە سستمە ئابورییە

پاشكۆكان توانای پەرەسەندنی سەربەخۆیان نیە و وەلآمی بەرنامە حكومییەكان بۆ نوێ كردنەوەی بەرفراوان و گشتی ناداتەوە. بەلآم دروست كردن تەنها لە چەند كەرتێكی تایبەت و دیاریكراودا ڕوو دەدات وهاوڕاییەكی بەرفراوان نیە لە سودەكانی گەشەی ئابووریدا. دابەشبوونەكان لە كۆمەلگادا قوڵ دەبنەوەو تواناكانی حوكمی دیموكراسیەتی سەربەخۆ كەم دەبنەوە.

## حەتمیەت (الحتمية) Determinism

بریتییە لەو باوەڕە گشتییە بەوەی كە دەتوانرێت هەموو ڕووداوەكان لە ژێر كۆمەڵێك یاسادا پۆلێن بكرێن و ئەوانە لە ژێر ڕكێفی هێزە وەسفكراوەكاندان. لەشیكردنەوەی رامیاریشدا زاراوەكە بە شێوەیەكی بەرتەسكتر بەكاردێت بەمانای باوەڕ بوون بەوەی كە ڕووداوەكان دەكرێت لێك بدرێنەوە بەشێوەیەكی باش بە گەڕانەوە بۆ یاساو هۆیەكان لە بوارێكی دیاریكراودا ئەگەر هۆكارەكانی تر پەیوەندیدار بوون بە كۆمەڵە دیاریكەرە سەرەكی یا دووەمییەكە، بەم شێوەیە هەندێك جۆری ماركسیزم (و هەندێك خوێندنەوەی بیرەكانی ماركس) وای دا دەنێن كە بریتییە (لە حەتمیەتی ئابوری) یا (حەتمیەتی تەكنیكی)، واتە ئەو لێكدانەوەیەی كە بۆ هەموو دیاردە ڕامیاریی و كۆمەلآیەتیەكان پێشكەش دەكرێت و كورت دەكرێتەوە بۆ كاریگەریی هێزە ئابورییەكان یا پەرەسەندنە تەكنیكیەكان. چەند جۆرێكی تری حەتمیەتیش لەسەر بناغەی جیاوا زی یا ئاینی یا كەش یا پەیكەری خێزانی دانراوە.

گرفتی سەرەكی لای ئەوەی كەبڕوای بە حەتمیەت هەیە خۆی لە سەلماندنی جیاوازییەكی ئاشكرادا حەشاردراوە لە نێوان هۆكارە دیاریكراوەكاندا. بۆ نموونە ماركس پێی وابووە كە (پەیوەندییەكانی بەرهەم هێنان) پەیكەرە یاسایی و ڕامیارییەكان دیاری دەكات بەلآم پەیوەندییەكانی خاوەندارێتی سەر بەجۆری دیاریكەرو دیاریكراوە.

See also : Explanation ; law (a) :
Scien – tific law ; marxism; reductionist theories

## Devolution (التفويض) دەسەلات پێدان

بریتییە لەپێدانی چەند دەسەڵاتێکی دیاریکراو بەیەکەیەکی حوکمکردنی (لقی) دەست گرتنی حکومەت و ئەنجومەنی یاسادانان لە باکوری ئێرلەندا بەسەرچەند فەرمانێکی دیاریکراوی حکومەتدا پێش ئەوەی کە حکومەتی بەریتانی حوکمی ڕاستەوخۆ بسەپێنێت لەساڵی 1972 دا، بەم شێوەیە دەسەلات پێدان بریتییە لە زاراوەیەکی تەسکترو سنوردار تر لە حوکمی لامەرکەزی لە ڕاستیشدا حکومەتی مەرکەزی مافی دەستوری و یاسایلە کێشانەوەی دەسەڵاتە پێدراوەکان بۆ خۆی دەهێڵێتەوە یا جۆراوجۆر کردنی دەسەلات پێدان لە دابەشکردنی هەرێمی دەسەڵاتەکان جیادەکاتەوە لە چوار چێوەی یەکێتییەکدا.

See also : federation.

## d,Honndt Method (طريقة دونت) ڕێگەی دۆنت

ڕێگەی دۆنت ئامرازێکە بۆ حیسابکردنی کورسییەکان لە ئەنجومەنی یاسادانان یا پایە هەڵبژاردنییەکانی تردا لە نێوان پاڵێوراوەکانی لیستەکانی حیزبدا (یا ئەو لیستانەی کە پشت بە پێوەری تر دەبەستن) لە سستمی نواندنی ڕێژەیی هەڵبژاردندا . ناوی داهێنەرەکەی ڤیکتۆر دۆنتی لێنراوە .ئەم ڕێگەیە لە کۆماری ئەڵمانیای فیدراڵ دا لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی فیدراڵدا لەساڵانی 1949-1983 دا جێبە جێکراوە بەڵام لەو کاتەوە ڕێگەی هارا ـــ نیمایر بەکاردێت بۆ تایبەت کردنی کورسییەکانی لیستەکان.

سەرجەم ژمارەی دەنگە ڕاستەکانی هەر لیستێکی حیزبی بە شێوەیەکی دواییەك دابەش دەکرێن بەسەر 4/3/2/1 .... دەرەچەی دابەشکردنی هەموو حیزبەکانیش یەك لە دوایەك ڕێك دەخرێن و کورسیەکان تایبەت دەکرێن بە حیزبەکان و بە پێی ڕێکخستنی ئەو دەرەچانە، وەك نمونەیەك ئەوە وا دانراوە کە دە کورسی لە نێوان لیستی پێنج حیزبدا دابەشکراوە و سەدو بیست هەزار دەنگی ڕاست دراوە:

حیزبی (ا) *48000*

حیزبی (ب) :.30000*

حیزب (ج) :24000*

حیزب (د) :12000*

حیزب (ه) :6000*

دابەشکردنی ئەو ژمارانە بەسەر 2،3،4 (پێویست بەبەردەوام بوون ناکات لەم قەبارەدا) ئەو دەرەچەی دابەشکردنانە دەدات بە دەستەوە پاش ئەوەی خراوەتە سەر ئەو دەرچانەی کە بەو سەرجەمانەی سەرەوە نوێنەرایەتی کراوە:

*24000*15000 *12000* 6000 * 3000 *

16000 * 10000 * 8000 * 4000 * 2000 *

12000 * 7500 * 6000 * 3000 * 1500 *

بۆیە هەر دە کورسییەکە تایبەت دەکرێت بەدەرەچەی دابەشکردنی ئاماژە پێکراو بە ئەستێرە (*) ودەبێتە هۆی ئەوەی کەحیزبی (أ) چوار کورسیی بەرکەوێت و حیزبی (ب) سێ کورسی و حیزبی (ج) دوو کورسی و حیزبی (د) یەك کورسی ئەگەر تەنها پێنج کورسی هەبوون ئەوا حیزبی (أ) سیانی بەردەکەوێ و حیزبی (ب) و حیزبی (ج) هەر یەکەیان یەك کورسی.

لەوانەیە ئەم سیستمی دابەشکردنە ئەنجامی جیاواز بدات بە دەستەوە لە کەناردا کە بۆ حیزبە گەورەکان گونجاوتر دەبێت لە سستمەکانی تایبەت کردنی کورسییەکانی تر.

## Dialectic (الجدلية) دیالیکتیك

زاراوەکە لە بنەچەدا بەمانای هونەری ڕەخنە گرتن دێت، بەلام ئێستا بەو کۆمەڵە هەڵوێستە دەوترێت کە سەبارەت بە سروشتی داینەمیکیەتی هۆش و واقیع و پەیوەندییە ئاڵوگۆڕکراوەکانەوەیە. بیر و پاشانیش مێژوو (هیگڵ) یا مێژوو ئەنجا بیر (مارکس) یا هەموو پرۆسە مادییەکان (ئینگڵز) لە ڕێگەی دروستکردنی دژایەتییەکان و یەکلا کردنەوەیانەوە سەرچاوە دەگرن و پەرە دەسەنن. هەندێك لە مارکسییەکان و ژمارەیەکی بچوکی شیکەرەوە ڕامیارییەکانی تر ئەم زاراوەیە بە شێوەیەکی زۆر گشتی تر بەکار دەهێنن بەوەیکە هەموو دیاردە ڕامیارییەکان دەبێت لە ڕووی پەیوەندیان بە سەرجەمییەکی کۆمەڵایەتی گۆڕاوەوە وێنا بکرێن.

See also:Contraditicion; Marxism

## Dictatorship (الدکتاتورية) دیکتاتۆریەت

شێوەیەکە لە حوکمکردنی ڕامیاریی کە یەك تاك دەیگرێتە دەست و هیچ کۆت و بەندێکی یاسایی یا دەستوری یا عورفی نایبەستێتەوە . بەم شێوەیەش دیکتاتۆریەت جۆرێکە لە حوکمی (ئۆتۆکراسی) ستەمکاری دیکتاتۆرەکان بە شێوەی نادەستوری دەسەلات دەگرنە دەست کە لە زۆریەی کاتدا لە ڕێی توندو تیژییەوە یەو هەر بەهێزیش دەیپارێزن ئەو ڕێسایەش کە دیکتاتۆر پێشکەشی دەکات بۆ گرتنە دەستی دەسەلات و توندو تیژیی پێویستە بۆ بەردەوام بوونی حوکمەکەی بریتییە لەو بوونە گریمانەییەی ناکۆکی یا مەترسی دەرەکی. زۆر جاریش بۆ شەرعیەت دان بەو

دەسەڵاتە پەنا دەبەنە بەر ڕاپرسی یا داڕشتنی دەستوری نوێ، جێگرتنەوەی پێشەوایەتیش هەمیشە گرفتی دیکتاتۆرەکانە چونکە هەر جێنشینێك لەوانەیە مەترسی بێت بۆ سەر دەسەڵاتی دیکتاتۆرو حوکمەکەی و ڕەنگە هەر کردەیەکی نیزامیجێ بەجێ بکرێت بۆ جێگرتنەوەی پێشەوایەتی و گۆڕینی دیکتاتۆر.

جۆرێکە تریش لە دیکتاتۆریەتی دەستوری هەیە کە تیایدا دیکتاتۆر دەسەڵاتی باری نائاسایی دەیگرێتە دەست بە پێی فەرمانە یاسایی و دەستورییەکان لە کاتی قەیراندا و بۆ ماوەیەکی دیاریکراو. نموونەش لەسەر ئەم جۆرەی حوکمی تایبەت بە دیکتاتۆریەت لە دەستوری کۆماری ڕۆمای کۆندا بوو، وە ئەو دەسەڵاتەی کە هەیبوو بە پێی مادەی (48) لە دەستوری فایمار لە ئەڵمانیادا پاش شەڕی جیهانی یەکەم. لە دیکتاتۆرە نارەسمییەکانیش یۆلیۆس قەیسەر و ئۆلیڤەر کرۆمۆیل و ژەنراڵ فرانکۆ.

**See :Absolutism; autocracy ;leadership ; plebiscite; plbiscite; totalitarianism**

## دیموکراسیەتی ڕاستەوخۆ (*الديمقراطية المباشرة*) Direct Democracy

بریتیە لەحوکمکردنی گەل بۆ دەوڵەتێك یا شارێك یا کۆمەڵگایەکی ڕامیاریی یا دەزگایەکی ڕامیاریی لە ڕێگەی بەشداری کردنی ڕاستەوخۆو بێ ناوەندگیریی لە وەرگرتنی بڕیارەکاندا، نەوەك لە ڕێگەی هەڵبژاردنی نوێنەرەکانییەوە. دیموکراسیەتی ڕاستەوخۆ لە ڕابوردودا تەنها لەو کۆمەڵگایانەدا هەبووە کە بەشێوەیەك بچوك بووە کە ڕێگەی داوە بە هاوڵاتییەکانی کە پێکەوە لەیەك شوێندا کۆ ببنەوەو بەم شێوەیەش بەستراوەتەوە بە هەندێك لەدەوڵەتەکانی شارە گریکییەکانەوە لە سەردەمە کۆنەکاندا و کۆبونەوەی گەرەکەکان لە هەندێك ناوچەی نیو ئینگلاندو کانتۆنە بچوکەکانی سویسرا. هەروها کۆبونەوەکانیناوچەکان لە کۆمەڵگا گوندییە بچوکەکانی

بەریتانیادا سەرباری دەزگاکـان وەك یەکێتیـەکانی قوتابیـان لـە زانکۆکـان و لقـەکانی سـەندیکا کرێکارییـەکان لـە کۆمپانیـا بازرگانییەکانـدا. لـە ڕاسـتیدا ئامرازەکـانی پەیوەنـدیکردنی ئـاڵوگۆڕی نـوێ ڕێگـە دەدات لـە کـاتی پێویـستیدا ژمارەیـەکی زۆر هاولاتی ڕاستەوخۆ دەنگ بدەن سەبارەت بە پێشنیازەکان لەماڵەکانیانەوە و لەڕێگەی تەلەفزیۆنەوە. بەلآم ئەم ئامرازانە گرانن و کاتێکی زۆریـان دەوێـت وەك شـێوەیەکی خراپـی بڕیـاردان دەمێننـەوە. هەنـدێك ئـامرازی وەك لابـردن بـە دەنگـدانی میللـی (**Recall**) و ڕاپرسـی بـۆ گـۆڕینی دیموکراسـیەتی نوێنەرایـەتی بـە تێکەڵەیـەك لـە دیموکراسیەتی ڕاستەوخۆ لە هەندێك لە ڕێکخراوی ویلایەتەکان و بەشـەکانیاندا بـەکار هێنراوە.

**See also: Demoocrcy;**
**Initiatve ;recall (a) : the institution;referendum.**
**Dirigism See :Interventionism .Disjointed incermentalism**
**See:incrementalism.**

## پشکی هەڵبژاردنی لەسەر بناغەی سستمی یەك دەنگی کەقابیلی گواستنەوەیە
## *(الحصة الانتخابية على اساس نظام الصوت الواحد القابل للأنتقال)*
## Droop Quota

ڕێگەیەکە بۆ حساب کردنی پـشکی ڕێـژەیی هەڵبـژاردنی بـەپێی سیـستمی هەڵبـژاردن کەپشت دەبەستێ بەیەك دەنگ کە قابیلی گواستنەوەیە . پشکی (**Q**) مـان دەسـت دەکەوێت بەدابەشکردنی ژمارەی گشتی دەنگە ڕاستەکان (V)
بەسەر ژمارەی ئەو کورسیانەی کە پڕدەکرێنەوەs + 1 و خستنە سەری یەك بـۆ سـەر ئەنجامەکە ئەم هاوکێشەیەمان دەست دەکەوێت:

$$\text{پشکەکە} = \frac{\text{کۆیدەنگە ڕاستەکان}}{\text{ژمارەی ئەو کورسیانەی کە دەگیرێن}} + 1$$

$$Q = \frac{V}{s+1} + 1$$

لەئەنجامی ئەم حسابەشەوە ژمارەیەك پەیدا دەبێت كە بچوكترین ژمارەی تەواوی ئەو دەنگانەیە كەهەڵدەبژێرن. بۆ نموونە چوار ئەندام لە بازنەیەكی هەڵبژاردندان كە چوار ئەندامی تێدایە بەڵام پێنج ئەندام هەڵئابژێریت. ئەگەر هەشتا هەزار دەنگ بدرێت لە بازنەیەكی هەڵبژاردندا بۆ هەڵبژاردنی چوار ئەندام ئەوا پشكەكە دەبێتە:

$$16001 = \frac{80000}{1+5}$$

بەپیی حساب تەنها چوار پاڵێوراو (نەك پێنج) دەتوانن ئەم پشكە بەدەست بێنن.

**See also: Electoral guota;**
**Single tranferable vote system.**

## Due process (الحماية القانونية) پاراستنی یاسایی

زاراوەیەكە لەو ڕاست كردنەوە تایبەتیەوە وەرگیراوە كە لە دەستوری ئەمریكیدا ئەنجام دراوە بەڵام دەكرێت كە لە هەموو ئەو دەوڵەتانەدا بەكار بهێنرێتكە ڕێز لە حوكمی یاسا دەگرن ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت كە نابێت هیچ كەسێك سزا بدرێت یا بخرێتە ژێر بارودۆخێكی نالەبارەوە لە ڕێگەی پیادەكردنی دەسەڵاتی دەوڵەتەوە لە دژی ئەو تاكە تەنها بە پابەندبوونی وردی كارە یاسایی و دەستورییەكانی ترەوە نەبێت. ئەمەش بە تایبەتی هەموو ئەو مەرجانە دەگرێتەوە كەپەیوەستن بە بیری (دادگایكردنی دادپەروەرانەوە) لەوانە مافی گوێ گرتن لە بەڵگەكان و بەرپەرچ دانەوەیان و مافی پێشكەش كردنی یارمەتی یاسایی ئامادە لە پێشكەش كردنی بەرگریدا ...هتد.

# E

### تیۆره ئابورییه‌کان له ڕامیارییدا *(النظريات الاقتصادية في السياسة)*
### Economic Theories of Politics

زاراوه‌یه‌کی گشتیی ڕێبازه به‌ڵگه هێنانه‌وه‌ییه‌کانه که نموونه‌ی کاری ڕامیاریی ده‌خه‌نه ڕوو که پشت به گریمانه‌ی هه‌وڵی تاکه‌کان ده‌به‌ستن بۆ به‌دی هێنانی ئامانجه‌کان به شێوه‌یه‌کی ئه‌قڵانی. ئه‌م جۆره تیۆرانه هه‌مان ئه‌و سروشته‌یان هه‌یه که‌تیۆره‌کانی (هه‌ڵبژاردنی ئه‌قڵانی) هه‌ڵیده‌گرن به‌ڵام زۆربه‌ی ئه‌و لێکۆڵینه‌وانه‌ی که وه‌ك (ئابوری) ئاماژه‌یان پێده‌کرێت به شێوه‌یه‌کی ئاشکرا له‌و شێوازه نیزامییانه که‌ڵك وه‌رده‌گرێت که ئابوری ناسه‌کان په‌ره‌یان پێداوه.

**See also:game theory ;political economy ; rational choice analysis.**

### Egalitarianism — یه‌کسانخوازی *(المساواتية)*

باوه‌ڕبوونه، به سانایی به‌وه‌ی که تاکه‌کان یه‌کسانن یا ده‌بێت وه‌ك یه‌کسان ڕه‌فتاریان له‌گه‌ڵ بکرێت. باوترین لایه‌نی ئه‌م باوه‌ڕه سه‌باره‌ت به یه‌کسانییه له‌مافه ڕامیارییه‌کاندا وه‌ك مافه‌کانی به‌شداری له چالاکی ڕامیارییو یه‌کسانی له‌ڕه‌فتارداو له‌به‌رده‌م یاسادا. هه‌روه‌ها زاراوه‌که بۆ باوه‌ڕبوون به یه‌کسانیه‌ك له جۆرێکی فراوان تر به‌کار دێت که ئه‌ویش یه‌کسانیه له ده‌رفه‌ته‌کانی هه‌وڵدان بۆ به‌دیهێنانی ئامانجه‌کان و یه‌کسانی له پاداشتدا وه‌ك چاودێری مادی و بارودۆخ و ده‌سه‌ڵات.

**See also: Civil rights.**

## Election (الانتخاب) هەڵبژاردن

بریتیە لە ڕێگەیەك بۆ هەڵبـژاردنی کەسـانێك بـۆ وەرگرتنـی پایـەی دیـاریکراو لـە ڕێگەی هەڵبژاردنی دەنگدەرەکانەوە واتە ئەوانەی کە ئامادەی دەنگدانن بەپێی ڕێساو کارەکـانی سیـستمی هەڵبـژاردن. هەڵبـژاردن ڕاسـتەوخۆ دەبێـت کاتێـك دەنگـی دەنگـدەران دەدرێتـە پـاڵێوراوانی پایەکـەو ناڕاسـتەوخۆیش دەبێـت کاتێـك کـە دەنگدەرەکان یەکەم جار ئەو نوێنەرانە هەڵدەبژێرن کەدواتر لـە پـاڵێوراوان بـۆ پلـە و پایەکە هەڵدەبژێرێن. لەوانەیە هەڵبژاردنەکە یەکێك بێت یا فرە بێت بە پێی ئەوەی کە هەڵبژاردنکە بۆ پڕکردنەوەی یەك کار بێت (وەك هەڵبژاردنی ئەندامێك بۆ ئەنجومـەنی گشتی لەیەك بازنەدا) یا هەڵبژاردنە چەندین پاڵێوراو لە کۆنگرەی پارتی کرێکاران لـە بەریتانیا و هەندێك لە هەڵبژاردنی ناوخۆییەکانی ئەوێ و ئەمریکادا.

**See also :Electoral collegh ;**
**electoral system; indirect election psephology ;**
**voting**

## Electoral College (هيئة الناخبين) دەستەی دەنگدەران

بریتین لەو کۆمەڵە دەنگدەرەی کـە بـەر پرسـیارێتی هەڵبـژاردن بـۆ فـەرمانێکی دیاریکراویان پێ سپێراو کە کۆمەڵێکی گەورەتر هـەڵیان دەبـژێرن بـەڵام دەکرێـت کـە ئەندامانی دەستەی هەڵبـژاردن دابنـرێن یـا پایەکـە وەربگرێـت بـە حـوکمی کـار ەکـە (کۆڕی کاردیناڵەکان **The College of Cardinaals** کە بۆ هەڵبژاردنی پاپا کۆ دەبنەوە) . لە ئەمەریکاش سـەرۆك و جێگری سـەرۆك لەدەسـتەی دەنگدەرانـەوە هەڵدەبـژێرێن و دەنگـدەرەکان ئەندامـەکانیان لەهـەر ویلایەتێکـدا هەڵدەبـژێرن. لـە

ئەڵمانیاش بە تایبەتی دەستەی دەنگدەران سەرۆك هەڵدەبژێرن کە ئەندامانی ئەنجومەنی میللی (Lower Chamber) لەخۆ گرتووە لە ئەنجومەنی یاسادانانی نیشتیمانییەوە (The Bundestag) لەگەڵ ژمارەیەکی یەکسان لە ئەندامانی پەرلەمانی ویلایەتەکاندا. سەرۆکی فەرەنسیش بەپێی دەستوری کۆماری پێنجەم هەڵدەبژێرێت لەساڵی 1962 دا لەو دەستەی هەڵبژاردنەوە کە لە کەسێتی بەرزی ناوخۆو ئەندامانی پەرلەمانی فەرەنسی پێك دێت بەڵام ئەو دەستورە دواتر گۆڕانی تیا کرا بۆ جێ بەجێ کردنی هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ.. دەستەیەکی هەڵبژاردنی تایبەتیش کە بریتین لە نوێنەرانی حیزب لە ئەنجومەنی گشتی و ڕێکخراوەکانی حیزب لە بازنە ناوخۆییەکان و سەندیکا کرێکارییەکانی سەر بە حیزب سەرۆکی حیزب و جێگرەکەی هەڵدەبژێرێت. هەروەها دەکرێت کە کۆنفرانسەکان ناونانی حیزبەکان لە ئەمەریکادا کە پاڵێوراوانی پایەی سەرۆك وجێگری سەرۆك هەڵدەبژێرن بە دەستەی هەڵبژاردن دابنرێن چونکە ئەندامانی حیزب و لایەنگرانی نوێنەراکان بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە هەڵدەبژێرن.

See also :Elecition:indirect election.

## Electoral Quota پشکی هەڵبژاردنی (الحصة الانتخابية)

ئەو سستمە هەڵبژاردنانەی کە بازنە یا لیستی حیزبی فرە ئەندام لە خۆ دەگرن پشت بە نواندنی ڕێژەیی دەبەستن یا دەنگدانی بە باشتر نازنین کەپێویستی بە ڕێگەیەك دەبێت بۆ تایبەت کردنی کورسیەکان لە نێوان حیزبەکان یا پاڵێوراوەکاندا لەسەر قازانجی ئەو دەنگدەرانەیکە پێی دەدرێت. ئەو ڕێگە پەیرەوکراوەش بریتییە لە بەشی هەڵبژاردنی واتە لانی کەمی ئەو دەنگانەی کە دەبێت پاڵێوراوەکە بە دەستی بێنێ بۆ ڕاگەیاندنی هەڵبژاردنی جا لەبازنەی هەڵبژاردن دابێت یا وەك یەکێك لە

پاڵێوراوانی ناو لیستی حیزب.

پشکی هەڵبژاردن جۆری زۆرە، دەکرێت کە لە ڕێگەی دابەشکردنی سادەی ژمارەی ئەو دەنگانەی کە دراون بەسەر ئەو کورسیانەی کە لە بەردەستدان پشکی هەر حیزبێك دەرچێت (ئەو لیستە حیزببەیکەچارەکیدەنگە دراوەکانی دەست دەکەوێت چارەکێك کورسیی بەر دەکەوێت) بەلأم ئەمە کێشەی شێوازی چارە سەرکردنیکەرتەکان دەهێڵنەوە. سستمی دۆنت جۆرێکە لە سستمی پشەکەکان کە ئەم کێشەیە بەدابەشکردنی دەنگە دراوەکانی هەر لیستێکی حیزبی بەسەر ژمارە ڕاستە بەدوایەکەکانی : 1،2،3،4،.....دا چارە دەکات بەمەش ژمارەی ئەو کورسیانە زیاد دەکات کە ئەو حیزبانەبەدەستی دێنن کە زۆرترین ژمارەی دەنگیان هەیە. پشکی هارا ـــ نیمایریش کە شوێنی پشکی دۆنتی گرتووەتەوە لە هەڵبژاردنە فیدراڵیەکانی ئەڵمانیای ڕۆژئاوادا لە ساڵی 1987 وە، بۆ هەر حیزبێك ئەنجامی لێکدانی ژمارەی گشتیی کورسییەکان لەگەڵ دەنگە دراوەکان بەو حیزبە حیساب دەکرێت پاشان ئەنجامەکە بەسەر کۆی گشتیی دەنگە دراوەکاندا دابەش دەکرێت، ئەنجامیشی بریتییە لە ژمارەی ئەو کورسیانەی کە ئەو حیزبە بە دەستی دەهێنێت (حسابێکی تر بۆ چارەسەری کەرتەکان بەکار دێ) بە شێوەیەکی گشتیش ڕێگەی (دروب) بۆ سستمی دەنگی تەنهای قابیلی گواستنەوە بەکار دێت.

هەروەها زاراوەی پشکی هەڵبژاردنی ((Electorai quot بەمانای ئەو پێوەرەش بەکار دێ کەسەر لە نوێ دابەشکردنەوەی بازنە هەڵبژاردنییەکانی پێجێبەجێ دەکرێت کە پشتی بەستوە بە ناوەندی ژمارەی دەنگدەران لە هەر بازنەیەکی هەڵبژاردندا.

**See also :Apportionment;d.Hondt Method;**
**Droop Quota ;electoral sys-**
**Tem ;Hare-Niemeyer Method.**

## Eiectoral System    سستمی هەڵبژاردن (النظام الانتخابی)

بریتیە لەو ڕێگەیەی کە ژمارەی دەنگەکانی هەڵبژاردنی پێ دەگۆڕێت بۆ کورسیەکان لە ئەنجومەنەکانی یاسادانان یا دەزگا هەڵبژێراوەکانی تردا. لە کاتێکدا ڕێکخستنە دەزگاییەکانی تری وەك مافی دەنگدان و بەخشتەکردنی هەڵبژاردن و کاتەکانی کردنەوەی مەڵبەندەکانیدەنگدان و ڕێگەی تۆمارکردنی دەنگدەران و چۆنیەتی دەنگدان بەلەباتی و دەنگدان بە پۆستە ... دەکرێت کە بە بەشێك لەسستمی هەڵبژاردن دابنرێت (لە هەندێك باردا کار لە کۆمەڵی بەشداربووان لە دەنگداناو ئەنجامی هەڵبژاردنەکان دەکات)، بە شێوەیەکی بەر بلاوا باوە کە شیکردنەوەی سستمە هەڵبژاردنییەکان تەنها لەڕێگەی ژماردنی دەنگەکان بۆ سەر لەنویٚ دابەشکردنی دەنگەکان بەکار دێت بە پیی پێویست. بەلاّم سستمی دەنگدانی جێگرەوە کە لە هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی میللی ئوسترالیادا بەکاردێت و سستمی یەك دەنگ کە قابیلی گواستنەوەیە و لە هەڵبژاردنە سستمیەکانی نواندنی ڕێژەییش بەشێوەیەکی ئاشکرا هەوڵی بەیەکەوە بەستن دەدات لە شێوازێکی یەکساندا لە نێوان تایبەتیکردنی کورسییەکان بۆ پاڵێوراوان و لیستی حیزبییەکان و کۆمەڵی جۆراو جۆرو بەر فراوانی سستمە هەڵبژاردنییە بەکار هاتووەکان (سەیری ڕابەری سستمە هەڵبژاردنیەکانی ئەورووپا بکە) .

**Geoffry Hand et al., European Elec-
Toral Systems Hand book ,London ,
Butterworths ,1979.**

کە لەرابوردوودا تاقیکراونەتەوە یا بۆ ئاییندە دانراون دەشێت کە بکرێن بە سێ چەشنی گشتییەوە. لە سستمی زۆرینەدا پاڵێوراوەکان بە پەیڕەوکردنی کارێکی سادە هەڵدە بژێررێن ئەویش ژماردنی دەنگەکان و بەخشینی کورسییەکانە بە وانەی کە

زۆرترین دەنگ بەدەست دەهێنن. زۆرینەیەکی کەم بەسە (وەك لە هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی گشتی بەریتانیادا) یا جۆرێك لە زۆرینەی مەرجداری پێویستە (وەك سستمی دەنگدانی دووەمی بەکار هاتوو لە فەرەنسادا لە هەڵبژاردنی 1988دا بۆ ئەندامێتی کۆمەڵەی نیشتمانی و هەڵبژارنەکانی سەرۆکایەتیدا) سستمەکانی بە باشتر زانین وا دانراون کە دەنگەرەکان بتوانن بە باشتر زانینی خۆیان دەربڕن لە نێوان پاڵێوراوەکاندا و نموونەی ئەم بەباشتر زانینانەش بەکار دەهێنرێن بۆ دووبارە دابەشکردنەوەی دەنگەکان کە بەکار هاتوون لە هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی میللی ئوسترالیدا و سیستمی یەك دەنگیدا کە قابیلیگوێزانەوەی بەکار هاتووە لە هەڵبژاردنەکانی یاسادانادا لە کۆماری ئێرلەندا و ماڵتا لەم گروپەن. سیستمی نواندنی ڕێژەیش بەشێوەیەکی ڕوون هەوڵدەدات بۆپەیوەندکردن لە شێوازێکی یەکساندا لەنێوان بەشی ئەو دەنگانەی کەهەر حیزبێك بە دەستی دێنێ و ڕێژەی سەدیی کورسیەکانی یاسادانان کە بە دەستی دێنێ . ئەم جۆرە سستمانە لیستە حیزبییەکان لە خۆدەگرن بەلاّم هەر دەم نا.

**See also :Additional member systems ; Alternative vote system; apportion-Ment; constituency; cumulative vote; Election ; electoral college ; electoral Quota;franchise; gerrymandering ;in-Direct election ;majority ; preferntial Proportional representation ;voting; second ballot system ;single transera-bli vote system.**

## Electoral Volatility هەڵبەزو دابەز لەهەڵبژاردندا (*التقلب الانتخابی*)

بریتییە لە پێوانی گۆڕان لە هەڵبژاردندا لە نێوان دوو هەڵبژاردندا هەروەك ئەنجامی گۆڕانە لە دەنگەکاندا نیشانی دەدات کە حیزبەکان بەدەستی دێنن بە

ڕەچاوکردنی گۆڕانکاریەکان لە سەرجەمی دەنگدەراندا بەخستنە سەری کۆمەڵی دەنگدەرە لاوەکان و مردنی دەنگدەرەکانی تر (هەروەها لە ڕێگەی کۆچکردنەوە بۆ ناو بازنەی هەڵبژاردن یان لێیەوە) و گواستنەوەی دەنگدەرەکان لە جۆری ئەوانەی کە دەنگ نادەن و بۆیان. پوختەی ئەو ئاڵوگۆڕە بچوکەی کە لە دەنگدانی حیزبەکانەوە دەردەکەوێت (هەڵبەزو دابەزی گشتی) لەوانەیە لە ڕاستیدا پلەیەکی بەرزی هەڵبەزو دابەز بشارێتەوە لەسەر ئاستی تاکەکان ئەگەر سەرجەم گۆڕانکاریەکان بەبەر فراوانی ئاڵوگۆڕی سڕینەوە بکەن.

See also :Party identification.

## Elite دەستەبژێر (النخبة)

زاراوەکە لە بنەچەدا بە مانای کەمینەی هەڵبژاردە یا بژارکراو لە کۆمەڵێکی کۆمەڵایەتیدا دێت (کۆمەڵگا یا دەوڵەت یا حیزبی ڕامیاریی) ومومارەسەی دەسەڵاتێك دەکات لەو کۆمەڵەیەدا بەهۆی بەهرە کردارییەکانیەوە یا تایبەتە گریمانە کراوەکانیەوە. ئەو دەستە بژێرەش کە پیادەی دەسەڵاتێکی ڕامیاریی دەکات بە دەستەبژێری فەرمانڕەوا یا ڕامیاریی ناو دەبرێت.

ئەندامی نوێ بە چەندین کرداری جیاواز دەخرێنە سەر دەستە بژێرەکان بە پێی ڕۆشنبیری کۆمەڵگاو سروشتی دەستە بژێری فەرمانڕەوا و پێویستیەکانی. لەدایك بوون و پلەی خوێندن و توانای پیشەیی و سامان و جڵەوگیرکردنی ئەندامی نوێ. بەم شێوەیەش ڕەنگە سروشتی هاوبەشی دەستە بژێری فەرمانڕەوا بۆ چین یا جۆری ئەرستۆکراتی یا چینێکی فەرمانڕەوا بێت. تیۆرەکانی دەستە بژێر دوو شێوەی ئاشکرا وەردەگرن شێوەی یەکەم دەستە بژێریی پێوەرییە کە پێی وایە تەنها ئەو کۆمەڵە دەتوانن کە کاروباری کۆمەڵگا بەڕێوەبەرن کە بەهرەی تایبەتییان هەیە لە پێناوی پاراستنی ڕژێم و چەسپاندنی پەرەسەندندا، شێوەی دووەمیش بریتیە لە تیۆری دەستە بژێری ئەزموونی کە وای دادەنێ کە سروشتی کۆمەڵەکانی دەستە بژێر

و ڕەفتاریان دوو هۆکاری یەکلاکەرەوەن لە شیکردنەوەی ڕامیاریداو هەروەها پیی وایە کە جۆرێك لە بالاّ دەستی ی دەستەبژێر حەتمیە هەتا ئەگەر تێزە یەکسانی خوازو شێوەکانی دیموکراسیەتی کۆمەلگا هەر چۆنێك دەرکەون.

ئەو ڕای گشتیەی کەپیی وایە کەهێزی ڕامیاری لەدەستی دەستەبژێردا چڕ دەبێتەوە،و ئامارەی بۆ دەکات بەوەی (گریمانەی دەستە بژێرە)) لەمەترسی هاوڕێکی کردندایە لەگەڵ تێبینییەکی گرنگی پیّ نەدراودا کەپیی وایە ئەو کەسانەی کەفەرمانڕەوایی دەکەن زۆر کەمترن لەوانەی کەلەژێر فەرمانڕەوایەتی ئەواندان. وەبەشێوەیەکی بەرفراوان نەك گشتگیر پیی وایە کەپێدانی گریمانە گرنگیەکی ئەزموونی دیاریکراوی هەیە پێویستە سیّ مەرجی مەفاهیمی بۆ بوونی هەر دەستە بژێرێك بسەپێنرێت: پێویستە کۆمەڵەکە ناسنامەی خودی هەبێت، وە ئەندامەکانی پێکەوە کار بکەن، وە دەبێت کارەکە هەوڵدانێك بێت بۆ بەدیهێنانی مەبەستێکی هاوبەشی.وە بەگشتی ئەم داخوازییانە چڕ دەکرێنەوە بەو پییەی کەئاگاییەکی دەستە جەمعیە (Group conciousness) یەکانگیری (Coierence) (conspiracy) یان ئەوەی پیی دەوترێت ((The three (s)).ئەگەر ئەوانیش کەمومارەسەی هێزی ڕامیاریی دەکەن نەیانتوانی ئەم تایبەتمەندیانە بخەنە ڕوو،ئەگەر هێزی ڕامیاریینبۆ نموونە،مەترسی دابەشبوونی گۆڕاوی لەسەر بوو بە بەردەوامی لەنێوان دەستە بژێرە ململانێکەرەکاندا کەهەولّی بەدیهێنانی بەرژەوەندییە جۆراوجۆرەکان دەدەن ئەوا زاراوەی (دەستە بژێری فەرمانڕەوا) بەشێوەیەکی گونجاو دانانرێت وێڕای ئەوەی کەشیکارکردن بەچڕی دەمێنێتەوە لە دەستەبژێر ململانێکەرەکان بۆ کۆمەڵە لقیبە جۆراو جۆرەکان.

ئەو لێکۆڵینەوە ئەزمونیانەی کەهەولّ دەدات گریمانەی دەستەبژێر هەڵبژێرێت یان ئەوەی هەولّ دەدات شیکاریی ڕەفتاری دەستە بژێر بکات چەندین جار ڕامیاریی کۆمەلگا ناوخۆییەکانی پشکنیوە.

See also :Aristocracy ;communty Studies ; iron law of oligarchy ; Marx-Ism ;oligarchy ;pluralism ; polyarchy ; Ruling class.

**Emboourgeoisement** **پەیڕەوکردنی بورژوازییەت** (*تبني البرجوازية*)

پرۆسەیەکە تێیدا تاك یان کەرتەکانی یەك چین هەڵوێستی بۆرژوازی یا شێوازی ژیانیان وەردەگرن. بەم شێوەیە ژمارەیەکی زۆر تاك لە چینی ئەرستۆکراتی لە ناو چینی بۆرژوازیدا تواونەتەوە لە وولاتە پیشەسازییەکاندا لە ڕێگەی بەشداری کردنیان لە چالاکی بازرگانیدا . هەروەها ئەوانەشی کە لە بنچینەدا لە چینی کرێکاران و پێگەی دەستە بژێری ڕامیارییان هەیە ڕەنگە ئەریتی پەیوەند بە بورژوازیەتەوە هەڵبگرن بە شێوەیەکی بەهێز تر لەو چینەی کە لێوەی هاتوون.

لەشیکردنەوەی ڕامیاریشدا (گریمانەی پەیڕەوکردنی بۆرژوازییەت) بریتیە لەو ڕایەی کە لەدەیەی پەنجاکان و شەستەکاندا باوو بووە بەوەی کە ناتوانرێت کرێکارە بەریتانیە خۆشگوزەرانەکان بە چینی کرێکار دابنرێن بۆیە، پشتگیریی هەڵوێستی ئاسایی پارتی کرێکارانیان نەکردووە.

See also: Capitalism; dealignment; elite;iron law of oligarchy ; proletari-anization ;realignment ;social class; socialism.

**Empiricism** **ئەزموونگەریی** (*التجريبية*)

باوەڕبوون بەوەی کە ئەو دیاردانەی کە تاقی دەکرێنەوە بریتین لە بناغەی زانین نەوەك تیۆرو بیرەکان و، لەباشترین باردا پێویستە کە شتی تر نەخرێتە

سەر کۆمەڵی زانینی پەسەندکراو لەھەر لقێکدا جگە لەو گریمانە و تیۆرو یاسا زانستییانە نەبێت کە بە تێبینی دەچەسپێت.

زاراوەی ئەزموونگەری ئێستا زۆر جار بە شێوەیەکی ڕەخنەیی بەکاردێت کاتێك کە بە نموونەیەکی شیکردنەوەی ڕامیاریی دەوترێت بەوەی کە شیکردنەوەییەکی (ئەزموونی ڕووتە) و بنەمایەکی تیۆری نیەو ڕووی تێبینیکراوی دیاردەکە تێ ناپەڕێنێت و (ڕاستییەکان) بە شێوەیەکی ناڕەخنەیی و ناڕامانی...هتد دەخاتە ڕوو.

**See also: Behaviouralism ; postitivism**

## تەوژمی پاراستنی ژینگە (*نزعة حماية البيئة*) Environmentalism

بیروباوەڕێکە بایەخ بەپاراستنی ژینگەی سروشتی ئەداو بانگەوازەکارانی ھەوڵی ئەوە ئەدەن کە کار لە حکومەتەکان بکەن بۆ وەرگرتنی ئەو بڕیارانەی کە بۆ پاراستنی ژینگە و چاکردنی پێویستن. زۆر لە بانگەوازکارانی پاراستنی ژینگە لە ڕێبازی (فریاکەوتنی یەکەمی) زیاتر دەڕۆن واتە چارەسەری ئەو ئەنجامە لاوەکیانەی کە دەبنە ھۆی پیس بوون بۆ کەمکردنەوەی شوێنەوارە زیانبەخشەکانی لەسەر ژینگە بۆ کەمترین ڕادەو لە باتی ئەوە ھەوڵ ئەدەن کە پەرە بە ڕێبازێکی ڕیشەیی تر بدەن لە بەرامبەر بنکەی ئابوری و تەکنیکیی کۆمەڵگادا لە پێناوی ڕەفتارکردن لەگەڵ سەرچاوەکانی مەترسیی ژینگەییدا پێش ئەوەی ئەو مادانە بەرھەم بێنیٚ و پەرەی پێبدات کە قابیلی تازەکردنەوەو سەر لە نوێ چارەسەرکردنن و ھاندانی پاراستنیمادەە خاوەکان . ڕێکخراوەکانی پاراستنی ژینگە لە کۆمەڵەکانی بایەخ و بزوتنەوە ناوخۆیی و ژینگەییەکانەوە دروست بووە لە وولآتانی وەك ئەمریکا و کۆماری ئەڵمانیای فیدراڵ و بەر یتانیاو سویسرا.

لە ھەندێك باردا ڕاستەوخۆ چووەتە مەیدانی ڕامیارییەوە بەدروست کردنی حیزب و

ناونانی پاڵێوراوانی لە هەڵبژاردنەکاندا. لەکۆماری ئەڵمانیای فیدراڵدا (بۆندستاغ) ساڵی 1983و1987 پارتی سەوز زۆرینەی کورسییەکانی بردەوە و لە زۆربەی پەرلەمانەکانی ویلایەتەکانی ئەڵمانیادا نوێنەری هەیە و لە حکومەتە ئیئتیلافییەکانی ویلایەتەکانی هیسە و ساکسۆنی خوارووی بەرلیندا بەشداری کردووە . حیزبی ژینگەی سویسریش سەرکەوتنی باشی بەدەست هێناوە لە هەڵبژاردنە نیشتیمانیو کانتۆنی و ناوخۆییەکاندا. لە بەریتانیادا وپاڵێوراوانی حیزبی سەوز کورسییەکانی دەسەڵاتەکانی حوکمی خۆجێیی بردەوە. لە کۆمەڵەی ئەورووپیشدا نوێنەری حیزبە سەوزەکان ژمارەیەك کورسییان هەیە لە پەرلەمانی ئەورووپیدا.

بەڵام کۆمەڵەکانی بایەخ کە بەشدارن لە مەسەلەکانی پاراستنی ژینگەدا وەك بزوتنەوەی ئاشتی، سەوز تا ئێستا رۆڵێکی رامیاریی گرنگی هەیە سەرباری بزوتنەوەو بیرباوەڕەکانی تر وەك بزوتنەوەی پاراستنی مافەکانی ئافرەت و بزوتنەوەی بانگەواز بۆ ئاشتی دەکرێت بە بزوتنەوەی پاراستنی ژینگە دابنرێت چونکە زیاتر گرنگی بە بەهاکانی پاش سەردەمی پیشەسازی دەدات لە نێوان دانیشتوانی دەوڵەتە پێشکەوتووەکاندا.

**See also :Interest group ;movement ;**
**Overlond (a) : government overload ;**
**Post-materialism.**

## Equilibrium هاوسەنگی *(التوازن)*

بریتیە لەباری هاوسەنگی ڕەگەزەکانی سستمێك و جێگیر بوونی. سستمیش کاتێك لەباری هاوسەنگیدا دەبێت کە ڕەگەزەکانی خۆی مەیلی گۆڕینی پەیوەندییەکانی نەبێت سەر باری گۆڕانکارییە دەرەکیەکانیش (کە بنەڕەتیکی دەرەکییان هەیە) لە بارودۆخێکدا کە گۆڕان دروست بکات.

ئەو سیستمانەش کەهەمان شێوە دەپارێزن یا لەسەر هەمان ئاستن لە هەندێك

گۆڕانکاریـــدا، لەگـــەڵ بـــوونی دەســـتێوەردانی دەرەکـــیش دا پێیـــان دەووترێـــت (هۆمۆستاتیك) واتە لێك چووی جێگیر. لەوانەشـە کـە هاوسـەنگییەکە جـێگیر بێـت و بگەڕێتەوە بۆ هەمان جێگە پاش دەستێوەردانی هۆکاری بیانی یا نـاجێگیر بێـت واتـە ناگەڕێتەوە بۆ هەمان جێگە کاتێك کە دەستێوەردان ئەنجام ئەدرێت یا بۆ جێگەیەکی نوێ دەگۆڕێت.

بەقەدەر ئەوەی کە جیاوازی نێوان سیستم و هۆکارەکانی بەدەر لیی ئـەنجامی بینایەکی تیۆری بن مەرج نیە کە هاو جووت بێت لەگەڵ پلەکانی جیاکردنەوەی نێـوان کۆمەڵێك گۆڕان و ژینگەکـە یـان لەوانەیـە کـە بەڕاسـتی نـەتوانرێت بـاری هاوسـەنگی دروسـت بکرێـت. بـەلآم ڕەنگـە بیرۆکـەی مـەیل بـەلای هاوسـەنگیدا بەسـود بێـت لەشیکردنەوەدا.

See also: Adaptation; feed back ; func-
Tional explanation ; political system ;
Structural- functional analsis ; system
Analysis ; variables.

## چەمکە هاو دژەکان لە ناوەڕۆکدا (*مفاهیم متعارضة جوهریا*) Essentilly contested concepts

زاراوەیەکـە لەلایـەن (و .ب.گـالی) ە وە بـەکار هێنـراوە بـۆ ڕوونکردنـەوەی ئاسـتەنگەکانی ڕاڤـەکردنی بیرەکـانی وەك (دیموکراسـی) و (مەسـیحیەت) کـە ئـەو بیرانە مێژووەکەیان لە زنجیرەیەك ناکۆکیی ڕیشەیی پێك هـاتووە، سـەبارەت بـە مانـا بنەڕەتییەکانی. هەنـدێك نووسـەری تـریش مانـای زاراوەکـەیان فـراوانتر کـردووە یـان زۆربەی ئەو چەمکانە بگرێتـەوە کـە لـە شـیکردنەوەی ڕامیاریـدا بـەکار دەهێنـرێن یـا هەموویان.

هەندێکی تر پێیـان وایـە کـە بـە شـێك لـە مانـای بنـەڕەتی ی چـەمکێکی ڕامیـاریی

بریتییە لەدەربڕینی بۆ بەهاو بۆ وەسفکردنی شتێك بەوەی کە بریتییە لە پیادەکردنی (هێز)، بە پشت بەستن بەم ڕایەش ئەوا هەر هەوڵێك بۆ لێکۆڵینەوەی ڕامیاریی بە شێوەیەکی بابەتیانە سەرکەوتن بەدەست ناهێنێ چونکە ناکۆکییە ئایدۆلۆژییەکان ڕەگەزی بنەڕەتین لە چەمکە سەرەکییەکاندا.

See also: Ideology ; power ; value judgments.
Etatisme See :Interventionism.

**باوەڕ بە بالاّ دەستی ڕەگەزیی ـ ئەتنیسێنتەریزم ـ *(الایمان بالتفوق العنصري)***
**Ethnicentrism**

هەوڵدان بۆ شیکردنەوەی لایەنەکانی ڕۆشنبیرییەکانی ترو هەڵسەنگاندنیان بە بەکارهێنانی ڕۆشنبیریی مرۆڤ وەك کۆمەڵێك ڕێبازو پێوەر وسەرنج. لە لێکۆڵینەوەکانی سۆسیۆلۆژیادا ڕەنگە ببێتە هۆی گەیشتن بە ئەنجامی هەڵە یا جێبەجێکردنی پێوەرەکانی ڕۆشنبیری ی مرۆڤ و بەهاکانی لە بواری لێکۆڵینەوەی ڕۆشنبیریی یەکانی ترو شیکردنەوەیان بە شێوەیەکی لایەنگیرانە و نەگونجاو.
ڕەنگە ئەم جۆرە لایەنگیرییە لە باوەڕێکی شاراوە یا ئاشکراوە سەرچاوە بگرێت بە بالاّ دەستیی ڕۆشنبیری مرۆڤ کەدەکرێت لەباری توندڕەودا دەربڕی ڕەگەز پەرستی و ڕق لە بێگانە بوونەوە بێت. لەزانستی ڕامیارییش دا باوەڕ بوون بە بالاّ دەستی ی ڕەگەزیی وەك گرفتێك کە بە تایبەتی پەیوەندیی هەیە بە لێکۆڵینەوە بەراوردکارییەکان و نێو دەوڵەتیەکان و لێکۆڵینەوەی پەرەسەندنی ڕامیارییەوە.

See also :Racism ;xenophobia.
Eurocommunism See :Communism.

## Exchange Theory تیۆری ئاڵوگۆڕ (*نظرية التبادل*)

ڕێبازێکە کە زۆر جار لە سۆسۆلۆژیادا بەرەو ڕووی دەبینەوە بەڵام لە هەمان کاتدا بەندە بە شیکردنەوەی ڕامیاریی و کۆکردنەوەی نێوان چەمك و شێوازەکانی وەرگیراو لە شیکردنەوەی ئابوری و دەروونییەوە. وەك ئاڵوگۆڕی شتە بەنرخە نامادییەکان کە لەشێوەی چاکەو بیردان ڕەفتار لەگەڵ پەیوەندییە ڕامیارییەکاندا دەکات و پەیوەندی ئاڵوگۆڕکراو بەرهەم دێنێ لە شێوەی پەیوەندییەکانی پەیوەستی و ڕێزو بڕوادا.

زەحمەتی ئاشکرا هەیە لە بەکارهێنانی نموونە ئابوریەکاندا بۆ مامەڵە کردنی ڕاستەوخۆ لەگەڵ بەها (دەروونییە) درێژو خراپ پێناسەکراوەکاندا. زۆر جار تیۆری ئاڵوگۆڕ ڕەخنەی لێ دەگیرێت چونکە بە زمانێکی نەشیاوو ساویلکانە وەسفی پەیوەندییە ڕامیارییە کۆمەڵایەتیەکان دەکات.

ئەم ڕێبازە لە شیکردنەوەی هێزی ڕامیاریی و دەسەڵات و دینامیکیەتی گۆڕان لە کۆمەڵەکانی وەك حیزبە ڕامیارییەکان دا جێبەجێکراوە بە تایبەتی بەندە بە لێکۆڵینەوەکانی جۆرج هۆمانز و پیتربلاو. یەکەم پێی لەسەر سایکۆلۆژیەتی ئاڵوگۆڕی تاکی داگرتووە و دووەمیش هەوڵی داوە کە چەمك و ئامرازە ئابوریەکان وا لێ بکات کە لە کاریگەری توندتریان لەسەر کاری دەزگاکان هەبێت.

**See also :Bargaining theory ; behavi-Ouralism ;bureaucracy ;clientelism; Esonomic theories of politcal ; politcal psychlogy ; utility ; values.**

## Executive دەسەڵاتی جێبەجێکردن (*السلطة التنفيذية*)

لەبەکار هێنانی فراوانیدا بریتیە لەو لقەی حکومەت کەبەر پرسیارە لەجێبەجێکردنی ئەو ڕامیاریی و ڕێسایانەی کە ئەنجومەنی یاسادانان دایدەنێت.

بەم شێوەیە لە ئەندامێتی خۆیدا سەرۆکی حکومەتی تیایە (سەرۆك وەزیران یا ڕاوێژکار یا سەرۆك کۆمار لە سیستمە سەرۆکایەتیەکاندا) هاوڕێکانی ئەو سەرۆکە لە وەزیرەکان و بەڕێوبەرایەتی ڕامیاریی هەمیشەیی یا پەیوەندیدار بە ڕامیارییەوە و فەرمانگەکانی وەك پۆلیس و هێزی چەکدارەکان. لە مانای تەسکیشیدا دەسەڵاتی جێبەجێکردن بریتیە لە کۆمەڵێك ڕامیارو گەورە کارمەندە مەدەنییەکان کە بەر پرسیارێتی پێشکەش کردنی ڕامیاریی و ڕێکخستنییان لەئەستۆدایە بەمەش دەبێتە هاوتای یەکێك لەبەکارهێنانەکانی زاراوەی (حکومەت) . دەسەڵاتە جێبەجێکەرەکان جیاوازن لەڕووی پێکهاتەو دانان و دەسەڵات و پلەی بەر پرسیارێتیدا (بەرامبەر ئەنجومەنیاسادانەر یا دەستور یا گەل) بە پێی سیستمی حوکم. لە دەوڵەتە یەك حیزبییەکاندا. بەرزترین پایە، کە لە ڕاستیدا هەمیشە دەستوریی نەبووە بریتیە لە پلەکانی پێشەوای حیزبەکان نەوەك سەرۆکی دەوڵەتەکان . بۆ جێ بەجێکردنی ڕامیارییەکانی ئەنجومەنی یاسادانەر و دەسەڵاتە جێبەجێکەرەکان لە هەندێك دەوڵەت و ڕێکخراوە ڕامیارییەکانی تردا (نەتەوە یەکگرتووەکان و کۆمەڵەی ئەورووپی و دەسەڵاتەکانی حوکمی خۆجێی و حیزبە ڕامیارییەکان، وەك نموونە) دەسەڵاتی پێویستیان پێدەدرێت بۆ دەرکردنی یاسایەکی جێ بەجێکەرانە کە بە گشتی پێی دەوترێت (یاسای ڕێپێدراو) . لەوانەش دەسەڵاتی جێبەجێکەر دەسەڵاتێکی نیمچە دادوەریشی هەبێت کە لە ڕێگەی پرۆسەکانی دادگا کارگێڕییەکانەوە پیادە دەکرێت.

**See also :Administrative tribunal ; bu-Reaucracy ; delegated legislation ; gov-Ernment (a) :the institution ;separea-Tion powers.**

## Exhaustive Ballot دەنگدانی سەرا پایی *(الاقتراع الشامل)*

ڕێگەیەکە لە دەنگداندا کە لە ژمارەیەك دەنگدانی یەك بە دوای یەك پێك دێت تا پاڵێوراوێك زۆرینەییەکی دیاریکراو بە دەست دێنێ زۆرینەی دەنگە گشتییەکانیش (بریتییە لە 50٪ ی دەنگی دراوەکان بە مەرجێك ئەو پاڵێوراوانەی کە دەنگی کەمتریان هێناوە لە هەر قۆناغێکی دەنگداندا ئەوا لە قۆناغەکانی داهاتوودا دور دەخرێنەوە.

See also: Second ballot system.

## Exit (الخروج) دەرچوون

یەکێك لە ڕەگەزە بیر سیاسییەکانە کەئەلبێرت هیرشمان بەکاری هێناوە لە شیکردنەوەی (وەڵام دانەوەکانی دارمانی کۆمپانیا و ڕێکخراو و دەوڵەتەکاندا). لەبەرنگار بوونەوەی کارسازیی تێکچوو لەبەردەم کڕیار و ئەندام و هاووڵاتیاندا، دوو هەڵبژاردنی بنەڕەتی هەیە ئەوانیش (دەرچوون) واتە وەستان لە کڕین یا واز هێنان یا پاشەکشێ و کۆچ کردن یا (دەنگ) کە بریتیە لە دەربڕینی تورەیی هەر یەك لەو دوو جێگرەوەیەش فشاری جیاواز لەو ڕێکخراوانەدا دروست دەکات ئەگەر (دەرچوون) ئاسان بێت ئەوا تەقاندنی دەنگێکی کاریگەر کەم دەکاتەوە. بەڵام ئەگەر لایەنگیریی ئامادەبوو ئەوا دەرچوون دەرفەتی کەمتر دەبێت وکاریگەریی (دەنگ) زیاتر دەچەسپێت.

Exit poll See : Psephology.

## Explanation (التفسير) لێکدانەوە

ڕاڤە کردنەکان وا وەسف دەکرێن کە بریتین لە وەڵامی ئەو پرسیارانەی کە بە دوای هۆو شێوازدا دەگەڕێت. ئەمەش بەتەنها بەس نیە چونکە پێوەرکان وەڵامێکی

پەسەند ناخاتە ڕوو لەسەر نموونەی ئەم جۆرە پرسیارانە، یەکێك لەو هەوڵدانانەی کە زۆر ترین کاریگەری یان هەبووە لەسەر دیاریکردنی پێوەرەکان بە پەرەپێدانی شێوەیەکی گشتی لێکدانەوەکە بە نموونەی (ڕێدۆزینەوەیی -یاسایی) یا (یاسای داپۆشین) یا نموونەی (بۆبەرهیمیل) ناسراو. نموونەی ڕێدۆزینەوەیی یاسشایی لە یاسایەکی گشتگیر پێك دێت لە جۆری (لە هەر جییەك مەرجەکان هەبن ڕوداوەکە ڕوو دەدات) لەگەڵ ڕونکردنەوەی ئەوەی کە مەرجەکان بە ڕاستی هەبوون لەو بارەدا کە پێویستە لێك بدرێتەوە.

ئەگەر توانرا ڕووداني ڕووداوەکە لەو دوو ڕەگەزەوە دەربهێنرێت ئەوا دەبنە لێکدانەوەی ئەو ڕوداوەش . بۆ نموونە یاسایەك کە ئەو مەرجانە ڕوون دەکاتەوە کە شۆڕشەکان لە سایەی دا ڕوودەدات لەگەڵ ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە ئەو مەرجانە لە ڕوسیا دا هەبوون لە ساڵی 1917 دا ئەوا ئەنجامەکە دەگاتە ئەوەی کە شوڕش بەرپا دەبێت بەمەش شۆڕشی ڕووسی لێك دەداتەوە.

هەندێك پێیان وا بووە کە هەموو لێکدانەوەکان لە هەر بوارێکدا گەرانێکە کە پێویستە لەگەڵ ئەو نموونەیەدا بگونجێت. ئەمەش قابیلی بڕوا پێکردن نیە، زۆر لێکدانەوەش پەیڕەوی ئەم شێوازە ناکەن. دەشتوانرێت کە ژمارەیەکی زۆر ڕوونکردنەوە دابڕێژرێت کە مەرجە ڕووکەشییەکانی بەدی بێنێ بەلاّم ئەو دیاردە سروشتیانە لێك ناداتەوە کە ئاراستەی کراون.

ئەمەش ڕووبەڕوی بەرهەڵستییەکی توند دەبێتەوە لە لێکۆڵینەوەی ڕامیاریی و مێژووییدا. بۆ نموونە چۆن دەتوانرێت یاسایەکی گشتگیری وا دابڕێژرێت کە بتوانێت شۆڕشی ڕووسی لێك بداتەوە. ئەگەر مەرجەکان بە شێوەیەکی گشتی دارێژران تا ژمارەیەك باری تر بگرێتەوە ئەوا ئەو یاسایە بێگومان ناڕاست دەبێت تا ڕادەیەك چونکە باری وا هەیەکە ئەو مەرجانە ئەنجامێکی شوڕشگێرانەی تیادا دروست نەکردووە.

لەلایەکی ترەوە ئەگەر مەرجەکان پێناسەیەکی بەر تەسکتر بکرێن لە وانەیە

یاسایەکی هیچی لێدەربچێت کە بەسەر هیچ بارێکدا ناچەسپێ تەنها هی ڕوسیای سالی 1917 نەبێت. لەم بارانەدا پابەندبوون بە نموونەی ڕێدۆزینەوەیی یاسایی یەوە هەلبژاردنێك لە نێوان ساختەو هیچیدا دەخاتە ڕوو. هەروەها شیکردنەوەی ڕامیاریی و (گفتوگۆی ڕۆژانە) تەنها لەیەك مەرجدا یا زیاتر لە مەرجێکدا چڕ دەبێتەوە کە ڕەنگە پێویست بێت بۆ ڕوودانی ڕووداوێکی دیاریکراو بەلام سەرکردایەتیەکی بەهێزی پێویستە بەمەش لەوانەیە کە سەرکردایەتی بەهێز بارێکی پێویست بێت بۆ شۆڕش بەلام بەدی هێنانی ئەم مەرجە لەوانەیەسەرکەوتنی شۆڕشگێڕانە زامن نەکات، بۆیە بە تەنها لێکدانەوەی ڕێدۆزینەوەیی – یاسایی بۆشۆڕش پێشکەش ناکات.

ئەم گرفتانە ئاماژە بە جێگرەوەیەکی ڕێدۆزینەوەیی – یاسایی دەکەن کە جێگرەوەیەکە چەندین جار لە زانستی ڕامیاریدا ڕووبەڕوی دەبینەوە. لەوانەیە لێکدانەوەکان بەشێوەیەکی خوێندنەوەیی هەلبهێنجرێن لە ڕوونکردنەوەی ئەگەریی لە باتی وەرگرتنی لە یاسایەکی گشتگیر. ئەم نموونە خوێندنەوەیی – ئاماریی یەش جێگەی یاسا گشتگیرەکە دەگرێتەوە بە ڕوونکردنەوەیەك کە دەلێت: (مەرجەکان بە ڕووداوەکانەوە پەیوەند دەبن بە ڕێژەی سەدی س لە بارەکان،لە هەندێك باری تردا بە 100 – س٪ بارەکان) یا بە ڕوونکردنەوەیەکی کەمتر.

وردتر بەوەی کە لەوانە نیە ئەنجامێك بە دەست بێت. بەم شێوەیەش خۆ لەو ساختەو پوچییە بە دور دەگیرێت کە ئاماژەی پێدراوە. دوو دژایەتی سەرەکی لە دژی ئەم شێوە لێکدانەوەیە دەوروژێنرێت یەکەمیان ئەوەیە ئەگەر شتێك لێك درایەوە ئەوا ئەوە لێکدانەوەی ئێمە دەنوێنێ بۆ ڕووداوەکان نەوەك بۆ میکانیزمە شاراوەکانی پشت ڕووداوەکان خۆیان. دووەمیشیان ئەوەیە ئەگەر ئاماژە بە هەندێك مەیل بە لای هەمان بارودۆخدا بکرێت ئەوا ئەنجامی گریمانەی کەمتریش وا لێك ئەدرێتەوە کە هەرە بەرزترینە چونکە یاسا وای دائەنێ کە سەرجەمی بارودۆخەکە هەردوکیانی بەرهەم هێناوە.

وەلامێکی بەهێز تر لەوانەوە دێت کە لەناو قالبی لێکدانەوەیی دا کار دەکەن

ئەوانەش کە بانگەشە بۆ ئەم هەڵوێستە دەکەن بەگشتی نموونەی بەڵگە هێنانەوەی _ یاسایی پەسەند دەکەن چونکە لەگەڵ لێکدانەوەی دیاردە سروشتییەکاندا دەگونجێت، بەڵام وای دادەنێن کە هیچ پەیوەندییەکی نیە بە زانستە مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتیەکانەوە. کرداری مرۆڤانە بە یاسا حوکم ناکرێت (بەمانای زانستی ی سروشت) بۆیە دەبێت ئەم لێکدانەوەیە لە هۆکارەکانی ڕەگەزەکان و مەبەستەکانیاندا چڕ بێتەوە. ئەم چڕ کردنەوەیەش وەسفێکیقوڵی لێدەکەوێتەوە لەبەر ڕۆشنایی باوەڕو دابە کۆمەڵایەتیەکانی کۆمەڵگەیەك یا سەردەمێك، وەسفێکە کەهەندێك پێیان وایە کە ناکرێت بە نموونەی بەڵگە هێنانەوەی یاسایی دابنرێت.

یەکێك لەو ئاستەنگە سەرەکییانە ئەوەیە کە نموونەکانیپەیکەری لێکدانەوە بەو گریمانانە ڕوو بەڕوودەکرێتەوە کە وەك لێکدانەوەیی وەر دەگیرێن لە بوارێکی زانستە سروشتیەکان یا کۆمەڵایەتییەکاندا بەڵام ئەمە ناگونجێت لەگەڵ پێویستیەکانی نموونەکە. هەندێك لە فەیلەسوفەکانی زانستیش لێزانییەکی گەورەیان نواندووە لە بواریسەر لە نوێ دارشتنەوەی ئەم نموونانەدا تا لەگەڵ نموونەی خواستراوی خۆیاندا بیگونجێنن لە لێکدانەوە یا سەر لە نوێ دارشتنەوەی نموونەکەیاندا تا لە نموونەکە بچێ. هەندێکیتر کاردانەوەکانیان لە پێشکەش کردنی نموونەی دژو نارەزایی تێدا خۆی نواندووە، بە کورتی ناکۆکیەك لە ئارادایە سەبارەت بە پرسیارە بنەڕەتیەکانی وەك: ئەو شێوەیە دەبێ چۆن بێت کە دەبێت ئەو لێکدانەوانە لە خۆی بگرێت؟ ئایا پێویستە کە ئەو لێکدانەوانە شوێنی هەمان شێوە بگرن لە بوارە جیاوازەکانی لێکۆڵینەوەدا؟ لەبەر ڕۆشنایی ئەم جیاوازییەدا سەیر نیە کە ژمارەیەکی شێوەی لێکدانەوەی جیاوازی هەبێت کە لە زانستی ڕامیاریدا خراوەتە ڕوو سەرباری ئارەزووی ڕوو لە زیادبووی شیکەرەوە تاکییەکانیش لەوەدا کە دەخوازن گوێبزێر بن لە هەڵبژاردنی لێکدانەوەکاندا.

**See also :Functional explanation ;her-Meneutics ; scientific law ;teleological Explanation ;theory.**

## Exploitation ئیستیغلال (الاستغلال)

بەشێوەیەکی گشتی بریتییە لە کردارێك یاپەیوەندییەك کە تیایداکەسێك یا کۆمەڵێك کەس یا کۆمەڵی تر بەکار دەهێنن لە پێناوی سودێکی خۆپەرستانەدا و بێ پاداشتێکی گونجاو.

لە شیکردنەوەی ڕامیاریشدا ئە زاراوەیە بەسەر ئەو پەیوەندییە ئابوورییانەدا جێبەجێ دەکرێت کە تیایدا کرێکار کەمترین بەهای تەواویی کاری دەست دەکەوێت: لە زمانی مارکسیزمدا (زێدەبایی) لە کار دەردێ. بەو شێوە لە سایەی دەرەبەگایەتیدا ڕەنگە مەرجی ئەوە بۆ جووتیار دابنێ لەبەرهەمی زەویەکەی بداتە سەردارەکەی یا بەشێك لە کاتی خۆی لە کاردا لە زەوی ئەو دا بەسەر بەرێت بەبێ پاداشتی ڕاستەوخۆ.

لەسایەی سەرمایەداریشدا دەرهێنانی زێدەبایی‌و بوونی چەوساندنەوە کەمتر دیارە چونکە ئەو بەشەی کاتی کارکردن کە پاداشتەکەی نادرێت ڕاستەوخۆ دیار نیە بەڵکو بە شێوەیەکی تیۆری پیشان ئەدرێت بە جیاوازیی لەنێوان کرێ و بەهای بەرهەم هێنراودا.

See also : Alientation ;capitilism; Commmunism ;feudalism ; Mar xism ;so-Cial class ; socilalism.

## تێچوونەکان یا سوودە دەرەکییەکان (التکالیف او المنافع الخارجیة) Externalities

بریتیە لەو تێچوونانە یا ئەو سوودانەی کە ناچنە ژێر ڕکێفی مامەڵەکانی بازاڕەوە لە نێوان بەرهەم هێن و بەکاربەردا. بۆ نموونە کارمەندە هونەرییەکانی فڕۆکەخانە

ژاوەژاوێك دەنێنەوەو دەیسەپێنن بەسەر دانیشتوانی دەوری فرۆکەخانەدا هەروەك چۆن سوودییان بۆ ئەو فرۆشیارە ناوخۆییانە دەبێت کە شت دەفرۆشنە گەشتیارەکانی فرۆکەخانە .لەبەر ئەوەی ئەو تێچوون و سوودانە نەخراونەتە ناو بڕیارەکانی بەرهەم هێنەوە ئەوا سودی بۆ ئەوانەی مەبەستیانە ناتوانرێت بە میکانیزمەکانی بازاڕ گەورە بکرێت. بۆیە حکومەتەکان هەوڵ دەدەن کە بەرهەمهێنانی تێچوونەکان یا سوودە دەرەکییەکان ڕێك بخەن لە ڕێی پەستاوتنی ئەوانەی کە بەدەست ئەم تێچوونانەوە دەناڵێنن.

**See also: public goods ; utility.**

# F

## Fabianism فابینیزم (الفابية)

وەکــو زاراوەیــەکی گــشتی واتــە، هــەر ســتراتیژیەتێك لەپلەبەنـدی و خـۆلادان لەڕوبەڕوبوونەوەی یەکلاکەرەوەدا (ئەم زاراوەیەش لە ناوی سەرۆکی ڕومانی فـابیوس ماکسیمۆس) وەرگیراوە. زاراوەکـەش بەشێوەیەکی تایبـەتی ئامـاژە بـۆ فەلسەفەی کۆمەڵەی فـابیی دەکـات لەبـەریتانیا (کەلەسـاڵی 1884دا دامـەزراوە) کـە پێـی وایـە ستراتیژییەتیگونجاو بۆ سۆشیالیزم بریتیە لەبەکارهێنانی دامەزراوە ڕامیارییـەکان و چوونە ناوەوەی ڕێکخـراوە ڕامیارییـە ئەخلاقییـەکان لـە ڕادا. سـەرەڕای ئـەوەش کـە فابییـەکان لـەڕووی بنـەماوە دژی سـتەمکاریین و گرنگـی دەدەن بەدیموکراسـیزە کردنیدامەزراوە ڕامیـاری و ئابورییـەکان بـەڵام زۆر جـار تاوانبـار دەکرێن بـەوەی کـە سۆشیالیزم بـە ئـامرازێکی کاریگـەر دەزانـن بـۆ بـەڕێوە بردنـی کۆمـەڵیی مەڵەبەنـدی پێویستیەکی ڕاستەقینە بۆبەشداریکردنی دیموکراسی ڕاستەقینە.

فابیزم جەماوەرێکی فراوانی هەیە لـەناوحیزبی کریکـارانی بـەریتانیادا بەتایبـەتی لەرێگـــەی ئـــابرووی دامەزرێنەرەکانیـــەوەو ئەندامـــە یەکەمینیـــەکانیان و پێشنیازەکانیانەوە لەوانەیش و هەر دووهاوسەر (ویب و جۆرج برنادشۆ) .

سەرەڕای ئەوەش کە رێکخراوێکی مونتەمیە هـەر لەسـەرەتای سـەرهەڵدانی حیزبـەوە بەڵام وەك کۆمەڵێکی فشاری رێکخراو کاری نەکردووە لەحیزبی کرێکاراندا. بۆ نموونە، هیچ پێشنیارێکی ڕامیاریی کۆمـەڵی پێـشکەش نـەکردووە بـەحیزب، ڕۆڵـی سـەرەکیی ئەوە بووە کەسەرچاوەی بیرکانە.

See also : Social democracy ; social-
Ism.

## Faction (الفئة) دەستە

بەشێکە لە کۆمەڵێکی گەورەتر کە بریتییە لەپارتێکی رامیاریی و ناسنامەیەکی جیای هەیە کەلە کۆمەڵە گەورەترە کە بەبێ ئەوەی بارێکی رێکخراوەیی سەربەخۆی هەبێت و هەوڵ ئەدات کە ئەو ئامانجانە بەدی بێنێ کە دەتوانرێت لە ئەنجامەکانی رێکخراوە گەورەترەکە جیابکرێتەوە، رەنگە ئەو ئامانجانە کۆمەڵێك رامیاریی دابڕاو و بەرزبوونەوەی ستراتیژیی رامیاریی یا هەڵبژاردنی دیاریکراو بن یا هەڵوێستێکی بیرباوەڕیانەی بەرچاوبن یا بەخشینی کۆمەکی بە هەواداراانی دەستەکە یا بەرزبوونەوەی پیشەیی پێشەوایەکی رامیاریی. رێکخستنی دەستەش لە زۆربەی کاتدا کەمتر رێکخراوە لە کۆمەڵە سەرەکییەکە. بەلام لە ناویدا لە پێناوی ئامانجە گشتییەکاندا هاوکاری دەکات (بۆ نموونە باری دەستەیەك لە پارتێکی رامیارییدا: رێکخستنی هەڵمەتی هەڵبژاردن لە سەر بناغەیەکی یەکخراو و هاوکاری کردن لە دژی پارتەکانی تر یا پشتگیریی کردنی ئایدۆلۆژیایەکی بنەڕەتی) . بەلام ئەگەر ناکۆکییەکانی نێوان دەستە و کۆمەڵی سەرەکی زۆر گەورە بوون ئەوا ئەم هاوکارییە مەحاڵ دەبێت و لەوانەیە دەستە لەم کاتەدا پەیکەرێکی رێکخراوەیی سەربەخۆ هەڵبژێرێت (وەك، حیزبی دیموکراتی کۆمەلایەتی سەربەخۆی چەپڕەوی توندڕەوی ئەڵمانیا لە کاتی شەڕی جیهانی یەکەمدا حیزبە سیاسیەکان بە جیابوونەوەی حیزبی لە وولاتێکەوە بۆ وولاتێکی تر و بە تێپەڕبوونی کات دەگۆڕێت. وە هەندێك حیزبیش (وەك حیزبی دیموکراتی ئازادی ژاپۆنی و حیزبی دیموکراسی مەسیحیی ئیتالی) جۆرێك لە پەیکەری دەستەیی رێکخراوی هەمیشەیی هەیە کە دراوەتە پاڵ کەسێتییەکان نەوەك ناکۆکییەکان سەبارەت بە رامیارییەکان، ئەمەش پەیوەندییە

دەستەیییەکان هـان دەدات. نموونـەی دەسـتە ئازادەکـانیش یـەکێتی خوازەکـانی پەیوەست بە جۆزیـف چـیمبرلین وە لـە کۆتایـەکانی سـەدەی نـۆزدەدا، بیڤینیـست و پاولیستەکان (کە درا بوونە پاڵ ڕامیاری کرێکاری ئێرنست بیڤن و ڕامیاری ئینگلیـزی ئینۆك پاول) لە ژیانی ڕامیاری بەریتانیدا پاش شەڕی جیهـانی دووەم و دەسـتەکانی ناو حیزبـی کـۆنگرەی هینـدی و دەسـتە (واقیعـی) و (بنەڕەتییـەکانی) نـاو پـارتی سەوزی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا.

لە هەر دوو سەدەی هەژدەو نۆزدەدا (دەستە) زاراوەیەك بووە کە لە ڕەخنەدا بـەکار هـاتووەو بەسـەر بەرهەڵـستکاریی ڕێکخـراودا جێبـەجێکراوە بـە تایبـەتی وەك نیشانەیەك لە سەر ئەوەی کە ئەم جۆرە بەرهەڵستکارییە دژی خۆشگوزەرانی گشتی یا بەرژەوەندیی نیشتیمانیە (هەروەك چۆن کە ئەم زاراوەیە لە ئـەمریکا و مـشتومڕە پەرلەمانییە بەریتانیەکاندا بەکار دێت) .

See also : Clientelism ; party.

## Falsification ‏مەیلی پوچەڵکردنەوە (نزعة الدحض)

ئەو بیرو باوەڕەیە کە پێی وایە کە تیۆرە زانستییەکان پێویستە بە شێوەیەکی وا دابڕێـژرێن تـا گریمانـەی ئاشـکراو دیـاری کـراو پیـشکەش بکـەن کـە بتوانرێـت بـە شێوەیەکی لۆژیکی پوچەڵ بکرێتەوە لە ڕێی سەرنجی بۆ جیهانـەوە، بـەم شـێوەیەش ئەگەر بووترێت (قەلەکان ڕەشن) ئەوا ئەمە زانستی نییە چونکە دەکرێت ئێمە قەلی ڕەشی زۆر ببینین. هـەر ژمارەیـەکی دیـاریکراوی سـەرنج ناتوانێـت کـە ئـەم گریمانـە گشتییە دەربـارەی هـەموو قەلـەکان بـسەلمێنێت. ئـەم قـسەیە زانـستییە چـونکە بـە سەرنج دانی قەلێکی سپی پوچـەڵ دەکرێتـەوە، بـەم پێیـەش بەسـودترین تیـۆر ئـەو تیۆرەیە کەبەرزترین پلەی توانای پوچەڵکردنەوەی هەیـە: ئـەوەی کـە گریمانـە هـەرە ڕوون و بوێرەکان بەرهەم دێنێ. زاناکانیش هیوایان وایە کە پـەرە بـەو تیۆرانـە بـدەن کە لە بنەڕەتدا توانایەکی بەرزی پوچەڵکردنەوەیان هەیە، بەڵام لە ڕاستیدا بەرگری لە

هەوڵەکانی پوچەڵکردنەوەی دەکات، ئەو زانستەی کە لە زانستی ساختە جیا دەکرێتەوە کە قابیلی پوچەڵکردنەوە نیە، لە کرداری مەزندە کردن و هەوڵ دان بۆ پوچەڵکردنەوەوە بە ڕاستییەکی جێگیرکراو ناژمێردرێت چونکە مانەوەی بەندە بە ڕادەی ئەو لێزانییەی کە زاناکان پیشانی ئەدەن لە کاتی ڕێکخستنی هەڵبژاردنەکان و ڕاستیی ئەو کۆمەڵە گریمانەیەی کە پێویستە لە پشت ئەو هەڵبژاردنانەوە هەبێت.

ئەم زاراوەیە هاوواتای کاری کارل پۆپەرە کە زۆر جار زاناکانی ڕامیاریی وای پیشان ئەدەن کە ستایشی بیرەکانی دەکەن ئەو تیۆرانەی کە پێویستییەکانی ئەم بیرانە بەدی دێنن دەگمەنن.

**See also :Explanation ; hypothesis ;
Law (a) : scientific law ; positivism ;
Scientific method ; theory ;verifica-
tion.**

## Facism فاشیزم (*الفاشية ـ الفاشستية*)

بیروباوەڕێکی ڕامیارییە کە لە بنەڕەتدا لە بزوتنەوەی فاشیستی ئیتالییەوە وەرگیراوە بە سەرکردایەتیی بنیتۆ مۆسۆلینی کە لە ساڵی 1922 دا دەسەڵاتی گرتووەتە دەست. ئەم نموونە ئیتالیەش ڕاستەوخۆ کاری لە بزوتنەوە ڕامیارییە لێکچووەکانی لە ئەڵمانیا کردوە (بە تایبەتی بزوتنەوەی نیشتیمانی سۆسیالیستی _ نازیزم _ یا ئەو حیزبەی کە هەمان ناوی هەیە) هەروەها لە ئیسپانیا و فەرەنساو بەریتانیاو وولاتانی تری ئەوروپا. هەندێك بزوتنەوەی تریش سەریان هەڵداوە کە بنەمای لێکچووی حیزبە فاشیەکانیان هەبووە پێش شەڕ لە زۆر دەوڵەتی پیشەسازیدا لە شەڕی جیهانی دووەمەوە.

پێویستە بنەما سەرەکییەکانی فاشیزم لە ڕامیارییەکانی بزوتنەوەکان و چالاکییەکانیانەوە هەڵبێنجرێت چونکە زۆر بەدەگمەن دەربڕینی یەکانگیری

بیروباوەڕی فاشی هەیە (بە پێچەوانەی ئەو زمانە قەبەیەوە کە سەبارەت بە ئامانج و رامیارییە هەلپەرستەکان قسەی پێدەکرێت) ئەو جۆرە بنەمایانەش شێوەیەک لە نەتەوە پەرستی توندڕەوانە لە خۆ دەگرن لە هەندێک باردا نەک لە هەموویدا کە خۆی لە ڕەگەزپەرستیو دژایەتیی سەرسەختی کۆمۆنیزمدا نواندوە لەگەڵ دژایەتی کردنی دیموکراسیەتی پەرلەمانی و لیبرالی و ئابوری و بازاڕ و شکۆدار کردنی پێشەوا بە شێوەیەک کە ویستی ئەو بە یاسا دادەنرێت و ڕژێمی دەوڵەتی بە دیسپلین کە تێیدا کۆمەڵە دووەمییەکان دەخرێنە ژێر رکێفی بزوتنەوە یا حیزبەوە. بانگەوازە رامیارییە میللیەکان و سازدانی خۆپیشاندانی جەماوەریی بۆ دەرخستنی پشتگیریی.

رامیاریی دەرەکی فراوانخواز لە ژێر ناوی خۆپاراستنی نیشتمانی و چاک کردنی ئابوریدا. هەندێک جاریش شکۆدارکردنی کلتوری رابوردوی ئەفسانەیی لە باتی کلتوری بۆرژوازی کۆمەڵگای نوێ.

لەڕاستیدا ویەڕاشکاوی بیروباوەڕێکی (نا ئەقلانی بووە) لەمەشدا دژایەتی کردنی بۆ مارکسیزم بە ئاشکرا دیارە) و پیداگرتنی لەسەر هەست و سۆز وەک هێزی کۆمەلآیەتی و بەرزکردنەوەی (ویستی) پێشەوا بۆ ئاستی یاسای پیرۆز لەگەڵ ئەم جیاوازییەشدا لەگەڵ مارکسیزمدا، چاودێرەکان تێبینی ئەوەیان کردووە کە لێکچونێکی سەرەکی هەبووە لە نێوان ئەو ڕێگە رامیارییانەدا کە ڕژێمە فاشی و کۆمۆنیستییەکان بەکاریان هێناوە بۆدەست خستنی هێزو پیادەکردنی و ڕێکخستنەوەی.

سەرەرای ئەوەش کە هەندێک لە لێکدەرەوەکان (بەتایبەتی مارکسییەکان کە بە دەربڕینێکی توندی بەرژەوەندییە سەرمایەدارییەکانیدا ئەنێن و دژی چینی کرێکارە) ئەوا وەک بیروباوەڕێک وەک دژی هەموو چینەکان دەرکەوتووەو بە هەڵوەشێنەری ئەو دەوڵەت و کۆمەڵگەیەی داناوە کە فاشیزم بانگەشەی بۆ کردووە. هەندێک لێکدەرەوەی تریش فاشیزمیان وەک دیاردەیەکی مێژوویی داناوە کە ناتوانرێت لێک بدرێتەوە تەنها لە ڕێی بارو دۆخە ئابوری و کۆمەلآیەتیە تایبەتیەکانەوە نەبێت لە

ساڵەکانی نێوان هەر دوو جەنگە جیهانییەکەدا. ئەمەش بێگومان بەسەرهەموو بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی پارەگەزی یا دژی کۆمۆنیستی دا ناچەسپێت یا حیزبێك لەو چەشنە لە سەدەی بیستەم دا، ڕەنگە گونجاویش نەبێت بۆ وەسفکردنی وردی هەر کۆبونەوەیەکی ڕامیاریی – ڕاسترەوی گرنگ لەگەڵ ئەوەشدا کە هەندێك سستمی حوکمی بەیرونی لەئەرجەنتین (1946-1955) دادەنرێت بەگەورەترین پێوەرەکانی سیستمی فاشیستی، گومانیشی تێدا نیە کەسیفەتی (فاشی) بە بەردەوامی خراپ بەکار دەهێنرێت وەکو زاراوەیەکی لاقرتێ پێکردن بۆ رەخنە گرتن لە رکابەرە ڕامیارییەکان و بەتایبەتیلە لایەن کۆمەڵە چەپە توندڕەوەکانەوە و لەم بەکار هێنانەدا زاراوەکە بەتەواوی سودە کەی وون دەکات وەکو پێناسەیەك بۆ جیارکردنەوەی جۆرێکی دیاریکراو لەبزاوتێکی ڕامیاریی.

سەرەڕای شکۆدارکردنی ڕابوورد فاشیزم فاشیزم بەهێزێکی نوێکەردا دانراوە لەزۆرێك لەو دەوڵەتانەی کە دەسەلآتیان بەهێز بووە تێیدا بەرەنگار بوونەوەی بەرژەوەندییەکان و رێکارە تەقلیدییە چەسپاوەکان و هەستێکی بەهێزی پێشکەش کردووە بۆ پێناسی نەتەوەیی و جەختیکردووە لەسەر رێکخستنێکی کۆمەلآیەتی وورد.

See also :Corporatsm (a) :ideology ;
Movement ; social class ; cociety ;
Stste ; totalitarianism.

## یەکگرتن – دەوڵەتی یەکگرتوو *(الاتحاد - الدولة الاتحادیة)* Federation

دەوڵەتێکە کەتێیدا حکومەتێکی مەرکەزی و کۆمەڵێك حکومەتی هەرێمی هەن کە هەر یەکێك لەم دوو ئاستە لەفەرمانڕەوایدا سەربەخۆن لەبوارەکەیاندا، زۆرجاریش ئەمە بەپێی دەستورێکی نوسراو دەبێت کە پارێزگاریی لێ دەکات.

ئــەم دەســتورە تایبەتمەندییــەکانی هــەر دوو ئاســتەکەی حــوکمی تێــدا ڕووندەکرێتــەوە هــەروەها ڕێوشــوێنەکانی ڕێکخــستنەوەکانی تایبــەتکردنی ئــەو دەسەلآتانەیکەماون دادەنێت لەگەڵ ڕێکخستنی بەیەکاچوونی تایبەتمەندییەکان جگە لەبەخشینی لێپرسراوێتی دادوەریی بە دادگایەکی دەستوریی یا دامەزراوەیەکی تر بـۆ وەرگرتنـی بڕیـارە تەوزیمیـەکان کاتێـك کـە ململانێکـانی سـەبارەت بـە لێکدانـەوەی دیـاریکردنی دەسـتوریی دەسـەلآتەکان سـەر هەڵـدەدەن. ئەنجومـەنی یاسـادانانی نیشتیمانی لە دەوڵەتی فیدراڵیدا ئەنجومەنێکی تر لە خۆ دەگرێت کـە بـە شـێوەیەکی ڕاستەوخۆ و یەکسان هەرێمە پێك هێنەرەکانی دەوڵەتی فیـدراڵی تیایـدا نوێنەرایـەتی دەکرێت (پێی دەوترێت هەرێمە کانتۆنیەکانییەکان یـا کۆمارەکـان یـا ویلایەتـەکان) هەر دوو ئاستەکەی حوکمیش دەسەلآتی سەپاندنی باج و یاسایان هەیە پلەو شێوازی مەیلی فیدراڵ جیاوازییەکی گەورەی هەیە لە نێوان دەوڵەتە فیدراڵیەکاندا. سویسرا و ئەمەریکا بە دوو وولآت دەژمێردرێن کە مەیلی فیدراڵی تێیاندا بەهێزە و ئوسـتوراليا و بەرازیل و کەنەدا و ئەڵمانیا و هیند نموونەی گرنگی تـری دەوڵـەتی فیـدراڵن. هەنـدێك لەو دەوڵەتانەش دەستوری فیدراڵییان هەیـە بـەلآم لەبـەر هـۆی جیـاواز (وەك ڕۆڵـی ڕامیاریی زاڵی حیزبێکی بنەما ئایدۆلۆژی وەك یەکێتی سـۆڤیەتی پێـشوو) لـە بـواری پراکتیکدا بە دەوڵەتی فیدراڵ دانانرێت.

شێوەی فیدراڵی دەوڵەت لەبـەر چـەند هۆیـەك پەرەدەسـەنێت، لەوانـە پێویـست بوونی یەکانگیرکردنی کۆمەڵە ڕەگەزی و زمانی و ئاینییەکان یا کۆمەڵی تر کە لەسـەر ئاستی هەرێمی دیاری دەکرێت (وەك هیندو سویسرا) یا بۆ ئـەوەی هێـزی ڕامیـاریی زیاد لە پێویست نەسەپێنرێت (وەك ئەڵمانیای فیدراڵ) .

See also :Confederation ;devolution.

## خۆراكپێدانی گەڕاوە (التغذية الاسترجاعية) Feedback

چەمكێكە كە ڕێبازەكانی ڕێكخستن و پەیوەندییەكان لەشیكردنەوەی ڕامیاریدا سوودی لێ وەردەگرن و زاراوەیەكە بۆ وەسفكردنی كرداری گەیاندنی زانیاری دەربارەی سیستمێكی ڕامیاریی یا ڕەگەزێكی دیاریكراو تیایدا دەربارەی ژینگەی سیستمەكە بۆ پەیكەرەكانی ناوی بە شێوەیەك ڕێڕەوەی ئایندەیی ئەو پەیكەرانەی وەك ئەنجامێكی ئەو كردارە تیایدا ڕاست دەكرێتەوە.

كەناڵی خۆراكدانی گەڕاوە بریتیە لە هەر ئامرازێك كە دەتوانرێت ئەو زانیاریانە بەناویدا تێپەڕبن كە دەربارەی باری سیستم یا پەیكەرێك تێیدا بۆ پەیكەرێكی تر كە توانای ڕاستكردنەوەی ڕەفتاری سیستمەكە یا هەر یەكێك لە پەیكەرەكانی هەیە. كەناڵەكانی خۆراكپێدانی گەڕاوە لە پەیكەری سازێنەری سیستمەدا كۆ دەبێتەوە تا گرێكانی خۆراك پێدانی گەڕاوە پێك بهێنێت:

بازنەكانی كەناڵەكانی زانیاری كە زانیارییەكان بە ناویدا دەگوێزرێتەوە سەبارەت بەباری پەیكەرێك لە سیستمەكەداوئەو كەناڵانەی كە زانیارییە وەڵامیەكانی پێدا دەگوێزرێتەوە بۆ سازدانی باری ئەو پەیكەرە. ڕەنگە جۆری پەیوەندی كردنی نێوان بنكەی حیزبێك و ڕێكخراوەكانی كە گریی خۆراكدانی گەڕاوە پێك دێنن وەك نموونەیەك بێت.

**See also: Functional explanaation ;**
**Overload (b) :communications overload ;**
**Political system ;systemanalysis.**

**Feed bach channel See : feed back .**

**Feedback loop See : feedback.**

## بزوتنەوەی بەخشینی مافەکانی ئافرەت (فیمینیزم) (*حرکة منح حقوق المرأة*) Feminism

بیروباوەڕێکە بریتیە لە بایەخدان بەیەکسانی ئافرەت لە کۆمەڵگاداو هەوڵدان لەو پێناوەدا لەسەر بناغەی ئەو گریمانەیەی کە ئافرەت بەیەکسانی لەگەڵ پیاودا ڕەفتاری لەگەڵ ناکرێ ونەکراوە . ئەم بزوتنەوەیە لە مێژوودا بەستراوە بە خەبات لە پێناوی مافەکانی دەنگداندا (بزوتنەوەی هاوشێوە لە ئەمەریکا و فەرەنساو ئەڵمانیا وەك نموونە) و لابردنی بەربەستە یاسایی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەکانی بەردەم یەکسانی ئافرەت لە کۆمەڵدا.

بزوتنەوەی بەخشینی مافەکانی ئافرەتی هاوچەرخ ژمارەیەك لایەنگری دەستەی پەیوەندییە چینایەتیەکان و چەوساندنەوەی ئابوری هۆی جیاوازی کردنن لە نێوان ئەو دوو ڕەگەزەدا و ململانێ ی چینایەتی باشترین دەرفەتە بۆ دەست خستنی مافەکانی ئافرەت و ئازادیخوازەکان کە پێ دادەگرن لەسەر تەوژمی لیبرالی لە بواری یەکسانی لە نێوان تاکەکاندا لەڕەگەز و تۆخم و بیروباوەڕ .. هتد ئەوانەی کەپێیان وایە کە گۆڕینی دەزگایی ڕێگەیەکە بۆ بەدی هێنانی ئەم یەکسانییە. چەندین جۆری جیاوازی بزوتنەوەی بەخشینی مافەکانی ئافرەتی ڕادیکاڵ هەیە کە هەندێکیان وای دەبینن کە پەرەسەندنی سەربەخۆیی ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییە ئافرەتییەکان تەنها ڕێگایە بۆ لە ناو بردنی بەربەستە ژیانییە سەرەکییەکان (کە نەدەزگاکان و نە گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکان ناتوانن ڕاستی بکەنەوە) لەبەردەم ئەو یەکسانیەی ئافرەتدا کە لایەنە ڕامیارییەکانی بواری تایبەت و کەسی پەیوەند بەخەمەکانی بزوتنەوەی بەخشینی مافەکانی ئافرەتی چەسپاندووە.

بزوتنەوەی بەخشینی مافەکانی ئافرەت وەك هێزێکی ڕامیاریی سەربەخۆ کاری کردوە لەزۆر وولآتدا بەڵام لە هەمانکاتدا پەیوەند بووە بە چەندین حیزب وگروپی ڕامیاریی جیاوازەوە (حیزبە سۆسیالیستییەکان و سەوزەکان و بزوتنەوەی ئاشتی

..) چاكسازییە ڕامیارییەكان (مافەكانی دەنگدانی ئافرەت و حوكمە دەستوری و یاساییەكانی یەكسانی نێوان هەر دوو ڕەگەزەكە وەك نموونە) و گۆڕانكارییە كۆمەڵایەتیەكان (دەرفەتی باشتری خوێندنی باڵا و لابردن یا كەمكردنەوەی بەربەستەكانی بەردەم ئافرەت و بڵاوبونەوەی ئامرازەكانی ڕێگری سك پڕی)،لە ڕاستیدا پەرەسەندنە ڕۆشنبیرییەكان هانی گەشەكردنی بزوتنەوەی بەخشینی مافەكانی ئافرەتیان داوە تەنانەت دوای ئەوەش كە زۆر وولات زۆریەی ئامانجە ڕاستەوخۆكانی بزوتنەوەكەیان بەدی هێناوە ئەمەش بووەتە هۆی پێداگرتن لەسەر مافە گرنگەكانی ئافرەت لەزاوزێدا (كێشەی ڕێگەدان بە لەناو بردن) و بڵاوكردنەوە یا پەخشی بابەتە ڕووتەكان.

See also :Movement.

## Feudalism (دەرەبەگایەتی ــ فیوداڵیزم ــ (الاقطاعیة))

ڕژێمێكی ڕێكخستنی كۆمەڵایەتییە لە ئەوروپادا لە نێوان ساڵانی 900 تا 1500 و لە ژاپۆن لەبەشی دوایینی سەدەی نوزدەدا سەری هەڵداوە، ڕژێمی دەرەبەگایەتی بەوە دەناسرێت كە ئابورییەكەی پشت بە بەرهەم هێنانی كشتوكاڵی دەبەستێ و كۆمەڵێك تۆڕی ئاڵۆزی ماف و پابەندبوونی ئاڵوگۆڕكراوی لە خۆ گرتووە لە نێوان هەرەمێك لە چینەكان سەبارەت بە مەسەلەكانی خاوەنداری زەوی و خزمەتی سەربازیی و دادپەروەریی و نیزامدا. حوكمی پاشایی لاواز و ئەرستۆكراتیەتی خاوەن زەوی كە مافی ڕێپێدراوی هەیە بە پێی مەزەندەی خۆی و لە بوارەكانی خۆیدا، جووتیارە كۆتكراوەكان لە بواری ئازادیی جوڵەو دانی كریی دەرەبەگانە لەشێوەی كار یا بەرهەمی كشتوكاڵی یا بڕی پارە یا تێكەڵێك لەمانە.

هیچ كۆمەڵگەیەكی پەیوندیی دەرەبەگی ڕووت لە بەشەكانی ئەوروپای ڕۆژهەڵاتدا دەرنەكەوتووە بۆ نموونە،بزوتنەوەی دەستی كاركەرە پەیوەندییە بازرگانییەكان و چینی بازرگانی گەشەكردوو بەزەقی دیار بوون لە سەردەمی دەرەبەگایەتیدا.

پەرەسەندنی ئەم ڕواڵەتانەش سەربارى بارودۆخە ئابورى و سەربازییەکانی تر بوونە هۆی گواستنەوە لە دەرەبەگایەتیەوە بۆ دەوڵەتی نوێ و کۆمەڵگای بازرگانی.

See also : Capitalism ;industrial socie-
Ty ; state.

**Filibuster** **گوتاری درێژی لەکار خستن** (*الخطبة الطويلة التعطيلية*)

ووتارێکی درێژی نائاسابیە کە ئەندامێکی پەرلەمان دەیدات بۆ ئەوەی ڕێ لە هەندێك کار بگرێت. ئەمە لە ئەنجومەنی پیران و ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمەریکا داو لە ئەنجومەنی گشتی بەریتانیادا باو بووە، لەگەڵ ئەوەشدا کە بڕار کردنی ڕێساکانی ناو ئەو ئەنجومەنانە بۆ دیاریکردنی ماوەی ووتاردان یا کۆتایی پێ هێنانی بەهۆی پێشنیازەکانی یاسادانەرەکانی تر وای لە ووتاری درێژی لە کارخستن کردووە کە کەمتر بتوانێ ڕێ لەکارەکان بگرێت.

**Franchise** (*حق التصويت*) **مافی دەنگدان**

بریتیە لەمافی تاك یاکۆمەڵی یاسایی بۆ دەنگدان لە هەڵبژادنەکاندا. فراوانکارییەکانی مافی دەنگدان بۆ دەرەوەی چینە خاوەندارەکان و ژنان و ئەو کەسانەی کە دەگەنە تەمەنی هەژدە ساڵی قۆناغەکانی دیموکراتیزە کردنی مافی دەنگدان بووە لە بەریتانیادا.

See also : Civil rights.

**Free Trade** (*التجارة الحرة*) **بازرگانی ئازاد**

بریتییە لەئاڵوگۆڕی نێو دەوڵەتیی شمەك و خزمەتگوازارییەکان کە کردارەکانی پاراستن نابێتە ڕێگری (وەك بەربەستە گومرگییەکان و پاڵشت کردن وبەشەکانی

هاوردن و ڕێنماییه کارگێڕییه توندو بژارکەرەکان به شێوەیەکی زیاد لە پێویست بە باشتر زانینی ناوخۆیی لە کاتی بەخشینی گرێبەندە حکومیەکاندا) کە بۆ ئەوە دانراوە کە بەرهەم هێنە نیشتیمانییەکان بە باشتر بزانێو لە کێبەرکێی بیانی بیان پارێزێت، ئەوانەی بانگەشەی بازرگانیی ئازاد دەکەن پێیان وایە کە ئەمە سودە وەرگیراوەکانی تایبەت بوون لە بەرهەمهێناندا مەزن دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەندێك لەئابوری ناسەکان ووتویانە کە کردارەکانی پاراستن لە هەندێك بارودۆخی تایبەتدا سودی هەیە، لەو لاشەوە مەسەلەیەکی تر هەیە کە مایەی مشتومڕە ئەویش بەشی ئەو سودەیە کە ووڵاتەکان بەدەست دێنن بە تایبەتی ئەو ووڵاتانەی ئەمریکای لاتینی، وەك نموونە) کە پشت بە بەرهەمهێنانی مادە خاوەکان و ناردنە دەرەوەیان دەبەستێت، لایەنی ڕاست و هەڵەی ڕای ئابوری ناسان هەر چۆنێك بێت ئەوا هۆی ڕامیاریی بەهێز لە ئارادایە بۆ پاراستنی کەرتێك یا هەرێمێك.

زۆربەی ووڵاتەکان ئێستا ئەندامن لە هاوپەیمانی یا یەکێتییەکی گومرگی یا زیاتردا ئەمەش زیاتر ڕێگە بەبازرگانی ئازاد ئەدات لە نێوان ئەندامەکاندا لەگەڵ دانانی بەربەست لەبەردەم ئەوانەی کە ئەندام نین. هەوڵی گشتیش دەدرێت بۆ ڕێکخستن و کەم کردنەوەی پاراستن لە ڕێگەی ڕێکەوتنی گشتی تاریفەی گومرگیو بازرگانییەوە.

**See also: Dependency theory ; inter-Ventionism ; liberalism .**
**Function See :Functional explana-Tion.**

## Functional Explanation ڕاڤەکردنی فەرمانی *(التفسیر الوظیفی)*

بریتیە لەڕاڤەکردنی دیاردەیەك بە ئاماژەکردن بۆ شوێنەوارێك کە ئەو دیاردەیە دروستی دەکات کە ڕەنگە ئەو شوێنەوارە مەبەستدار نەبووبێت بەلای ئەوانەوە کە

پەیوەندیدارن، بۆ نموونە ڕەنگە درێژی ملی زەڕافە بەوە لێك بدرێتەوە كە ئاماژە بەوە بكرێت كە ملی درێژ وای لێ دەكات كە گەڵای درەختەكان بخوات و لێرەدا هیچ سوورپوونێك نادرێتە پاڵی تەنها ئەوە نەبێت ملی درێژ فەرمانێكی گرنگ بەجێ دێنێ بۆ مانەوەی بونەوەرەكە. بەهەمان شێوە بوونی شێوەی ئازادی دیموكراسی لەدەوڵەتدا ڕەنگە بەوە ڕاڤە بكرێت كە ئاماژە بە توانای ئەو جۆرە دەوڵەتانە بكرێت لە پاڵپشت كردنی بەرژەوەندییەكانی چینی سەرمایەداریدا. دەتوانرێت بووترێت كە ئەم ڕاڤەكردنە بریتی نیە لە هەوڵی چینی سەرمایەداری بۆبەدی هێنانی بەرژەوەندییەكان بەڵكو بەدەست هێنانی بەرژەوەندییەكان فەرمانێكی پێویستە بۆ بەردەوام بوونی ڕژێمەكە و هێز یا میكانیزمێكی ترە كە كارەكەی بەجێدێنێ. لەهەر دوو نمونەكەدا وا دەردەكەوێ كە هەر هێزێكی لێكدانەوەیی ئەگەر لە سووربوون یا مەبەستێكەوە وەرنەگیرابێت ئەوا پێویستە كە پشت بە ئاماژەیەكی دیار یا شاراوەی كرداری هەڵبژاردنێك ببەستێ كە كار لە ڕژێمەكە دەكات.

نموونە بایۆلۆژییەكانی ڕاڤەكردنی فەرمانی بەشێوەیەكی گشتی پشت بە تیۆری هەڵبژاردنی سروشتی و یاسای مانەوە بۆ گونجاوتر دەبەستێ هەروەك چۆن خستنەگەڕی گونجانی ئەم میكانیزمانە كێشەی گەورە دروست دەكات لە سۆسیۆلۆژیادا، بۆیە ڕاڤەكردنە فەرمانییەكان زۆرجار بە ناتەواو دەژمێردرێن بەشێوەیەكی جەوهەری یا ناڕاڤەكردنی.

ڕاڤەكردنی فەرمانی هەندێك جار ڕەخنەی ئاراستە دەكرێ بەهۆی ئەو مەیلە وادانراوەی كە هەیەتی بۆ فەرامۆش كردنی هێز و ململانێ لەكاتی مامەلەكردندا لەگەڵ دەزگاكاندا بەوەی كە ئەمە هاوبەشییە لە ڕێكسازیكردنی ڕژێمدا، لە كاتێكدا ڕەنگە ئەمە تەنها ڕەخنەیەك بێت بۆ هەندێك نووسەران بە تایبەتی ئەوانەی كە پێیان وایە كە هەموو لایەنەكانی كۆمەڵگا دەكرێ و دەبێ كە لە ڕێی هاوبەشیی فەرمانییەوە ڕاڤە بكرێت بەلام لەهەمان كاتدا دەبێت وەك مەیلێكی جەوهەری ڕاڤەكردنی فەرمانی مامەڵەی لە گەڵدا نەكرێت. بۆ نموونە ناكرێت ڕێكس بەوە تاوانبار بكرێت كە پێی

لەسەر ڕێکی دادەگرێت و هێز و ململانێ فەرامۆش دەکات، بەڵام دەتوانرێت کە مەڵبەندێتیی ڕاڤەکردنی فەرمانی لە نوسینەکانیدا تێبینی بکرێت.

لەولاوە گرفتێکی گشتی تر هەیە کە پەیوەندییەکانی نێوان (فەرمان) و (ڕژێم) دەیوروژێنێت. لە ڕاستیدا دیاریکردنی فەرمانەکان مانایەکیان نییە تەنها بە ئاماژەکردن بەو ڕژێمە نەبێت کەتێیدا و بۆی فەرمان بەجێدەهێنێت.

وەسفکردنی وردی ڕژێمی کۆمەڵایەتی یا ڕامیاریی، کە سنوری نێوان ڕژێم و دەوروبەری بە شێوەیەکی ئاشکرا دیاری دەکات کارێکی زەحمەتە، ئەگەر ئەم وەسفکردنەش نەبێت ئەوا دیاریکردنی فەرمانەکان و بە جێگەیاندنیان هێزی ڕاڤەکردنی نابێت ولەباری پەرگیریدا بێ مانا دەبن. (فەرمان) لە سۆسۆلۆژیادا لە بنەڕەتدا بریتییە لەپابەند بوونێکی بەهێز بە ڕاڤەکردنی کۆمەڵایەتیەوە لە شێوەی فەرمانی دا و لەم چل ساڵەی دواییدا زاراوەکە وای لێهاتووە کە بەڕوونی بە مانای ئەوە دێت کە بریتییە بێ لەهەر ڕێبازێك کە لە دەزگا و کارکردنەکان دەکۆڵێتەوە لە ڕووی ئەنجامەکانی لەسەر ڕژێمی کۆمەڵایەتی جا ئەو ئەنجامانە بەکار بهێنێ یان بەکاری نەهێنێ بۆ ڕاڤەکردنی دەزگاکە یا کارکردنەکەی .

ئەو فەرمانانەی کە ئەندامەکانی ڕژێمەکە دانی پێدا ئەنێن لانی کەم هەندێك جار وایان پێدەوترێت کە بریتین لە فەرمانی (ئاشکرا) و فەرمانە ناتایبەتی و بێ مەبەستەکانیش بە (شاراوە) ناو دەبرێن و ئەو فەرمانانەش کە یارمەتی شێلگیریی و گونجاندن دەدەن بە (فەرمانی) ناوزەد دەکرێن.

**See also :Explanation ; structural-Functional analysis ; teleological expal-Nation ;variables.**
**Functional representation See : Rep-Resentation.**

# G

## Game Theory (*نظرية المباريات*) تیۆری یارییەکان

ئەم تیۆرە چەندین جار بە تیۆرێکی (ئابوری) لە رامیاریی دا ناو دەبرێت بەڵام لە راستیدا لە لقێکی بیرکارییەوە سەرچاوە دەگرێت نەك ئابوری. بۆیە ئامرازێك دەخاتە ڕوو کە بە هۆیەوە دەتوانرێت بڕیارە ستراتیژیەکان بدرێت و شیبکرێتەوە.

سیناریۆیەك دادەنرێت کە ئەنجامەکەی بەندە بە هەڵبژاردنەکانی هەر یاریزانێك یا چەندین یاریزان. ئەو یاریزانانە هەڵبژاردنی ئەقڵانی دەگرنە بەر لەناو ستراتیژەکاندا وەك هەوڵدانێك بۆ گەورەکردنی قازانجەکان یا بەدیهێنانی بە باش زانینی پلەیەك.

شیکردنەوەکەش بە شێوەیەکی تایبەت بەرەو دیاریکردنی چارەسەرێك و ڕوون کردنەوەی ئاراستە دەکرێت: ئەو ئەنجامەی کە لە هەڵبژاردنی هۆکارە ئەقڵانییەکانەوە بە دەست دێت. لەوانەیە تیۆری یارییەکان شێوازی بیرکاریی ئاڵۆز لە خۆ بگرێت بەڵام ناوەڕۆکی زۆربەی یارییەکان کە لە شیکردنەوەی رامیارییدا ئاماژەیان پێ دەکرێت دەتوانرێت کە بە شێوەیەکی ساکار تر دەربڕێن. ئەو یارییەی کە ناوی (سەرسامی زیندانییەکانە) هەندێك ڕواڵەتی سەرەکی ڕوون دەکاتەوە: دوو زیندانی دەخرێنە دوو ژووری جیاوازەوە و ناتوانن پەیوەندی بەیەکەوە بکەن. کاتێك کە چەکی نایاساییان هەڵگرتووەو گیراون کە ئەمەش تاوانێکە کە سزاکەی رەنگە ساڵێك زیندانی بێت. گومانیش دەکرێت کە دزیی چەکدارانەیان ئەنجام دابێت بەڵام داواکاری گشتی تەنها چەند بەڵگەیەکی ناتەواوی لەبەر دەستدایە کە بەس نیە بۆ زامن کردنی دەرکردنی بڕیاری تاوانبارکردنێك بەم تۆمەتە. لەم حاڵەتەدا هەر یەکەیان مەرجێك دەخرێتە بەردەمی: (ئەگەر دان بنێیت بەوەی کە تۆ لەو دزییەدا تێوەگلاوی هاوکارەکەشت

دانی پێدا نەنێ ئەوا بەر ئەدرێیت و بێ تاوان دەبیت لە کاتێکدا هاوکارەکەت بەتەواوی بەر پرسیار دەبێ و ڕەنگە دە ساڵ حوکم بدرێت. بەلاّم ئەگەر هاوکارەکەت دانی بەوەدا ناو تۆ دانت پێدا نەنا ئەوا تۆ بەو سزایە حوکم دەدرێیت و هاوکارەکەت بەر ئەدرێت. ئەگەر هەر دووکیشتان دان تان بە دزییەکەدا نا ئەوا حوکمێکی سوکتان بەسەردا دەدرێت و ئەگەر هیچکامیشتان دانتان پیا نەنا ئەوا هەردووکتان بە سزایەکی سووك حوکم ئەدرێن) دەکرێت یارییەکە بەم شێوەیە پیشان بدرێت:

زیندانیی (ب)

| | دان پیانەنان | دان پیانان |
| --- | --- | --- |
| دان پیانەنان | -1، -1 | 10 – سفر |
| زیندانی (ا) دان پیانان | سفر، -10 | -6، -6 |

هەر یاریزانێکیش بۆی هەیە کە دان پیانان و دان پیانەنان هەڵدەبژێرێت، بۆیە چوار ئەنجامی هاوبەش لە ئارادا دەبێت کە بە چوار سندوق دەنوێنرێت. هەر سندوقێکیش ئەنجامی هەڵبژاردنی هەر یاریزانێکی (ا، ب) تیا دەبێت. ڕەنگە ئەنجامەکانی بە پیی سودە سەرەکییەکان بنوێنرێت (وەك سەرەوە) یا بە پێی وردەکارییەکانی هەر یاریزانێك ڕێك بخرێت یاریەکانیش بە پیی تایبەتمەندیی دیاریکراو پۆلێن دەکرێن، کۆمەڵی سفر و کۆمەڵی نا سفر، کۆی جێگیرو کۆی گۆڕاو و هاوکارو نا هاوکار.

سەرسامی زیندانییەکان، کۆمەڵەی سفر، (هەر جوتێك ئەنجام یەکسان نیە بە سفر بۆیە یاریزانێك نایباتەوە بە دۆڕانی یاریزانەکەی تر) . کۆمەڵی گۆڕاویش بریتییە لە جیاواز بوونی ئەو سەرجەمانەی کەلە هەڵبژاردنێکەوە بۆ هەڵبژاردنێکی تر بەرهەم دێن ناهاوکاریش بریتییە لەوەی کە هەر دوو یاریزانەکە ناتوانن پەیوەندی بەیەکەوە بکەن یا ڕێکەوتن ئەنجام بدەن لە نێوانیاندا. ئەم یارییە وەك گرفتێکی گرنگ وایە و

هەر زیندانییەك بۆی دەردەکەوێت ئەگەر ئەوی تریش دانی پێدا بنێ یان نا، ئەوا دەتوانێت کە سزای دان پیانان کەم بکاتەوە (لە ساڵێکەوە بۆ سفر یا لەدە ساڵەوە بۆ شەش ساڵ) بۆیە بە شێوەیەکی تاکی شیاوە ئەگەر هەر دووکیان دانی پێدا بنێن، بەڵام ئەگەر ئەمەیان کرد ئەوا ئەو ئەنجامە باشەیان بە دەست ناهێنن بە شێوەیەکی هاوبەشی و هەریەکەیان شەش ساڵ زیندانی دەکرێن نەك یەك ساڵ و هەمان ئەنجامیش ڕوو دەدات ئەگەر پەیوەندیش لە نێوانیاندا ڕوو بدات بە شێوەیەك کەکەسیان بڕوا بەوی تریان ناکەن لە بڕیاردانی هەڵبژاردنی هاوکار بە هاوکاری نەکردن ئەگەر هەر دوو یاریزانەکەش بەشدارییان کرد لەو یارییانەدا ئەوا دەکرێت کە ستراتیژیەتی هاوکاری بە شێوەیەکی ئەقلانی بگرنە بەر. بە پێچەوانەی ئەمەشەوە پێویستە بازنەیەکی ڕێکەوتنی بسەپێنرێت. هاوکاری هاوبەش سودێکی گشتییە کە لەم چوار چێوەیەدا کاری خۆویست ناداتە تاکە ژیرەکان.

باوەڕ وایە کەیاریەکان وەك زۆر باری تری ناو ژیانی ڕامیاریی وایە کە تیایدا بەباشتر زانینەکانی ڕەگەزەکان بە شێوەیەکی لەیەك چوو پێکهێنراون: ڕاگرتنی خۆویستی داواکردنی زیاد کردنی کرێ و دانوستانەکانی ئاگر بڕو سنوردارکردنی خۆ چەکدار کردن و زیادەڕەویی لەبەکار بردنی سەرچاوە سروشتییەکاندا، کاری هەرە گرنگیش بریتییە لە پێویستی بوونی دەوڵەت خۆی.

لایەنەکانی هێز لە تیۆری یارییەکاندا هاوتەریبە لەگەڵ لایەنەکانیلاوازیی تیایدا. چونکە ڕێگە بە شیکردنەوەی توندی هەندێك لە ڕواڵەتەکانی هەڵبژاردنی ستراتیژی ئەدات، بەڵام وا دەردەکەوێت کە تەنها پوختەیەکی ساکارو وێنەیەکی داخراو دەدات بە دەستەوە کە پێویستە بە شێوەیەکی ناتەواو هاوشێوە بێت بۆ ئاڵۆزکردنی وەرگرتنی کردارییی بڕیارەکان و کرانەوەیان.

**See also : Bargaining theory ; coalition; Conflict approach ; decision-making Analysis ;side payment ; simulation ; Public goodds ;rational choice analysis ; Utitlity.**

**Gaming See : Simulation.**

**چاودێرەكانی دابین كردنی خزمەتگوزارییە گشتییەكان یا ڕێكخراوە ناوەندەكان**

## Gatekeepers (*مراقبوا تامين الخدمات العامة او المنظمات الوسيطة*)

دوو جۆری پەیوەند بەیەكەوە هەن بەڵام جیاوازن. لە تیۆرەكانی بیرۆكراسیدا پاسەوانی دەروازەكان ئەو بیرۆكراسیيانەن كە دەستیان گرتووە بەسەر بەدەست هێنانی خزمەتگوزارییە گشتییەكاندا (بۆ نموونە كۆمەڵەكانی سەرپەرشتی كە بۆ خەملاندن جێ هێڵراون) . لە تیۆرەكانی ڕێكخستنەكاندا (بە تایبەتی ئەو تیۆرانەی پەیوەندن بە (دایڤید ئیستن) هوە ئەوا پاسەوانانی دەروازەكان نوێنەرایەتی ڕێكخراوە ناوەندەكان لە نوێنەری حیزبەكان و كۆمەڵەكانی بەرژەوەندی كە جەماوەر بە دەسەڵاتەوە دەبەستنەوە لە ڕێگەی بەراورد كردنی داخوازییە هاتووەكان و كۆكردنەوەیان و پۆلێن كردنیان پاشان ڕێكخراوەكان دەینێرن بۆ دەسەڵاتەكان.

**See also: Systems analysis.**

## Geopolitics ڕامیاریی جوگرافی ــ جیۆپۆلەتیك ــ *السیاسة الجغرافیة*

بریتییە لە لێكۆڵینەوەی پەیوەندییە ئاڵوگۆڕەكانی ژینگەی جوگرافی (بە تایبەتی لایەنە سروشتیو ڕەگەزی ئابووریو دانیشتوانی و ژینگەییەكانی ئەو ژینگەیە) لەگەڵ دەوڵەتدا بە تایبەتی لەگەڵ ڕامیارییەكانی دەوڵەتدا.

ڕامیاریی دەرەكی دەوڵەتەكان و ئەو ململانێیانەی كە لیی دەكەوێتەوە گرنگییەكی گەورەی هەیە لای ئەوانەی كەشێوەكانی شیكردنەوەی جیۆپۆلەتیكی بەكار دێنن.

هەروەها دەكرێت كە زاراوەكە وەك ئاماژە بەو دیدگا ئایدۆلۆژییە بەكار بهێنرێت

کەجەخت لەو ئەو شوێنەوارە حەتمییانە دڵنیا دەکاتەوە کەپەیوەندیان بە هۆکارە جوگرافییەکانەوە هەیە وەك شوێنەوارەکان لە پەرەسەندنی رامیاریی دەوڵەتەکان و کۆمەڵە رەگەزییەکانی ناویان، ئەم هەڵوێستە ئایدۆلۆژییە وەك نموونە، کاریگەرییەکی گەورەی هەبووە لە بزوتنەوەی سۆسیالیزمی نیشتیمانیدا لە هەر دووجەنگە جیهانیەکەدا.

**See also : Deteerminism ; political geog- raphy.**

## دابەشکردنی لایەنگیرانەی ناوچەکانی هەڵبژاردن
## Gerrymandering (تقسيم المناطق الانتخابية المتحيز)

زاراوەیەکی بنەچە ئەمریکییە ئاماژەیە بە ناونانی نەگونجاو (یا دروستکراوی) سنوری ناوچەکانی هەڵبژاردن بۆ زیاد کردنی گریمانەی ئەوەی کە حیزبێك یا دەستەیەك زامنی ئەوە بکات ئەوەندە کورسیی دەست بکەوێت کە بەبێ ئەوە دەستی ناکەوێت.

ئەمەش تا رادەیەك لە ویلایەتە جیاوازەکانی ئەمەریکادا باو بووە کاتێك کە کرداری سەر لە نوێ دابەشکردنەوەی ناوچەکان دوای هەر ئامارێکی دەیی کەئەنجام دەدرێت، هەروەها لە هەڵبژاردنە ناوخۆییەکانی ئێرلەندای باکوردا بەکار هێنراوە بۆ چەسپاندنی زۆرینەی هەڵبژاردنی پرۆتستانتی پێش کۆتایی پێهێنانی حوکمی سەپێنراو لە ساڵی 1972 دا. زاراوەکەش لەو هەوڵە زەقەوە سەرچاوەی گرتووە کە بۆ زامن کردنی دەسەڵاتی حیزبی حاکم ئێلدرج جیری دراوە لە ویلایەتی ماسۆچۆستس لە ساڵی 1812 دا کاتێك کە بەك هەرێم بە شێوەیەکی دروستکراو پێك هێنراوە.

**See also :Apportionment.**

**حكومەتی (أ) : دەزگا یا دامەزراوە (الحكومة (ا) : المؤسسة)**
**Government (a) : The Insitution**

بریتییە لەو دەزگایانەی کە ڕێساکان دادەنێ و بە شێوەی بڕیاری تەوژیمی کۆمەڵێکی ڕامیاریی جێبەجێدەکات : جا ئەگەر دەوڵەتێك بێت یا شارێك یا هەرێمێك یا خێڵێك یا هەر ڕێکخراوێکی تر هەروەها ووشەکە چالاکیی حوکومیش دەگەیەنێ واتە دانانی ڕێساکان و پێشکەشکردنی حاکمداری سەبارەت بە جێبەجێکردنیان. چالاکییەکانی ئەم حکومەتەیش لەزۆریەی کاتدا بەفەرمانی یاسادانان و جێبەجێکردن و دادوەریی وەسف دەکرێت.

لەمانایەکی تەسکتردا ڕەنگە ووشەکە تەنها بریتیی بێت لە لایەنی جێبەجێکردن وەك ئەوەی کاتێك ئاماژە بەحکومەتی پارێزگاری دەکرێت لە بەریتانیا یا حکومەتی ئیتیلافی لەهۆڵەندا، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم جۆرە بوارە ڕەنگە بیرۆکەی پشتگیریی یاسا دانانی حکومەتی جێبەجێ کاریش لەخۆ بگرێت. جۆری حکومەت لە دەوڵەت یا قەوارەیەکی ڕامیاریی تردا هەندێك جار پێی دەوترێت ڕژێم.

See also : Executive ; judiciary ; legis-
Lature ; regime ; separation of powers.

**حکومەت: (ب) (الحكومة) : لێکۆڵینەوە (الدراسة) :**
**Government (b) :**
**The study area:**

لێکۆلینەوەی حکومەت زۆرجار بەوە دانراوە کە یەکسانە بە لێکۆڵینەوەی ڕامیاریی و بووەتە هاو واتایەکی پێش زاراوەی (زانستی ڕامیاری) .لە ڕاستیشدا هەندێك لەبەشەکانی زانستی ڕامیاریی لە زانکۆکاندا تا ئێستایش پێ ی دەوترێت (بەشەکانی حکومەت) بەلاّم بەکار هێنانی وردی ووشەکە وای سنوردار دەکات کە

تەنها بریتی بێت لە ئاماژەکردن بەو لایەنانەی زانستی ڕامیاریی کە ڕاستەوخۆ سەبارەت بەو فەرمانبەرانەن کە لە حکومەتدا کار دەکەن و بە چالاکیەکانیان و دەزگاکانیان و حکومەتی دەوڵەت.

بە پێچەوانەی ئەمەشەوە ڕەنگە زانستی ڕامیاریی سەرباری لێکۆڵینەوەی حکومەتیش، لێکۆڵینەوەی حیزب و کۆمەڵەکانی بەرژەوەندی و لایەنە جۆراو جۆرەکانی ڕەفتاری ڕامیاریی لەخۆ بگرێت لەگەڵ ڕامیاریی ڕێکخراوە ناحکومییەکانیشدا. هەروەها زاراوەکە هەندێك جار بۆ جیاکردنەوەی لێکۆڵینەوەی لایەنە دامەزراوییەکانی ڕامیاری لە لێکۆڵینەوەی بیرە ڕامیارییەکاندا چ وەك مێژوو چ وەك فەلسەفەی ڕامیاریی بەکار دێت.

See also : politcal science.

## Group Theory (نظرية الجموعة) تیۆری کۆمەڵ یا گروپ

ڕێبازێکە لە شیکردنەوەی ڕامیارییدا کە پشت بەو بناغەیە دەبەستێ کە دەڵێ کۆمەڵ نەك تاك یا دەوڵەت بریتیە لەیەکەی بنەڕەتیی چالاکیی ڕامیاریی، چونکە تاکەکان لەژیانی ڕامیاریدا لەکۆمەڵدا کار دەکەن و ڕەفتاریان کاری تێدەکرێت، تا ئەو ڕادەیەی بوترێت کە تاك بە پەیکەری کۆمەڵەکان و پێوانە و ئامانجەکانی دیاری دەکرێت.

(ئەی.ئێف بتلی) یەکەمین بەیانی گرنگی داناوە لە کتێبەکەیدا کەبەناوی (کرداری حوکم کردنە) و لە زانکۆی شیکاگۆلە ساڵی 1908 دا دەرچووە بیرە سەرەکییەکانی زانستی ڕامیاریش لە هەر دوو دەیەی شەستەکان و پەنجاکاندا پەرەی پێدراوە بە تایبەتی لە کتێبەکەی (دایڤید ترومان) دا کە بەناوی (کرداری حوکمداری) یەوە هەروەهالای (بەنتلی) ڕەنگە (کۆمەڵ) وا پێناسە بکرێت کە

بریتیه له (بارستەی چالاکی)، یا شێوازێکی تا ڕادەیەك بەردەوام له چالاکی و کارلێکی مرۆڤایەتی. کۆمەڵە کاتیەکانیش وەك جەماوەر یا کۆمەڵە شیکردنەوەکان وەك ئەو پیاوانەی کە ژنیان هێناوە یا دەنگدەرە نوێیەکان بە پێی ئەم پێناسانە بەکۆمەڵ دانانرێن. (بەرژەوەندییەکانیش) وا پێناسە دەکرێن کە بریتین له (ئاراستەکانی چالاکی) ی (هەڵوێستە ڕامیارییەکان) ی کۆمەڵەکان ئەو بەرژەوەندیانەش لەڕێی چالاکی کۆمەڵەوە دەرنەبڕاوە ئەوەندە گرنگ نیە تەنها بەو برە نەبێت کە دەتوانێت کە کۆمەڵە دروست بکات لەو کاتەدا کە پێویست دەکات گۆڕانکاریی ڕامیاریی دیاری کراو بێتە ئاراوە. دەوڵەتیش بەسەرچاوەی دەرخەری ڕامیاریی دادەنرێت کە ڕەنگدانەوەی ناوەڕۆکەکەی بریتییە له هاوسەنگی بوونی کۆمەڵەو پێ لەسەر لایەنە دینامیکییەکانی ڕامیاریی دادەگرێت وە ك چالاکییەك و حوکمیش وەك کردارێك و ئەو شیکردنەوەیە ڕەت دەکاتەوە کە پشت بەدەستە شێوەیی و یاسایی و دەستوورییەکان دەبەستێت سەرباری ئەو چەمکانەی وەك (بەرژەوەندی نیشتیمانی) کە پێوەری پێوانەی وا دەسەپێنێ کە له چالاکی کۆمەڵدا دیار نیە و هەوڵی ئەوە دەدات کە ڕامیاریی وەك خۆی وێنە بگرێت بەتەنها بایەخ دان بەچالاکی بەرجەستەی کۆمەڵ و ڕەتکردنەوەی چەمکی تری وەك (پەیکەری چینایەتی) مارکسی چونکە ئەمە تەنها بەشێوەیەکی بەر تەسك خۆی له تەنها یەك خاڵی سەرچاوەییدا چڕ دەکاتەوە لەشێوەیەکی ناتەواوی ململانێ ی ڕاستەقینەی نێوان کۆمەڵەکان.

ئەو ڕەخنە سەرەکییانەی کە ئاراستەی ئەم ڕێبازە دەکرێت بریتیە له گران پێناسە کردنی (کۆمەڵ) بەبێ ئەوەی زۆر گشتی بکرێت تا ئەو ڕادەیەی مانای نەمێنێ و حەز کردنی بە چارەسەرکردنی تاکەکان و دەوڵەت وەك ئەو کەناڵانەی کە چالاکییەکانی کۆمەڵی پیادا دەردەپەڕێت،و ڕەتکردنەوەی هەر یەکێتییەك یا واقیعێك لەگەڵ کۆمەڵگادا یا بەرژەوەندی گشتیدا، گرانیی لێکدانەوەی ڕازیکەر بۆ ڕەفتاریی ڕامیاری تاك بە تایبەتی لەڕووی ئەو هۆکارە دەروونییانەوە ئەو ڕەفتارە دیاری

دەکەن. لەگەڵ ئەمەشدا تیۆری کۆمەڵ دەسەلاتێکی گەورە پیادە کردووە بەسەر پەرەسەندنی زانستی ڕامیارییدا بە تایبەتی لەئەمەریکادا، ڕێبازە ڕەفتاریی و فرەییەکان زۆر لە بنەماکانیان وەرگیراوەو کاریگەریشی بە شێوەیەکی هەندەکی بەر پرسیارە لەبلاو بوونەوەی لێکۆڵینەوەکانی کۆمەڵەکانی بەرژەوەندیدا.

**See also : Behaviouralism ;interest Group ; interests ; organisation ; plural-Ism ; political ; special calss.**

**Guild socialism See : Anarcho-Syndicalism.**

# H

## ڕێگەی هارا-نیمایر (طريقة هارا-نيمار) Hare-Niemeyer Method

ڕێگەیەکە بۆ ژماردنی شێوەی دابەشکردنی کورسیەکان لە ئەنجومەنی یاسادانان یا بارنەکانی هەڵبژاردندا بەسەر پاڵێوراوەکانی‌لیستەکانی هەر حیزبێك (یا ئەو ڕێسایانەی کە پشت بە پێوەری تر دەبەستن وەك بەشە هەرێمیەکان) لەسیستمەێکی هەڵبژاردندا کەلەسەر نوێنەرایەتی ڕێژەیی دامەزراوە. تۆماس هارا ئەم ڕێگەیەی پەرەپێداوە و هۆرست نیمیار فراوانی کردوە لەکۆماری ئەڵمانیای فیدراڵیدا لەکاتی هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی گەلی لەکۆماری ئەڵمانیای دیموکراتی 1990 و لەهەڵبژارنەکانی یاسادانانی سەرجەم ئەڵمانیایی 1990 وەك نمونە.

ئەم ڕێگەیە بەمشێوە کار دەکات:

هاوکێشەکە بەم شێوەیە:

ژمارەی کورسیەکان × دەنگە ڕاستەکان

ژمارەی ئەو دەنگە ڕاستانەی کە دراون

کورسیەکان بەسەر حیزبەکاندا دابەش دەکرێت بەپێی سەرەنجامی ژمارەکان لەم هاوکێشەوە پاشان ئەو کورسیانەی کەماونەتەوە دابەش دەکرێن بەسەر ئەو حیزبانەدا کە (بەرزترین شکاندنی دەیی بەدەست دەهێنن) وەکو نموونەیەکیش بۆ ئەم گریمانەیە چوار حیزب ململانێ دەکەن لەهەڵبژاردنێکدا لەسەر هەشت کورسی و حیزبەکان ئەم دەنگانە بەدەست دەهێنن:

حیزبی (أ) : 6600

حیزبی (ب) : 4800

حیزب (ج) :300

حزب حزب حزب حزب

أ ب ج د

کورسیەکان بۆ هەر ژمارەیەکی راست 330 340 155 75,.

3 2 1 صفر =)

6)

دوو کورسی بۆ ئەوانەی ماونەتەوە صفر صفر 1 (=2)

کۆی هەمووی 3 2 1 (=8)

حزب (د) : 1500

(کۆی دەنگەکان کەدراون 1600) وەبەجێبەجێکردنی هاوکێشەکە دەرەئەنجامەکان بەم شێوەیە دەبن: رێگەی دۆنت لەم حاڵەتەدا چوار کورسی تایبەت دەکات بۆ حیزبی (أ) و سێ کورسی بۆ حیزبی (ب) و کورسیەکەیش بۆ حیزبی (ج) و هیچ کورسیەك تایبەت ناکات بۆ حیزبی (د) چونکە رێگەی دۆنت حیزبە گەورەکانی بەلاوە باشترە لە پەراوێزدا لە کاتێکدا رێگەی هارا-نیمیار حیزبە بچوکەکانی پێ باشترە.

**See also :d,Hondt Method ; electoral Quota;electoral system; list system ; Porportional resentation.**

## Head of Sate سەرۆکی دەوڵەت (رئيس الدولة)

ئەو کەسەیە لەو پایە رامیارییەدایە کە بەر پرسە لە کارێك وەك نوێنەری سەرکردایەتی ی هێزو دەسەلاّتی دەوڵەت. هەر وەك چۆن ئامازەشە بە هەندێك لە فەرمانەکانی وەك راگەیاندنی رەسمی شەڕ یا بارێکی نائاسایی و دانانی سەرۆك وەزیران و ئەندامەکانی تری حکومەت بەخشینی نازناو و مەدالیاکان و ئیمزاکردنی یاسا دانراوەکان ئەم فەرمانانەش لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی تر دەگۆرریێت بەلاّم لە بنەرەتدا هەر لەیەك دەچن. لە هەندێك دەوڵەتدا سەرۆکی دەوڵەت سەرۆکی حکومەتیشە لە هەمان کاتدا (وەك ئەمەریکا و هەندێك دەوڵەتی حکومداری تاکی رەهاو تا رادەیەکیش فەرەنسا) .

رەنگە سەرۆکی دەوڵەت لەرێی مافی لەدایك بونەوە ئەم پایەیە وەربگرێت (وەك جێنشینی بەریتانی) یا کۆمەڵێك بەرهەمی دێنن (وەك ئەفسەرێکی گەورە لەپاش کودەتایەکی سەربازیی) یاڕاستەوخۆ هەڵدەبژێرێت (سەرۆکی فەرەنسی) یا هەڵبژاردنێکی ناڕاستەوخۆ) (وەك سەرۆکی ئەڵمانی یا هێزێکی دەرەکی دەیسەپێنێ، رەنگە ماوەی پایەکە جێگیر بێ یا دیاریکراو بێ یا بە درێژایی ژیان بێت. رادەی توانای سەرۆکیش بەپێی یاساکان لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی تر دەگۆرێت ولەهەمان دەوڵەتیشدا بە تێپەڕ بوونی کات (وەك دابەزینی دەسەلاّتی جێنشینی بەریتانی لەسەدەی هەژدەهەمەوە و فراوان بوونیدەسەلاّتی سەرۆکی ئەمریکی لە سەرۆکایەتیجۆرج واشنتۆنەوە) .

See also :Leadership ; monarchy ; sov-
Ereignty.

## Hegemony (الهيمنة) بالاْ دەستی یان دەست بەسەردا کێشان ــ هەژموون ــ

ئەم زاراوەیە بەسادەیی ئەوە دەگەیەنێت کە ڕەگەزی سیستمێك دەست بگرێت بەسەر ڕەگەزەکانی تردا دەست بەسەردا گرتنی دەوڵەتێك بەسەر دەوڵەتێکیتردا لەهەمان دەوڵەتی فیدراڵیدا یا لە هەمان هەرێمدا، بەکار هێنانی ئێستاش کە لە ژێر کاریگەریی دانراوەکانی گرامشیدایە، ئاماژەیە بە ناوەندی چینێکی بالاْ دەست کە دەست بەسەرداگرتن ئەنجام دەدات لە ڕێگەی توانای بەجێ گەیاندنی پەسەند کردنی کۆمەڵێکی دیاریکراوی داب و پێوەرە ڕۆشنبیریەکانەوە.

ئەم جۆرە چینەش ڕەنگە پێویستی بەتێکشکاندنی بەرەنگارییە ڕامیاریی و ئابورییەکان نەبێ تا دەسەلاْت پیادە بکات. لەوانەشە کە ڕوانگەی جیهانیی پەسەندی کۆمەلگا نەهێلێ کە ئەم جۆرە بەرەنگاریانە دەرکەوێت، بەکانگیر کردنی چەمکی بالاْدەستی بواری شیکردنەوەی ڕامیاریی فراوانتر دەکات لە پشکنینی ئەو ئامرازانەی کە بەهۆیەوە دەتوانێت ڕێکەوتنی و باوەڕی لە ڕادەدا بەدی بهێنێ و لەڕیی ڕێکخستنی کۆمەلاْیەتی و فێرکردن و شێوەکانی پەیوەندی کردنیشەوە پارێزگاری لێدەکرێت.

See also : Consensus ;ideology ;
Marxism ; norm ;political socialization ;
Power ; social class.

## Hermenutics زانستی ڕاڤەکردن (علم التاويل)

بریتیە لە لێکۆڵینەوەی کۆمەلگا لە ڕێگەی سەر لەنوێ لێکدانەوەی مانای کاری

کۆمەڵایەتی و شیکردنەوەی. مادەی زانستە مرۆڤایەتیەکان بەو سروشتەی کە هۆکارە کۆمەڵایەتیەکان لێك دەداتەوە ناکرێت کە بەهەمان ئەو ڕێگایە دابنرێت کە جیهانی سروشتی پێ لێك ئەدرێتەوە. لەبەر ئەم هۆیانە زانستی لێکدانەوە نمونەکانی ئەو پشکنین ولێکدانەوانەی ڕەت کردوەتەوە کە لە زانستە سروشتیەکانەوە وەرگیراون لە باتی ئەوە هەوڵ ئەدات کە لەجیهانی کۆمەڵایەتی تێبگات وەك بەرهەمی بیر و مەبەستی مرۆڤایەتی. لە باتی هەوڵدان بۆ دامەزراندنی ئەو هۆکارە دیارانەی کە پەیوەستن بەدەرکەوتنی فاشیزمی ئەڵمانییەوە (دۆڕانی سەربازیی و بێ بازاڕییەو جەمسەرگیریی ڕامیاریی...تاد) ڕێبازی لێکدانەوەیی هەوڵ دەدات کە لەو هەڵوێست و بیرو باوەڕو ڕۆشنبیرییانە تێ بگات کە لە سەردەمی فاشیدا پەرەیان سەندوە لە ڕووی پاڵنەری هۆکارە پەیوەندیدارەکانیەوە.

کارکردن لە ڕێبازی لێکدانەوەیدا لە ئەورووپای کیشوەری زۆر باو تر بووە لە زانستی ڕامیاریی بەریتانی یا ئەمریکی بەڵام پاساوەکانی گرنگیەکی گشتیی هەیە بۆ زانستی کۆمەڵ و کاریگەریی بەرفراوانی لەبواری شیکردنەوەیٔ بیرو باوەڕدا.

**See also :Explanation ;ideology;
Scientific methods ;telogical expla-
Nation.**

## Hierarchy ڕێکخستنی هەرەمی *(التحليل الهرمي)*

ڕێکخستنی کەسەکان و پایە ڕامیارییەکان لەسەر بناغەی دەسەڵات یا هێزی ڕامیاری هەر کەسێك یا پایەیەك.

بەم شێوەیەش ڕێکخستنی هەرەمی هەیە لە حکومەتی بەریتانیدا وەك ڕێکخستنی وەزیرەکان لە لیستی ڕەسمی بلاوکراوەی ئەندامانی حکومەتداو کۆمیتەی ناوەندیی

حیزبی شیوعی سۆڤیەتی و ڕێکخراوە حیزبیەکانی ناو ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکادا...تاد. دەکرێ کە ڕێکخستنی هەرەمی ناڕەسمیش هەبێ شان بەشانی ڕێکخستنیهەرەمییە ڕەسمیەکانی ناوسیستەمی رامیاریی ڕێکخراوە نێو دەوڵەتییەکان وەك ڕیچکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان یا لەکۆمەڵگای ناوخۆییدا کاتێك کە ڕەگەزە رامیارییە هەرە بەهێزەکان پایەی بچوك وەردەگرن یا هیچ پایەیەکی رامیاریی ڕەسمیان پێ نادرێت هەروەها زاراوەکە بە مانایەکی هاوبەش بەوەش دەوترێت کە بەهێز ترین پایەی هەبێت لە ڕێکخراوێکدا وەك ڕێکخستنی هەرەمی کاسۆلیکی کە لە پاپاو کارگێڕیی پاپایی و ئەنجومەنی کاردیناڵەکان پێك دێت.

See also :Status.
Historical sociology See:political History.
History of political ideas See: political Thought.
Human rights See : Civilrights.

## Hypothesis (الفرضیة) گریمانە

خەملاندنێکە کەدەکرێت بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆهەڵبژێررێت، زۆر جار وەك لێکدانەوەیەکی بەشیی ڕووداوێك دەخرێتە ڕوو.

بەوشێوەیە دەکرێت (گریمانە) بەگشتی (تیۆر) و (یاسا) بگرێتەوە بەڕادەی پێشکەشکردنیان و بەو پێیەی دوو لێکدانەوەی کاتین و لەژێر تاقیکردنەوەدان، بەشێوەیەکی بەر تەسکتریش گریمانە وەرگیراوە لەتیۆرێکەوە بۆ مەبەستەکانی تاقیکردنەوەی ڕاستی ئەو تیۆرە لەکۆمەڵێك بارودۆخی دیاریکراودا. هەروەها ئەم زاراوەیە بەشێوەیەکی گشتی بەکار دەهێنرێت بۆ وەسفکردنی گریمانەیەك و بۆ کۆمەڵێکی ئەندێشەکراوی ناکردارییی بارودۆخ کەبە (گریمانەیەکی ڕووت) دادەنرێت.

See also : Axion ; empiricim ; explana-
Tion ; falsification ; law (a) : scientific
Law ; positivism ; theory ; verification.

# I

## Ideal Type جۆری نمونەیی *(النوع المثالی)*

چرکردنەوەی سەرەکیی ڕێگەیەکی شیکردنەوەییە و بەتایبەتی پەیوەندە بەماکس ڤیبەرەوە .جۆراو جۆر بوونی جیهانی کۆمەلآیەتی و ئالۆز بوونی بە پێکهێنانی جۆرە نموونەییەکان بەرەنگاری دەکرێت کە بریتین لەو چەمکانەی کە دەربڕی کۆمەلێك شێوەی جێگرەوەی بیرو کارو ڕێکخستنن.. وەك کۆمەلێك بار کە پابەند بوون و کێشەی ڕووت ڕواڵەتی و هەر یەکەیان بنەمای بنەڕەتیی جیاواز بەرجەستە دەکات و پەرەی بەرکابەری ئەقلآنی و سەرمایەداریی شێوەکانی دەسەلآت داوە وەك جۆری نمونەیی.

دیاردە کردارییەکان بە پیی هاو جووت بوونی گەورەی یا بچوکی لەگەلّ ئەو چەمکانەی ڕواڵەتی نمونەییان هەیە پۆلێن دەکرێن بەلآم شیکردنەوە لە پۆلێن کردن دورتر دەڕوات لە بایەخدانی بە سروشتی جیاوازیەکانی نێوان دیاردە کردارییەکان و جۆری نمونەیی و گرنگیەتی.

لە بەر ئەوە کە جۆری نمونەیی هەرگیز بە شێوەیەکی پوخت یا سادە لەگەلّ دیاردە کردارییەکاندا هاو جووت نابێت بۆیە ناتوانێت کە ببێتە بابەتی یاسا ئەزموونیەکان. ئەمەش سەختی لە هەلسەنگاندنی دروستی ئەم جۆرە شیکردنەوەیەدا دێنێتە ئاراوە.

بەکارهێنانی جۆرە نمونەییەکان کەوتووەتە بەر ڕەخنە چونکە هانی لێکۆڵەرەوە ئەدات کەوەسفی ئەو لایەنانە بکات کە جیهانی ڕامیاریی کرداریی تیایدا سەر ناکەوێت لە کارکردن بە پێی تێڕوانینێکی هەرەمەکی بەتەواوی نەوەك هەوڵدانێك بۆ تێگەیشتنی جیهان، هەرلە سەرەتاوە و وەك ئەوەی کە بەڕاستی هەیە.

ئەم ڕەخنەیەش بەوە بەرەنگاری دەکرێت کەئەو مەرجە دابنرێت کە پێویستە جۆرە نمونەییەکان دورنەکەونەوە، بەشێوەیەکی گشتی و بەر فراوان لەو بارە کردارییانەی جیهان کە پەیوەندیدارە پێوەی بەپێ داگرتن بە شێوەیەکی گاریگەرتر.

لێکدانەوەی هەر ڕووداوێکی مێژوویی کرداریی پێویستە دورخستنەوەی ئەو ڕەگەزانە لەخۆ بگرێت کە لەسەرەتادا وەك هۆی شیاو دەردەکەون بەڵام لە ڕاستیدا پەیوەندییان نیە. بۆ نموونە ئەو گریمانە فرەییە باوەی کە پێی وایە بەرژەوەندییە تاکییە هاوبەشەکان دەبێتە هۆی ڕێکخستنێکی کۆمەڵی بۆ گەڕان بەداوی ئەو بەرژەوەندیانەدا و بەرگری کردن لێیان کە بە بەرەنگار بوونەوەی نمونەکانی جۆری نمونەیی بەرامبەر دەکرێتەوە لەو کارە نیشتیمانیانەدا کە ئەو بەربەستانە دەخاتە ڕوو کە ڕێ لە هەوڵی هاوبەش بۆ بەدی هێنانی ئامانجە هاوبەشەکان دەگرێت.

لەجێبەجێ کردنیشدا دیاریکردنی ئەوەی کە ئایا شیکردنەوەیەکی تایبەت جۆری نمونەیی یا پێکهاتەی تیۆری و یاسای (ڕاستەقینە) لەخۆ دەگرێت لەوانەیە زەحمەت بێت.

بەم شێوەیە ناکۆکییەك هەیە کە ئایا مارکسیزم (و خودی مارکسیش) پشت بەجۆرە نمونەییەکان دەبەستن: چەمکی نمونەی سەرمایەداریی بۆ بەرهەم هێنان و (ئەو یاسایانەی) کە حوکمی پەرەسەندنی دەکەن.

See also : Autority ; capitalism ; classi-
Fication ; law (a) : scientific law ;
Marxism ;model paradign (a) : general
Usage ; pluralism;public goos ;real-
Ism (a) :scientific realism ; typology.

## Ideology ئایدۆلۆژیا (*العقيدة*)

ئەم ناوە لەبنەچەدا (لەدەیەی دوایی سەدەی نۆزدەدا) بەو زانستە ووتراوە کە جۆرێك لە حەتمیەت لەخۆ بگری لە بیرو بیرە مرۆڤایەتیەکاندا زاراوەکە بە مانای ئەو بەهاو گریمانەو باوەڕ سەرەکییانە دێت کە خەڵك هەیانە و وایان لێ دەکات کە جۆرێك لە پەیڕەوی هزریی بەسەر ئەو ئەزموونە تاکی کۆمەڵایەتییە جیاوازانەدا بسەپێنن کە پیایدا تێپەڕ دەبن. زۆر جار ڕێبازە ڕامیارییە ئاشکراو دیارەکان وەك (ڕێبازی پارێزگارو فاشیزم ولیبرالیزم و سۆسیالیزم) بە ئایدۆلۆژیا دادەنرێن بەڵام لەوانەیە زاراوەکە بۆ کۆمەڵێك بیری گشتی و کەم باو لەناو خەڵکیشدا بەکار بێت. ڕەنگە (ئایدۆلۆژیا) بەئامازەیەکی ساکار بۆ (کۆمەڵێك بیر) بە هەندێك ڕواڵەتی دیاریکراو لە بەکارهێناندا جیا بکرێتەوە، ئایدلۆژیاش هی کۆمەڵێکە (چینێك حیزبێك یا دەستەیەك یا کۆمەڵگایەك یا دانیشتوانی سەردەمێك: ئایدۆلۆژیای تایبەت و بێهاوتا تەنها نادرێتە پاڵ یەك تاکە کەس. ئایدۆلۆژیا بیری زۆر سەرەکی لەخۆ دەگرێت لە ڕوانگەی هەڵگرانیەوە بەشێوەیەك کە زۆر جار دەرك بەسروشتی ناکەن: چونکە جۆرە نەریتێکی بیرکردنەوە دروست دەکات کە ڕێگە لە هۆشیاریی خۆیی تێڕامانی دەگرێت . هەروەها ئایدۆلۆژیا بەهای وای تیایە کە وەك پاساوێك بۆ کارکردن بەکاردێت یا ڕێگە بە ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی و ڕامیاریی دیاریکراو دەدات ئەو بیرانەش کە ئایدۆلۆژیا پێك دێنن تا ڕادەیەك یەکانگیرن بۆ ئەوەی هزر بە ئازادی بهێڵنەوە و دور لە بێزارکردنی حوکم و داواکارییە دژەکان.

هەموو ئەم ڕواڵەتانەش پێکەوە وەسفێك لەخۆ دەگرن بۆ جۆرە سەرەکییەکانی ئایدۆلۆژیا کە لەوانەیە دیارکردنیان گرنگ بێت بۆ تێگەیشتنی چالاکیی ڕامیاریی و لێکدانەوەی، ئەم جۆرە وەسفەش ئەوە دەگەیەنێت کە (ئایدۆلۆژیا) تەنها چەمکێکی بەسودە کە بەشێوەیەکی بێ لایەنانە لە شیکردنەوەی ڕامیاریدا بەکاردێت.

لەلایەکی ترەوە، لەزۆر لێکۆڵینەوەی رامیاریدا وەسف کردنی رایەك یا کارێك بەوەی کە ئایدۆلۆژییە بریتیە لەجۆرێك لە رەخنە، واتە ئەو رایەی کە ئایدۆلۆژیا پێشکەشیدەکات دەربارەی جیهان ساختەیە یا لاوەکی یا تاك رەهەندە یا تەنها خزمەتی بەرژەوەندییەکی دیاریکراو دەکات (رەنگە ئەوانەی کە هەڵگری ئەو ئایدۆلۆژیایەن زۆر بەراست و تەواو و بێ لایەنی بزانن) . سروشتیووردی هەر رەخنەیەکیش بەپێی رای رەخنەگرو (ئایدۆلۆژیاکەی) جیاواز دەبێت.

رەخنەگری پارێزگار هەمیشە پێی وایە کە را یا کار لە ئایدۆلۆژیایەکی گشتگیرەوە سەرچاوە دەگرێت کەبروای پێکراوەو هەوڵ دەدات پلەی چەقی تیۆرێکی قابیلی جێبەجێکردن بەشێوەیکی سەراپایی وەربگرێت و بەشێوەیەکی تەواو هەست بە پێویستییە تایبەتیەکانی زەمەنێکی دیاریکراو ناکات یا داب و نەریتی تایبەتی کۆمەڵگایەك.

رەخنەگری مارکسی بەگشتی رەخنەی خۆی لە فەرمانی رادا چڕدەکاتەوە یا کار و مەیلی بۆ پاڵپشتکردنی رێکخستنە هەنووکەییەکان و پێشکەش کردنی وێنەیەکی ویستراو یابێ لایەن بۆ بالا دەستی چینایەتیەو نوێنەرایەتی کردنی بۆ دیاردەیەکی دیاریکراو لەرووی مێژووییەوە وەك ئەوەی کە گشتگیرو نەگۆڕ بێت. بۆ نموونە پێوەرەکانی کۆمەڵگای بورژوازی وەك (سروشتی مرۆڤایەتی) مامەڵە دەکات. هەندێك نوسەریش بە تایبەتی کارل مانهایم (ئایدۆلۆژیای) بەمانای ئەو کۆمەڵە بیرە بەکار هێناوە کە دەبێتە پاساو بۆ رژێمێکی کۆمەلایەتی و دەیچەسپێنێ و وای پێ باشترە کە ئەو بیرانەی کە کاریگەرییان هەیە و گۆرانکاریەك دروست دەکەن بە یۆتۆپیایی پۆلێنی بکات وا باوە کە هەر دوو جۆرەکەی ئەو دوو بیرە ئاماژە پێکراوە بە ئایدۆلۆژیا ناو ببرێت. لەگەڵ ئەو جیاکارییە باوەی لەنێوان زانست و ئایدۆلۆژیادا هەیە هەندێك جاریش دەوترێت مادەم هەموو هەوڵەکان بەس نین بۆ تێگەیشتن لە رامیاری دەبێت لە دیدگایەکیَ رامیاریی دیاریکراودا ریشەی داکوتا بێت، ئەوا لێکدانەوەی رامیاری بەتێکرای سروشتێکی ئایدۆلۆژیی هەیە.

See also : Hegemony ; ligitimacy ; Norm ; utopianism ;values ;value Judgement.

## تاوانبارکردنی کارمەندێکی حکومی (اتهام الموظف الحکومي)
## Impeachment

تاوانبارکردنی کارمەندێکی حکومی یا دادگایەکی تایبەتمەندە بەئەنجام دانی تاوانی وەك کەم تەرخەمی یا گوناح یا بەرتیل وەرگرتن لەکاتیفەرماندا. لە بەریتانیا ئەنجومەنی لۆردەکان سەیری ئەم جۆرە حاڵەتانەیان کردووە پاش ئەوەی کە تۆمەتێك لەو ئەنجومەنەوە دەچوو کە دواین حاڵەتێکی تۆمار کراو بوو لەساڵی 1806دا. لە ئەمەریکاشدا یاسای فیدراڵیو یاسای ویلایەتەکان حوکمی والەخۆ دەگرن کە سەبارەت بە تاوانبارکردنی کارمەندی حکومین.

لەسەر ئاستی فیدراڵیش ئەنجومەنی نوێنەران مادەکانی تاوانبارکردنی کارمەندی حکومی ئامادە دەکات و ئەنجومەنی پیرانیش وەك دادگا کار دەکات. بەناو بانگ ترین بابەت لەو بوارەدا تاوانبارکردنیسەرۆك ئەندرۆ جۆنسن بوو لەساڵی 1868دا. لەکاتی ئێستادا بەدەگمەن ئەو تاوانبارکردنە وەك چارەسەرێك بەکار دێت و شتی تر جێگەی گرتوەتەوە وەك دادگا مەدەنیەکان یا واز هێنانیتاوانبار لە کارەکەی ئەمەیش ئەو رێگایە بوو کە سەرۆك نیکسۆن خۆی لە تاوانبارکردن پێ لادا لە ساڵی1974.

## Imperialism ئیمپریالیزم (الاستعمار)

رامیاریی یا پیادەکردنی دەوڵەتێکە کە حوکمی خۆی بەسەر دەوڵەتێکی تر یا هەر

هـەرێمێکی تـری نـا دراوسـێ یـا لێـك نەچـووی ڕەگەزیـدا دەسـەپێنێ بەمەبەسـتی دەسـتکەوتنی سـودی ئـابوری یـا ئاسایشی سـەربازیی یـا ناوبـانگی نێـو دەوڵـەتی و هەوڵدان بۆ بەدی هێنانی ئامانجێکی ئایـدۆلۆژیی. فـراوان کردنـی حـوکمی لـەم جۆرە دەبێتە هۆی دامەزراندنی (ئیمپرتۆرێك) ئیمپریالیزم بە دوو ڕێگـە لـەکۆلۆنیالیزم جیـا دەکرێتەوە، لەلایەنی ڕامیارییەوە (ئیمپریالیزم) بەگشتی لە هەندێك یـەکانگیرکردنی ڕامیـاریی زەوی ژێـر دەسـت لەگـەڵ دەوڵەتـە سـەربەخۆکەدا وەك فـراوان کردنـی هاولاتێتی بۆ هەموو دانیشتوان و لەلایەنی ئابورییەوە زاراوەی (ئیمپریالیزم) چەندین جار بەمانای قۆناغێك لەپەرەسەندنی سەرمایەداری بـەکار دێت کاتێـك کـە بارودۆخـە ئابوریـەکان لـە وولاتـە سـەرمایەدارییە پێشکەوتووەکاندا بـەرەو فـراوان بـوونی بـۆ دەرەوە دەچێت.

ئەم بەکار هێنانەی دووەمیش کە هی لینینە، بەشێوەیەکی باشـتر بـە گریمانەیـەکی تایبـەت دادەنرێـت کـە سـەبارەت بەهۆیـەکانی کۆلۆنیالیزمـە لەدوایـیەکانی سـەدەی نۆزدەو سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا وەك ئـەوەی کەپێناسێکی گشتی یـا تیۆرێـك بێت بۆ ئیمپریالیزم.

هەروەها زاراوەکە بەشێوەیەکی گشتی بە پیی بـەکار هینـانی لیـنین بـەمانای بـالآ دەستیی ئـابوری دەوڵەتـە ئیمپریالییـە پێشوەکان بەسـەر کۆلـۆنی یـە پێشوەکان و وولاتە دەوڵەمەندەکان بەسەر ئەو ولأتانەی کە لەو هەژارترن بەکاردێت. تەنانـەت لـەو بارانەش دا کە دەستێوەردانی سەربازیی و ڕامیاریی ڕاستەوخۆ ڕوو نـادات، بـەزۆریش ئەك بەهەمیشەیی هەر دوو زاراوەی (کۆلۆنیالیزمی نوێ) و (ئیمپریـالیزم نـوێ) لـەم بارەیەوە بەکاردێن.

**See also : Citizen ;colonialism ; depen-
Dency theory ; sovereignty.**

## Incrementalism پلەپلەیی (التدريجية)

شێوازێکە لەدانانی رامیارییەکان کە بریتیە لە بایەخ دان بە ئامانجە بوار بچوکەکان و چارەسەری کێشە هەنوکەییەکان و بایەخدانی تایبەت بە سودی رامیاریی چارەسەرەکان لەبەر رۆشنایی رامیاریی ئێستاداو هەڵوێستە ستراتیژییەکانی کۆمەڵە کارتێکراوەکان.

گۆرانکاریش لەشێوەی کاردانەوەی پەرش و بڵاوەوە دەبێت و لەسەر چەند ئەرکێکی دیاریکراو روو دەدات هەر بریارێکیش هەندێك گۆرانی بچوك لەبواری بریارە ئایندەییەکاندا دروست دەکات لەبەر ئەوە هاوبەشییەکی روو لە زیاد بوو لەگۆرانی کەڵەکەبوودا دێنێتە ئاراوە.

هەر کردەیەکی لەم بابەتەش چونکە لەژێر رکێفی رێکخستنی نیزامیدا نییە و نوێنەرایەتی بریارەکانی کۆمەڵێکی دیاریکراو و جێگیری بەهاکان ناکات ئەوا شێوازی دانانی رامیارییەکان پێی دەوترێت (پلە بەپلەیی لێك هەڵوەشاو **Disjointed incrementalism**).

لەوانەیە بە وەرگرتنی بریارە (ئەقلانی) یەکان بەراورد بکرێت واتە هەڵبژاردنی ئەو رامیارییەی کە لەلیستێکی گشتگیری بە ئەلتەرناتیڤەکاندا بەها رەهاکان مەزن دەکات، رەنگە لەگەڵ (Satisficing) یشدا بەراورد بکرێت واتە پشکنینی جێگرەوەکان تا گەیشتنی بە جێگرەوەیەك کە ئاستێکی پەسەندی قایل کردن دەخاتە روو.

**See also :Decision ; policy ;policy Analysis**

## Index Numbers ژمارەکانی نیشانده‌ر (ارقام المؤشر)

بریتیە لەپێوانی بڕی گۆڕان لە گۆڕاوێکدا وەك رێژەی هەڵئاوسان یا سەرجەم بەرهەمی نەتەوەیی یا پشکی حیزبێك لە دەنگەکانلە زنجیرەیەك هەڵبژاردندا و بەهۆیەوە باری گۆڕاوە کە پیشان دەدرێت وەك لە خاڵێکی یەکەمی کاتدا بەهای سەد دەپێورێت، گۆڕانکارییە پاشینەکان دەردەبڕێت وەك زیاد بوون یا دابەزین لەرێژەی سەدیدا لەسەر ئەم رێسایە (بۆنموونە زیادکردنی 40٪ لەمێژووی بنەڕەتی وا گوزارشتی لێدەکرێت کە 140ە) دەیشکرێت کە پێوانەی مادەکان پێش مێژووی رێساکە و پاشیشی وەربگیرێت. هەروەها دەکرێت کە ژمارەکانی نیشاندەر بۆ بەراوردی گۆڕانەکانی دوو گۆڕاو زیاتر بەکار بهێنرێت لەماوەیەکی زەمەنی دا بە خستنە پاڵی بۆ بارەکەی یا لای مێژوی بنەڕەتیو دەربڕینی گۆڕانەکان وەك رێژەی سەدی، دەربارەی قەبارەی دانیشتوان وداهاتی نەتەوەیی یا رێژەکانی بێ کاریی لە دوو پیشەی جیاوازدا و دەکرێت کە ئەم بەراوردانە لە نێوان بارەکانی گۆڕاوەکە خۆیشیدا ئەنجام بدرێت لە دوو وڵاتی جیاواز یا زیاتردا.

**See also: Misery index.**

## Indirect Election هەڵبژاردنی ناڕاستەخۆ (الانتخاب غیر المباشر)

پرۆسەیەکی هەڵبژاردنە کەتێیدا خاوەن فەرمانەکانە لەناکۆمەڵێك دەنگدەراندا هەڵدەبژێرێن (لەنموونەی دەستەی هەڵبژاردنی لەهەڵبژادنی سەرۆك وجێگری سەرۆکدا لەوڵاتە یەکگرتووەکاندا) کە ڕاستەوخۆ خۆیان هەڵدەبژێرن، بەو شێوەیە دەکرێت بڵێین ئەوانەی کەلەپایەکاندان بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لەبازنەیەکی هەڵبژاردنی فراوانتردا هەڵدەبژێرێن (لەهەموو دەنگدەراندا لەوڵاتە یەکگرتووەکاندا) .

See also: Electoral college.

## Individualism (الفردية) تاككەرایی

ئەو بیروباوەڕەیە کەدەڵێت ئامانجی کۆمەڵگە پێویستە پازیکردنی ئامانجە خێراکان بێت نەك بیرۆکەیەك لەبارەی (بەرژەوەندی گشتییەوە) یان (گرنگیی پێدانی هاوبەش)، کەناکرێت دابەزێنرێت بۆخزمەتکردنی بەرژەوەندییە تاکیەکان، یا بڕوا بوون بەوەی کە بەرژەوەندییە هاوبەشەکان یان ئامانجە تاکییەکان یا هەر دووکیانە دەکرێت بەباشترین شێوە بەجێ بهێنرێت لەرێگەی سەرپشکردنی تاکی نەبەستراوەوە بەپێی توانا بەوەرگرتنی بڕیارە هاوبەشەکان یا کۆنترۆڵی دەوڵەت.

See also: Electoral college.

## Industrial Society (المجتمع الصناعي) کۆمەڵگای پیشەسازی

کۆمەڵگەیەکە کەشێوازی دەزگا کۆمەلایەتی و رامیاریی و ئابوری و یاساییەکانی تیایەو شێوەکانی بەشێوەیەکی بنەڕەتی کاری تێدەکرێت بەپێی مەڵبەندی بالا دەستی بەرهەمهێنانی پیشەسازی ناو سیستمی ئابوری. لەو جۆرە کۆمەڵگایەدا کشتوکاڵ دارماوە و وەك سەرچاوەیەکی کرێکاری داڕماوە. فراوان بوونی شاریش لە ئەنجامی چڕ بوونەوەی ژمارە زۆرەکانی کرێکاران لە نزیك کارگەکان و شوێنەکانی تری کاردا هاتوەتە کایەوە. پەیکەرە خێزانی و چینایەتی و بەشە پیشەییەکان رەنگدانەوەی دەسەلاتی بەرهەم هێنانی پیشەسازین.

کۆمەڵگای پیشەسازی لەوانەیە دیموکراسی یان نا دیموکراسی بێت لە لایەنی رامیارییەوە بەلام بوونی چڕی فراون بوونی دانیشتوان ئەوە دەگەیەنێت کە جەماوەر

دەبێتـە هۆکـارێکی رامیـاریی گـرنگ. رامیـاریش بەگـشتی ڕەنگدانـەوەی کاریگـەریی سـەندیکا کرێکـاری و پیـشەسازیەکان و فـراوان کردنـی مـافی دەنگـدان و پێکهێنـانی حیزبـە جەماوەرییەکانـە. هەمـە جـۆری کۆمـەڵگای پیـشەسازیش دەبێتـە هـۆی سـەر هەڵدانی بەرژەوەندی رامیاریی زۆر کە لەوانەیە بەحیزبە رامیارییەکان و کۆمەڵـەکانی فـشار و بەرژەوەنـدی (لەدەوڵەتـە یـەك حیزبیەکانـدا) یـا کـۆڕە نارەسمییـەکان نوێنەرایەتی بکرێت.

لەدەیەی شەستەکانەوە وادەرکەوت کە وڵاتە سەرمایەداریە هەرە پێشکەوتووەکان پەرەی بەڕواڵەتی وا داوە کە ئەو ڕواڵەتانە تێدەپەڕێنی کە پەیوەنـدن بـە کۆمـەڵگای پیـشەسازییەوە. چـەمکی (کۆمـەڵگای پـاش پیـشەسازیی) پـەرەی پێـدراوە وەك هەوڵـدانێکبۆ وەسـفیجۆرەکانی ئـەو بارودۆخـە و گۆڕانانـەی کـە هـەن یـا هەڕەشـەی ڕوودان دەکەن لەو کۆمەڵگایانـەدا. ڕواڵەتـە سـەرەکیەکانیش ئەمانـە لـەخۆ دەگرێت: (دورکەوتنەوە لەدروستکردن و چون بەرەو پیشەسازییە خزمەتگوزارییـەکان گرنگیـی ڕوو لەزیاد بوون زانین و دەست بەسەردا گرتنی تەکنیکی و دەرکەوتنی بەهای وا کـە زۆر بەربلاوەو باوەڕی پێ هێنراوە لەجۆرێك کـە حـەزی بەدەسـت خـستن نیـە. واتـە گۆڕانکـاری لـە پەیکـەری کۆمەڵایـەتی و چـینایەتیدا کـە گـۆڕانێکی دور لـە رامیـاریی چینایەتی تەقلیدیی دێنێتە ئاراوە.

See also : Capitalism ;convergence
Thesis ; dealignment ;mass society;
Post-materialism ; modenization ;polit-
Ical development ; social class ; statesocialism.

## Influence دەستپێشخەری *(المبادرة)*

ئەو پێشنیازانەیە کە بۆ خستنە ڕووی یاسایەك یـا هەڵوەشـاندنەوەی یـا گـۆڕینی دەسـتورێك کـە لـە دەنگدەرانـەوە دەرچـووە نـەوەك لەیاسـادانەران یـا دەسـەڵاتی

جێبەجێکردنەوە. بەکار هێنانی دەست پێشخەریش هەمیشە مەرجدارە بەدەست خستنی لانی کەمی ژمارەی ئیمزای دەنگدەران یا بەشێکی دیاریکراو لێیان و پێویستە پاش ئەمە کە زۆرینەیەك دەنگ بدات– لەوانیە زۆرینەیەکی تایبەتیش بێت– لەدەنگدەران هاوشان لەگەڵ ئەنجامدانی راپرسی تا پێشنیازەکە وەربگیرێت. بەم شێوەیە دەست پێشخەریی بریتیە لەشێوەیەك لە دیموکراسیەتی راستەوخۆ ئەمەیش بۆ نموونە لە ئەمساو ئیتالیاو هەندێك دەوڵەت و ناوچەکانی حوکمی خۆجێیی لەئەمەریکا و لە کانتۆنەکانی سویسرادا بەکار دێت.

**See also :Directdemocracy ;refern-**
**Dum.**

## Institution دامەزراوە (*المؤسسة*)

تۆرێکە لەپەیکەرەو رێکارو بەهای هاوبەشی لەسیستمێکی کۆمەڵایەتیدا کە ماوەیەك بەردەوام دەبێت و بایەخ بە فەرمانێکی کۆمەڵایەتی یا کۆمەڵێك فەرمان دەدات: دادگای باڵا لە ئەمەریکا (فەرمانەکانی یەکلای کردنەوەی ململانێکان و لێکدانەوەی رەسمی دەستور)، و پەرلەمانی بەریتانی (فەرمانەکانی دانانی رێساکانی دەست گرتن بەسەر دەسەڵاتی جێبەجێکردندا) و سیستمە هەڵبژاردنییەکانی رژێمە دیموکراسیەکان (فەرمانەکانی دانانە رامیاریەکان و تاقیکردنەوە بۆ وەرگرتنی پلەو پایەکانی دەسەڵات) .

## Insurrection یاخی بوون (*التمرد*)

بەرگری چەکدارانە لەدژی دەسەڵاتی حکومەت و کارمەندە جێبەکارەکانی بۆ چەند مەبەستێك لەوانە بەرهەڵستی کردنی کۆتە یاساییەکان و لابردنی حکومەت یا لاوازکردنی دەسەڵاتی.

See also : Coup d,etat ; putch ; rebel-
Lion ; revolution.
Integration :Political integration

**Interest Group** (*مجموعة المصالح*) **کۆمەڵی بەرژەوەندیی**

کۆمەڵێکی رێکخراوە یەکێك لە ئامانجە سەرەکیەکانی بریتیە لە پیادەکردنی دەسەلات بەسەر دەزگا رامیاریەکاندا بە مەبەستی زامن کردنی ئەوبریارانەی کە گونجاون بۆ ئەو بەرژەوەندییانەی کە کۆمەڵەکە دەینوێنن یا بۆ پوچەڵکردنەوەی ئەو بریارانەی کەناگونجێن لەگەڵ بەرژەوەندییەکاندا. بە بەراورد لەگەڵ حیزبی رامیاریدا ئەوا رواڵەتە سەرەکییە جیاکەرەوەکانی کۆمەڵی بەرژەوەندییەکان ئەمانەن: مەودای سنورداری ئەو رامیارییانەی کە بایەخی پێ ئەدات بە بەراورد لەگەڵ مەودای گشتگیری بایەخەکانی حیزبدا، دەگمەنی بەشداریکردنی کۆمەڵی بەرژەوەندییەکان لە هەڵبژاردنە گشتییەکاندا بەناوی تایبەتی خۆیەوە هەروەك چۆن بەشداری تیا ناکات تەنها وەك رێگەیەك نەبێت بۆ پیادەکردنی دەسەلاتی رامیاریی. ئامانجی کۆمەڵەکە بریتیە لە فشار بەکارهێنان لەکاتێکدا حیزب هەوڵی پیادەکردنی دەسەلاتی رامیاریی ئەدات،بەلام هەندێك رێکخراو لە پەراوێزدا دەبێت ورواڵەتەکانی حیزبی رامیاری و کۆمەڵی بەرژەوەندیەکان پێکەوە لەخۆ دەگرێت.

کۆمەڵی بەرژەوەندی کە هەندێك جاریش پیی دەوترێت (کۆمەڵی فشار) لەسەر فەرمانگە حکومیەکان لە کۆمەڵی فشار (lobby) جیاوازە کە تەنها مەبەستی بریتیە لە کارکردنە سەر یاسادانان یا جێبەجێکردنی رامیارییەکان بەلام کۆمەڵی بەرژەوەندی مەبەستی تریشی هەیە وەك پێشکەوتنی خزمەتگوزاری و هەواڵەکان بۆ ئەندامەکانی. کۆمەڵی بەرژەوەندی جیاوازە لەو کۆمەلانەی وەك بەکاربەرو خانەنشینە بەسالاچووەکان و دایکە تەنهاکان چونکە ئەو ریکخراوە لە کاتێکدا ئەو کۆمەلانە

ڕێکخراونین. بەڵام تا ئێستا لەڕووی ڕامیارییەوە کاریگەرییان هەیە.

ئامانجەکانی چالاکیی کۆمەڵی بەرژەوەندیی بە پێی سیستەمی ڕامیاریی پەیوەندیدار جیاواز دەبێت. کاتێکیش هێزی یاسادانان بەهێز دەبێت لە پەیوەندیدا لەگەڵ دەسەلاتی جێبەجێکردن دا ئەوا توشی چەندین جۆر لە دەسەلاتی گەورەتر و جۆراوجۆرتر دەبێت لیی لەو وولاتانەدا کە بالا دەستییەکی جێبەجێکردن بەهێزی تیایە (بۆ نموونە، بەراوردی نێوان ئەنجومەنی پیرانی ئەمەریکاو ئەنجومەنی گشتی بەریتانیا بکە) . هەروەها ڕادەی دیسپلینی حیزبی لە ئەنجومەنی یاساداناندا هۆکارێکی گرنگە چونکە دیسپلینی حیزبی بەهێز دەرفەتی پیادە کردنی دەسەلاتی کۆمەڵەکانی بەرژەوەندی بەسەر یاسادانەرەکاندا بەشێوەیەکی سەرکەوتوو کەم دەکاتەوە.

لەوانەیە دەسەلاتی دادوەریش هەندێك جار ببێتە ئامانجی کۆمەڵی بەرژەوەندی بەتایبەتی کاتێك کە لێکدانەوەی دادوەری یا پێداچوونەوەی دادوەری گرنگییەکی ڕامیاریی دەبێت. نمونەش لەسەر ئەمە هەڵمەتی مافە مەدەنییەکانە کەبەشێوەیەکی بەشی لە ڕێگەی دادگا ئەمرکییەکانەوە کۆمەڵەکانی وەك ئەنجومەنی نیشتیمانی پایەدارکردنی ڕەنگاو ڕەنگەکان جێبەجێ دەکەن. لەڕژێمە ئۆتۆکراسییەکاندا کۆمەڵەکانی بەرژەوەندی لاوازە یا بوونی نیە چونکە چالاکیی ڕامیاریی لە دەرەوەی حیزب قەدەغەیە بەڵام ئەم ڕێ لەهەندێك کۆمەڵی دیاریکراو (وەك سەربازییەکان) ناگرێت کە دەسەلاتی خۆیان پیادە بکەن.

هەروەها ڕێگەکانی چالاکیی کۆمەڵەکانی بەرژەوەندی جیاواز دەبن بەپێی ئەو دەرفەتانەی کە دەدرێت بۆ پەیوەندیکردن بە وەرگری بڕیارەکانەوە. لەو ڕێگایانەش کە لە زۆر وولاتە پیشەسازییەکاندا هەیە سازدانی کۆبوونەوەو خۆپیشاندانەکان،و ئەو نامە کەسییانەیە کە ئاراستەی ڕامیارەکان و ڕۆژنامەکان دەکرێت و دانوستانی لیژنەکان، و عەریزەکان، و ناردنی نوێنەران بۆ فەرمانگە حکومییەکان و هەڵبژاردنی پاڵێوراوە هاوسۆزەکان یا بژارکردنی یاسا دانەرەکانی ئێستاو هاوکاری کردن لەگەڵ

دەزگا ڕەسمییەکاندا لە بەرامبەر لەبەرچاوگرتنی ئەمە لەلایەن ئەوانەوە و شێوە جیاوازەکانی بەشداریکردن لە هەڵمەتەکانی هەڵبژاردندا.

See also : Interests ;lobby.

## Interests بەرژەوەندییەکان (المصالح)

بەرژەوەندییە تاکیەکان و کۆمەڵەکان و چینەکان دەورێکی گرنگ دەبینن لە شیکردنەوەی ڕامیاریدا . بەرژەوەندی بریتیە لە سودێك یا قازانجێك لە کارێك یا ئەنجامێك بەدەست دێت. ووتنی ئەوەی کە شتێك لە پێناوی کەسێکدا جیاواز دەبێت لەپێویستییەکانی ئەو کەسە یان ئارەزووەکانی : دەمەوێ بچم بۆ سینەما ئەمشەو لەگەڵ ئەوەشدا کەبەرژەوەندیم لە نوسینی ووتارێکدایە. لێرەدا شتێك دەچێتە ناو بیرکردنەوەی ئەقلانی یا بابەخدان بەئامانجە دورە مەوداکان بەرژەوەندی هەڵدەسەنگێنێت بەلأم ڕەنگە دور لە هەستی ئارەزووەوە بێت. لەوانیە کە هەندێك کەس وا بزانن کە بەرژەوەندییان لەبەدی هێنانی ئامانجێك دایە سەرەڕای ئەوەی ناتوانن لە ڕەفتاریاندا بیخەینە ڕوو جیاوازییەکی لەم جۆرەش لای زۆر شیکەرەوە پەسەندە دەبێت لەگەڵ ئەوەشدا کە هەندێك وای دەبینن کە بەرژەوەندیەکان دەبێت چارەسەر بکرێن بەو پێیەی بەباشی زانینی پیرۆزن، کە خۆی لە ڕەفتارێکی کرداریدا خۆی دەنوێنێ. بیرۆکەیەکی تریش هەیە کە زیاتر مایەی مشت و مڕە ئەویش بیرۆکەی بەرژەوەندییە بابەتییەکان یا ڕاستەقینەکانە. بەپێچەوانەی ئەو نموونەیەی کە لەسەرەوە خراوەتە ڕوو هیچ کەسێك هۆشیاری بەو بەرژەوەندییانە نیە یا بەتوندی دژی بێت. لەوانەیە هەندێك وای ببینن کە ئەندامی کۆمەڵەیەکی پیشەیی یاچینێك هاوبەشی لە بەرژەوەندییەکانی ئەو کۆمەڵەدا دەکات لە هەوڵدا بۆ بەدی هێنانی ئامانجە سەرجەمیەکان بەبێ ڕەچاوکردنی پێویستی و بەرژەوەندییە بینراوەکان.

شیکردنەوە لەڕوی بەرژەوەندییە ڕاستەقینەکانەوەبەو ڕایە پاڵپشت دەکرێت کە تاکەکان ئەو جۆرە بەرژەوەندیانەیانە ئەندێشە دەکەن ئەگەر ئەندێشەکانیان تووشی چەوساندنەوە نەبوو بوو لەوانی ترەوە یا ئەوان لە کاتێکدا لە ئایندەدا دەرك بەو بەرژەوەندیانە دەکەن یا تایبەتمەندییە بابەتیەکان نەك ئەندێشەی خۆییەکان چەمکی بەسودترن بۆ بنیات نانی شیکردنەوەی ڕامیاریی لەسەریان. ژمارەیەك بەرهەڵستیی جیاواز لەدژی ئەم ڕایانە وروژێنراوە: قسەکردن دەربارەی بەرژەوەندییەکان بەم جۆرە لەباشترین باردا سیمای خوازراوی هەیە چونکە زۆریەی تایبەتمەندییە کردارییەکانی تاکەکان فەرامۆش دەکرێت یا دور دەخرێتەوە .ئەو کارەش کە زیاتر دڵەڕاوکێ دەوروژێنێ ئەوەیە کە بیرۆکەی بەرژەوەندییە ڕاستەقینەکان وا دیارە بەرەو ستەمی سەرکردەی حیزبەکان یا سەپاندنی زۆرە ملییی بەهاکان دەچێت لە شیکەرەوە ڕامیارییەکانەوە یا هەر دوو جۆرەکە لە هەر یەکێکیشیاندا ئارەزووو بەرژەوەندییە ئەندێشەکراوەکانی تاك و کۆمەڵەکان دور دەخرێتەوە لە پێناوی بەرژەوەندی حوکمێکی تر بەسەر ئەوەی کە باشە.

لە کاتێکدا لەوانەیە ئەوە بسەلمێنرێت کە هەندێك تاك ئەندێشەی جیاواز لە بەرژەوەندییەکانیان هەبێت لە بارودۆخێکدا کە جیاوازە لە ئەزموونە کردارییەکەیان، زەحمەتە کە پاساوی یەك کۆمەڵ لەبارودۆخی جێگرەوە بدرێتەوە کەدەکرێت بوترێت ئەوە بەرەو ئەندێشەکان لەبارەی بەرژەوەندییە ڕاستەقینەکانەوە دەڕوات.

لە کۆتایدا بیرەکانی ئەو چینەی کە درا بووە پاڵ بەرژەوەندییە بابەتیەکان تووشی هێرشێکی توند بوو. کاتێکیش ئەم جۆرە بەرژەوەندیانە لە ڕووی ڕەفتاری کردارییەوە نانوێنرێت ئەوا هەندێك وای دائەنێن کە پەیوەندی بە هیچ شیکردنەوەیەکی جیهانی ڕامیاریی ڕاستەقینەوە نیە.

لەوانەیە بەرژەوەندییە ئەندێشەکراوەکان بنکەیەکی داوا لەسەر کار پێك بهێنرێت لە سیستمی ڕامیاریدا یا ڕەنگە کە بەرژەوەندییە هاوبەشەکان کۆمەڵی ڕێکخراو دروست بکات کە داوای هاوبەشی پێش کەش دەکات لەسەر بابەتە تایبەتەکان (هەڵمەتی

جـەك دامـاڵینی نـاوکی بـۆ نموونـە) یـا نوێنەرایـەتی بەرژەوەندییـە هاوبەشـەکانی کۆمەڵـەکان دەکـات لەپانتاییەکیفراوانـدا (کۆمەڵـە پیـشەییەکان وەك کۆمەڵـەی پزیشکی بەریتانی) .

قـسەکردن بـڵاوە دەربـارەی کۆمەڵـە ڕێکخراوەکـان وەك بریکارەکـانی کۆکرنـەوەی بەرژەوەندیـەکان و دیاریکردنیـان بـەوردی. بـیرو سەرچـاوە جیاوازەکـانی تاکـەکان کۆدەکاتـەوە لـەڕێی ڕێکخـستنی کۆمەڵەکانـەوە لـە شـێوەی داوای کـاری پتـەودا دایاندەچۆڕێنێت کە هەندێك جار پیی دەوترێت (مەسەلەکان) .

**See also : Behaviouralism ; interest Group ; issuse ;power ;structuralism.**
**Internal colonialism See : Colonial-Ism.**

## International politics ڕامیاریی نێو دەوڵەتی *(السياسة الدولية)*

بریتیـە لـە لایەنـە ڕامیارییـەکانی پەیوەندییـەکانی نێـوان دەوڵەتـەکان وەك ئـەو دەزگاو پرۆسە نێو دەوڵەتیانەی کە لە ڕێگەیەوە ئەم جۆرە پەیوەندییە هاوکارانە یـا ڕکابەرانە پیادە دەکرێت.

چەندین پەیڕەوی جیـاواز پـەرە پێـدراوە بـۆ لێکۆڵینـەوەی ڕامیـاریی نێودەوڵـەتی. لەوانەیـە پـەیڕەوی هێـزو پـەیڕەوەکانی ململانـێ و شـیکردنەوەی سیـستم وپـەیڕەوە دەزگاییـــەکان و شـــیکردنەوەی ڕامیارییـــەکان و پـــەیڕەوەکانی پەیوەندییـــەکان و جێبەجێکردنی نمونە شێوەییەکان وەك ئەو نموونانەی کەلە تیۆری یارییەکاندا بەکار هاتووە. هەروەك چۆن یارییەکان و لاسایکردنەوەو ڕێگـەکانی لێکۆڵینـەوەی یاریـەکان بەکار هاتوون وەك ئامرازی یاریدەدەر لە لێکۆڵینەوەی ئەو گریمانانەی کـە سـەبارەت بە ڕامیاریی نێو دەولەتی و تاقیکردنەوەیان.

ئەو بابەتانەش کە جێی بایەخن لە لێکۆڵینەوەی ڕامیاری نێو دەوڵەتیدا دانانی ڕامیارییە دەرەکیەکان و ئەو دەزگایانەیە کە لەڕێیانەوە جێبەجێدەکرێن (کەناڵە دیپلۆماسیە ڕەسمیەکان و ئامرازەکانی پروپاگەندەو ئاژانسە نێو دەوڵەتییەکان) وپەیوەندییەکانی نێوان ڕامیارییە دیپلۆماسی و سەربازیی – ستراتیژییەکانزهتد) . و کاریسیستمی ڕامیاریی نێو دەوڵەتی و سیستمە لقییە جیاوازەکانی ناوی (هاوپەیمانێتییەکان وەك پەیمانی ئەتڵەسی و ناوچەکانی وەك ئەمریکای لاتینی و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست) و شەڕو خۆلەشەڕ لادان و شوێن کەوتنی ڕامیاریی و ڕێکەوتنە کۆتاییەکان و پەیوەندییەکانی هێزو دەسەلات لەنێوان دەوڵەتەکاندا (وەك دابەشکردنەکانی هێزی دوو جەمسەر یا فرە جەمسەر و ڕێکخستنی دەزگا ڕامیارییە نێو دەوڵەتیەکان و چۆنیەتی کاریان و کۆمەڵە ڕامیارییە فرە دەوڵەتەکان (وەك بازاڕی ئەورووپی هاوبەش) دەگرێتەوە.

See also :Alliance ; bloc ; case-study
Method ;communications approach ;
Conflict approach ;game tehory ; gam-
Ing ; international relations ;simula-
Tion systems analysis.

## International پەیوەندییە نێو دەوڵەتیەکان (*العلاقات الدولية*) Relations

بریتیە لەو پەیوەندیانەی کەلەنێوان دەوڵەت و گەلەکانیدا هەیە و بایەخ بەو ڕامیارییانە دەدات کە لەبەرامبەر یەکتریدا پەیڕەوی دەکات و تایبەتن بەبەرژەوەندییە نیشتیمانی و ڕێگەکانی پەیوەندی کردنی بەکار هاتوو (وەك شەڕو سزا ئابوورییەکان و پروپاگەندە) ..هتد و کاری دەزگا نێو دەوڵەتییەکان و بەستنی هاوپەیمانێتی و دەستەکان و پەرەپێدانی یاسای نێو دەوڵەتی و دیاریکردنی نەریتە ئابوری

وكۆمەلآيەتی و ڕامیارییەكان و كردەوە ئاساییيە باوەكان.

بریتیە لە بوارێكی لێكۆڵینەوەی فرە لق كە بەتایبەتی زانستی ڕامیاریی و مێژوو یاسا و ئابوری و دەروون ناسی كۆمەلآیەتیو كۆمەلْناسی لەخۆ دەگرێت، لێكۆڵینەوەی ڕامیاریی نێو دەوڵەتیش بەشێكی سەرەكیی لێكۆڵینەوەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەكانە.

See also :International politics.

## Interpellation پرسین (الأستفسار)

ئامرازێكە كە لەهەندێك ئەنجومەنە نوێنەرایەتیەكاندا بەكار دێت بۆ مەبەستی دەسكەوتنی زانیاریی لە وەزیرێك لەڕێگەی پرسیارێكی نوسراوەوە كە سەبارەت بەهەندێك لایەنی ڕامیاریی یا بەڕێوەبردنی حكومییە كەوەزیر لییان بەر پرسیارە.

ئەمەیش لەپرسیارێكی زارەكی یا نوسراو (لەكاتی پرسیارەكاندا) كە ڕێكخستنێكی لەم جۆرەی تیایە نیزامی ترو گرنگترە. بەگشتی پێویستە كەپرسیارەكە پێش چەند ڕۆژێك ئارستەی وەزیر بكرێت و لەوانەیە مەرجی تریش لەئارادا بێت وەك لانی كەمی ئەو ئیمزایانەی كە لایەنگری ئەندامانی ئەنجومەنی یاسادانانن. ڕێنماییيەكانی ئەنجومەنی یاسادانان ئەوە ڕوون دەكەنەوە كە ئایا مشتومڕ یا دەنگدان بەدوای وەلآمی ڕاپرسیەكەدا دێت و ئایا مەرجەكانی ئەوە چین.

ئەم ئامرازە لەكۆماری فەرەنسیی پێنجەمدا بەكار هاتووەو تا ئێستاش لە هەر دوو ئەنجومەنی نوێنەرانی ئیتالی و سویسریدا بەكار دێت هەروەها لەشێوەی (پرسیارێكی گرنگدا) لە ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەڵمانیشدا بەكاردێ.

## Interventionism (دەست تێوەردان (*التدخلية*

بریتیە لە رامیاریی‌و پیادەکردنی رێکخستنی حکومی و دەست گرتن بەسەر کاروبارە ئابورییەکاندا زیاتر لەوەی کە پێویستە بۆ هێشتنەوەی چوارچێوەی بازاڕ و کۆکردنەوەی دەرامەتەکان. لەوانە دەست تێوەردان لەنێوان کۆمەڵ و دەست گرتن بەسەر نرخەکانداو خۆماڵیکردندا بێت و یا ئاراستەی بەرهەم هێنانی ناو خۆیی یا بازرگانیی دەرەکی بکرێت. هەندێك جاریش ئەو دەربڕینە فەرەنسییە (Dirijisme) بۆ وەسفکردنی ئەم جۆرە رامیارییە بەکار دێت، هەروەك چۆن زاراوەی (Stitism) واتە حوکمی دەوڵەتی بەزۆر بەکار دێت یا ئەو زاراوە فەرەنسییەی تر (Etitisme) ئەمە لەگکاتێکدا کە ئەوە بریتیە لەچەسپاندنێکی فراوانتر لەسەر رۆڵی دەوڵەت لە گۆڕانی کۆمەلایەتیدا.

هەروەها زاراوەکە بۆ وەسفکردنی ئەو رامیارییە دەرەکییەش بەکار دێت کەبەشداری چالاکیی لەخۆ گرتووە،بەتایبەتی سەربازیی لە کاروبارە ناوخۆیی یا نێو دەوڵەتییەکانی دەوڵەتەکانی تردا، کاتێك کە بەرژەوەندیی راستەوخۆی دەوڵەتە دەستێوەر دراوەکە راستەوخۆ کاری تێ ناکرێت.

**See also : Corporatism (b) : Ideal type ; Free trade ; isolationism ; liberalism ; Nationalization ; new right ; privatisa-Tion ; state capitalism.**

## Iron Law of Oligarchy ياساى كەمینەى ئاسنین (قانون الاقلية الحديدي)

گریمانەیەکە ڕۆبورت میکلیز داینـاوە لەساڵی 1912 کە کورتەکەی ئەمەیە:

(ئەوەی قسە لە ڕێکخستن دەکات لەحوکمی کەمینە دەکات)، واتە هێزەکانی کار لە کۆمەڵە ڕێکخراوەکاندا دەبێتە هۆی دەست بەسەراگرتنی دەستە بژێر بەسەر ئەو کۆمەڵەدا. لەگەڵ ئەوەشدا کە مەبەست لەمە بریتیە لە جێبەجێکردنی یاسا بەسەر هەموو ڕێکخستنەکەدا بەڵام زۆر لەتیۆرەکە لەپشت یاساوە لەشیکردنەوەی مایکلز بۆ حیزبە ڕامیارییەکانەوە وەردەگرێت: حیزبەکان شوێن ئامانجی ئاڵۆز دەکەون بۆیە شارەزایی هونەریی و سەرکردایەتی دووشتی بنەڕەتین، ودەست بەسەراگرتنی سەرچاوە ڕێکخراوەییەکان مەڵبەندی سەرکردەکان پتەو دەکات لەپایەکەیدا ئەوانەی کە ئاوا لەژێر ڕکێفی ئەندامەکان بەرپرسیاریەتی بەرامبەریان قوتار دەبن، حیزبەکان پێویستیان بە پاڵپشتێکی جەماوەریی وا هەیە کە ببێتە هۆی خاوکردنەوەی ئایدۆلۆژیا، سەرکردەکانیش وایان لێ دێت کە لەڕووی ئایدۆلۆژیی مادییەوە لە ئەندامە ئاساییەکانی حیزب دادەبڕێن، و گوێ پێنەدانی ڕامیاریی و مل کەچ بوونی زۆربەی ئەندامانی حیزب و دەنگدەرانی بۆی ئەم مەیلانە زیاتر دەچەسپێنێ بۆ دورکەوتنەوە لە ئامانجە ڕەسەنەکانی حیزب بەرەو ئەو ئامانجانەی کە پایەی سەرکردەکان پتەوتر دەکات.

See also : Elite ; embourgeoismement ; Oligarchy.

## Isolationism دورەپەرێزی (الانعزالية)

بریتیە لەلایەنگیریی کردن و پیادەکردنی ڕامیارییەکی دەرەکی کە لەسەر بناغەی کشانەوە لە ڕامیاریی نێو دەوڵەتی و بێ لایەنی لە ناکۆکییە نێو دەوڵەتییەکاندا

دامـەزراوە، بەلایـەنی کەمـەوە مـادەم ئەمـە کـار ناکـات سـەر هـیچ بەرژەوەندیـەکی هەنووکەیی یا گرنگی ئەو نەتەوەیە.

دورە پەرێزی کارێکە کە چەندین جار لە رامیاریی ئەمەریکیدا دەرکەوتووەو بووەتە هۆی بەرهەڵستکارییەکی بەهێز بۆ رامیارییەکانی سەرۆک دیدرۆ ویڵسن پاش شەڕی جیهانی یەکـەم. دورە پـەرێزیی وەك ئایدۆلۆژیایـەکی جێبـەجێکراو پەیوەنـدە بـە رامیاریی ئەمەریکاوە کە رێبازی مۆنرۆ کورتی کردوەتەوە لەساڵی 1823داو دواتریش بەشێوەیەکی پچڕ پچڕ دوبارە بووەتەوە. ئەم رێبازە دورە پەرێزانە بووە لەمانایـەکی سـنوورداردا چـونکە بـە چەسـەپاندنی مافـەکانی ئەمـەریکاو بەرپرسـیارییەکانییەوە پەیوەنـد بـووە کـە هـەردوو کیـشوەری ئەمـەریکا دەگرێتـەوە و دورخـستنەوەی دەسـتێوەردانی ئـەورووپی لـەو ناوچـەیەدا سـەرباری خـۆ بـەدورگرتنی ئەمـەریکا لـە تێوەگلان لە ململانێی رامیاریی جیهانیدا.

See also :Interventionism.

## Issues مەسەلەکان (القضایا)

بریتیە لەو مەسـەلانەی کـە دوو کۆمـەڵی جیـاواز یـا زیـاتر لـە بەرامبەریـدا یـەك دەگـرن لەهەڵوێـستەکان کـە لەوانەیـە کێـشەیەك بـوروژێنێ، سروشتیـشە کـە تـەنها کەمینەیـەك لـە هەڵوێـستە جیاوازەکـان ململانێیـەکی کرداریـی دەوروژێـنن و تـەنها کەمینەیەکیش لەو هەڵوێستانە ئەو ململانێیـە دەردەخـەن کـە دەگوازرێتـەوە بـۆ نـاو سیستمی رامیاریی و پێی یەکلایی دەکرێتەوە.

بۆیـــە شـــێوازی پێناســـەکردنی (مەســـەلە رامیاریـــەکان) و دیاریکردنیـــان لەشیکردنەوەی رامیارییـدا بابەتێکـە کـە مایـەی ناکۆکییـە. لەلێکۆڵینـەوەکانی هێـزی رامیارییدا بۆ نموونە، رەوشی ئەوانەی کە بانگەشەی فرەیی دەکەن بـۆ پـەیرەوکردنی

ڕێبازێکی ڕەفتاریی چرکراوە لەمەسەلە ڕامیاریە سنوردارەکاندا لە ڕێگەی ململانێیەکی ئاشکراوە کە جێی بایەخی ڕەگەزە گرنگەکانی ناو سیستمی ڕامیارییە. وا دیارە ئەمەش بۆ خۆی ڕێسایەکی تەسکی لێکۆڵینەوەکانە چونکە گرفتی هەڵوێست و پێویستی و بەرژەوەندییەکان ...هتد پشت گوێ دەخات.

(دەنگدەران لە سەر مەسەلەکان) دەربڕینێکە کە هەندێك جار بۆ وەسفکردنی هەڵبژادنی ئەو دەنگدانە بەکاردێت کە بە دیارکردنی ئەو ڕامیاریە دیاریکراوانە بڕیاری لەسەر دەدرێت کە حیزبە ڕکابەرەکان پەیڕەویی دەکەن بەپێچەوانەی ئەو دەنگدانەی بە وەلای حیزبی بوون دیاری دەکرێن (مەسەلەکانی هەڵوێستەکان) بریتیە لەوانەی کە حیزبە ڕکابەرەکان هەڵوێستی ڕامیاریی جیاواز لەبەرامبەریاندا وەردەگرن و (مەسەلەکانی هاو هێزیش) بریتین لەو مەسەلانەی کە ناکۆکیی ئایدۆلۆژیی بەرجەستە ناکات لەنێوان حیزبەکاندا کە هەڵبژاردنی دەنگدانی دەبێتە حوکمێك لەسەر توانستی بەرز یا شێوازی پەسەندی حیزبی هەڵبژاردە.

See also : Agend setting ;behavioural-Ism ; cleavage ; dealignment ; non-Decision ;party identification ; plural-Ism ; realignment.

# J

## Judicial Legislation (التشريع القضائي) یاساданانی دادپەروەری

بریتیە لەو ڕێساو ڕوون کردنـەوە حوکمانـەی کـە ئەنـدامانی دەسـەڵاتی دادوەریـی دەری دەکـەن و کاریگـەریی خـستنە سـەری هەیـە بـۆ نـاوەڕۆکی یاسـا یـا گـۆڕینی. لەوانەیە ئەمە لەئەنجامی پەنهانییەکی پێشووەوە بێت کە لـە بـۆ ڕژێمێـك ماوەتـەوەو لەڕێی دادوەرییەوە یەکلایی دەکرێتەوە. یاسادانانی دادوەریی بە تایبـەتی پەیوەنـدە بـە لایەنـەکانی چـالاکی دادوەرییـەوە: مـەیلی هەنـدێك لـە دادوەرەکـان بـۆ زیـاتردور ڕۆیـشتن لـە تـەنها ڕاگەیانـدنی سیـستمێك یـا بڕیـارێکی حکـومی نادەسـتوری و پێشنیارکردنی ئەو سنورانەی کە دەسـتکاری کراوەکـانی سیـستمەکان یـا بڕیارەکـان تیایدا پەسەندن. نموونەی ئەمەش ئەو زنجیرە بڕیارانەی دادگای دەستوریی کۆمـاری ئـەڵمانیای فیدراڵیـە لەسـاڵەکانی 1958 و 1966 و 1968 سـەبارەت بەشـێوە و ئاستە گونجاوەکانی کۆمەکە حکومییەکان بۆ حیزبە ڕامیارییەکان.

**See also :Judicial review ;judiciary ;**
**Law (b) : stipulative law.**

## Judicial Review (المراجعة القضائية) پیاچوونەوەی دادوەریی

پرۆسەیەکە کە دادگایەك یا ئەنجومەنێکی دادوەریی کە پێك هاتووە لە ئەنـدامانی دەستەی دادوەری دەستوری ئەو یاساو ڕێساو ڕێ و ڕەسم و کارەکانی هـەر دوو لقـی

یاسادانان و جێبەجێکردنی تیایدا بڕیار ئەدرێت.
بەم شێوەیە ئەمە یەکێکە لە ڕێگەکانی یەکلاکردنەوەی ئەو ناکۆکییانەی کە سەبارەت بە لێکدانەوەی دەستوری نوسراو یا نەنوسراون، بەڵام ئەمە لەهەموو دەوڵەتەکاندا نیە چونکە بەندە بە پەسەندکردنی باری سەربەخۆی دەسەڵاتی دادوەرییەو ڕێزگرتن لە بڕیارەکانی. لە بەریتانیادا ڕێبازی باڵادەستی پەرلەمانی ڕێ لە دەرکەوتنی ئەم جۆرە ناکۆکییانە دەگرێت کەسەبارەت بە لێکدانەوەن (لەگەڵ ئەوەشدا کە دەسەڵاتی دادوەریی لەوانە ناچار بێت حوکم بدات، بەسەر ڕاستیی و دروستی بڕیارە وەزاریە پەیوەندیدارەکان بە یاسادانانی پەرلەمانی یا یاسای گشتییەوەن (لە دەوڵەتە یەك حیزبیەکاندا یەکلاکردنەوەی ناکۆکییەکان بەفەرمانی حیزبە، لەو دەوڵەتانەشدا کەحکومی ئاینیان تێدایە پیاوانی ئاینیی خۆیان بە تاقە لێکدەرەوەی گونجاوی یاسا دادەنێن پاشان دەستوریەتیش. پیاچوونەوەی دادوەریی بە تایبەتی لە دەوڵەتە فیدراڵییەکاندا هەیە کە بۆ یەکلاکردنەوەی ناکۆکییە دەستورییەکان بەکار دێت سەبارەت بەدابەشکردنی دەسەڵاتە مەڵبەندیی و خۆجێیەکان. بەم شێوەیە ئەمە گرنگە لە ئەمەریکادا (کە لەوێ دادگای باڵا دەسەڵاتی پیاچوونەوەی وەرگرتووە لەو بڕیارە گرنگەی داوای (مار بری) لەدژی مادیسن لە ساڵی 1803دا) . لە ئەڵمانیاشدا کە دەق یاسای بنەڕەتی (مادەی93) پێ لەسەر دامەزراندنی دادگایەکی دەستوری دادەگرێت بۆ پیاچوونەوەی دەستوریی حیزبە ڕامیارییەکان هەروەها لە ئوستراڵیاو هیندو کۆماری ئێرلەندا و کۆمەڵەی ئەورووپیشدا. لەوانەیە ئەو دادگایانەی کە پیاچوونەوەی دادوەریی ئەنجام ئەدەن دادگای دەستوری بن کە تەنها بایەخ بەمەسەلەکانی یاسای دەستوری دەدات (وەك ئەڵمانیا یا دادگا باڵاکان وەك ئەمەریکا کە وەك دەزگایەکی باڵاتر لە دادگای ئیستئناف کار دەکات لەبارە نادەستورییەکاندا.

**See also : Constitution ; constitutional Law ; judicial legislation ;judiciary.**

## Judiciary                                   دەسەلاتی دادوەریی (*السلطة القضائية*)

دەسەلاتی دادوەری ئەو لقەی حکومەتە کە بەر پرسیارە لە لێکدانەوەی رەسمی ئەو یاسایانەی کە ئەنجومەنی یاسادانان دایدەنێ و لقی جێبەجێکردن جێبەجێی دەکات یا بەپێی ڕێکەوتنامەیەکی نێو دەوڵەتی وەردەگیرێت (وەك لە دەوڵەتە ئەندامەکانی ناو کۆمەڵە ئەورووپی) داو لەو بارانەدا کە ناکۆکی بەمانای ئەم یاسایانە یان شەرعیەتیان و بەزانداتیان سەر هەڵئەدەن. هەروەها دەسەلاتی جێبەجێکردن بەر پرسیارە لەوەرگرتنی ئەو بریارانەی کە سەبارەت بە ئەنجامی ئەمجۆرە ناکۆکیانەن وەك سەپاندنی سزاکان (غەرامەو حوکمەکانی زیندانی کردن و نەفەقەو زیان بژاردن) . لەزۆربەی دەوڵەتە پێشکەتووەکاندا لەڕووی پیشەییەوە یا لەهەندێك باردا بەرهەم هێنراوە، ئەگەر چی هەندێك سیستمی دادوەری باوەڕی بەوە هەیە کە کەسانی ئاسایی لەدەستەی دادگادا بن و هەڵسەنگاندن لە ئەستۆ بگرن. لە ڕاستیدا هەڵبژاردنی داوەرەکان و پەیوەندییەکان بە پرۆسەی ڕامیارییەوە جێ دەستی بریارەکانیان لەیاسادا و ئەو هۆکارانەی کە کار لە بریارە دادوەرییەکان دەکەن هەموویان بابەت گەلێك بوون کە بایەخی توێژەرەوەکانی زانستی ڕامیارییان ورووژاندوە.

**See also : Adminstrative law;adminis-
Trative tribunal ;judicial review ;law (b) :
Stipulative law ; legislature ; separation of pow-
Ers.**

# L

## یاسا

**Law (a) :**
**Scientific Law** **(أ) یاسای زانستی (*القانون العلمي*)**

(ڕونکردنەوەیەکە کە وەسفی ئەو پەیوەندییانە دەکات کە ناگۆڕێن و گشتگرن یان لەوانەیە ڕووو بدەن لەناو ئەو جۆرانەی دیاردە پەسەند کراوەکاندا وەك شتێکی ڕاستەقینە لەسەر بناغەی بوونی بەڵگە.

یاسا گشتگرەکان هەموو بارەکانی جۆری دیاردەکان بێ بایەخ دان بە کات و شوێن وەسف دەکات بۆ نموونە، (هەر کاتێك یان لەهەر کوییەك کە (س) ڕوو بدات (ص) یش ڕو دەدات)، ئەو یاسیانەی کە لەوانەیە ڕوو بدەن دیاری دەکات (یا ئامارین) ڕوودانی پەیوەندییەکان دووبارە دەکاتەوە مەرجی (س) لەگەڵ باری ص دا لە 95٪بارەکاندا،زۆر جاریش ووتە ئاماریەکان زۆر وەك یاسا مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت ئەگەر چی دارشتنیان کەمتر ورد بێت، وەك (پەرەسەندنی دیموکراسیەت بەندە بە بزووتنەوەکانی چوون بەرەو کشتوکاڵی بازرگانیەوە )، یاساکانیش دەبنە بەشێکی بنەڕەتی زۆریەی شێوەکانی لێکدانەوەو زنجیرەکانی یاساکان کە بەشێوەیەکی ڕێك و پێك کۆ دەکرنەوە و بناغەی تیۆرەکە پێك دەهێنن.

لەوانەیە یاساکانی سروشت لە زانیارییە شیکردنەوەییەکان جیا بکرێتەوە کە بریتیە لە زانیاری ڕوونکردنەوەی ڕاست بە پێناس کردن نەوەك بە سروشتی جیهان (هەموو حکومەتەکان دەسەڵاتی ڕامیاری پیادە دەکەن) .. هەروەها یاسا زانستییەکان بەگشتی کردنی ئەزمون و گووتەکان جیا دەکرێنەوە، (هەموو سەرۆکەکانی ئەمەریکا پیاون) لەوانەیە ئەم جۆرە جیاکردنەوانە بە ڕواڵەت ماقوڵ بن

بەڵام لەڕاستیدا زۆر گیروگرفت دەوروژێنن لە پێناسەکردن و دیاریکردنی یاسای زانستیدا.

لەوانەیە بەتایبەتی جیاکردنەوەی نێوان یاسا ئامارییەکان و ڕوونکردنەوە ئامارییە لاوەکیەکان زۆر زەحمەت بێت.

زانستی ڕامیاریی گریمانەی زۆر کەمی بەرهەم هێناوە کە پێویستە شێوەییەکانی یاسایەکی کرداریی بەڕوونی بەجێ بێنێ و بە شێوەیەك چەسپاو بێت کە پەسەندیی هەمووان بەدەست بێنێت.

See also : Explanation ; falsification-
Ism :hypothesis ; theory ; verification

**(Law (b:**

**Stipulative Law** **یاسای مەرجدار** ***(القانون الاشتراطي)***

بریتیە لەو ڕێسا پەیڕەوکراوانە یاگریمانانەی ناو سیستمێکی ڕامیاریی کە ڕەفتاری هەموو کۆمەڵگا دیاری دەکات یا بەشێکی دیاریکراویش وەك شتێکی ڕێپێدراو دانی پێدا ئەنێت. ئەو یاسایانەی کە لەم جۆرەن و هەندێك جار بە یاسا پۆزەتیڤەکان ناو دەبرێت، وەسفی ناکا (بەراوردبکە **Law (a) : scientific law**) بەڵکو فەرمان ئەدا و بەسزا زۆرەملێیەکان پاڵپشتی دەکا وەك زیندانیکردن یا لە دەست دانی شمەك وەك ئەوەی کە دەسەڵاتە دادوەرییەکان دەیسەپێنن. لەوانەیە یاسا لەویستی پاشاوە یا ئەنجومەنێکی یاسادانان یا داب و نەریتەکانی کۆمەڵگاوە سەرچاوە بگرێت.

See also :Authority ;coericion ; cus-
Tom;judiciary ;legislature ; legitima-
Cy; positivism ; rule of law ; sovereign-
Ty.

**Law (c) : یاسای (ج)**

**یاسای سروشتی**

***(القانون الطبيعي)***

**Natural Law**

سیتمێکە بۆ بنەما ڕەوشتییەکان کە لەسەر هەموو مرۆڤ پێویستە پابەند بێت پێیەوە بەبێ ڕەچاوکردنی یاساو نەریتەکانی کۆمەڵگا دیاریکراوەکان، لەڕێگەی بەکارهێنانی ئەقڵەوە کە لەسەر ئاستی جیهان دانیان پێدانراوە. تیۆرەکانی یاسای سروشتی لەتیۆرەکانی گریکی کۆنەوە تا تیۆرەکانی ئێستا بۆ پێشکەش کردنی پێوەرە دەرەکییەکان بەکار هاتووە تا شەرعیەتی یاسا پۆزەتیڤەکانی پێ هەڵبسەنگێنرێت. لەسەردەمی نوێشدا زۆر جار تیۆرەکانی یاسای سروشتی بەبیرەکانی مافە سروشتیەکان و پەرەسەندنی تەوژمی ئازادەوە (لیبرالیزم) پەیوەند بووە.

**See also :Civil rights ; legitimacy ;lib-
Eralism.**

**Leadership سەرکردایەتی *(القيادة)***

سەرکردایەتی جۆرێکە لەڕەفتار کەمەبەستی ڕێکخستنی هەوڵەکانی کۆمەڵێکە بەرەو ئامانجە ویستراوەکان و ئاراستەکردنیان. ئەگەر ئەو ئامانجە ویستراوانەش ڕامیاری بوون ئەوا سەرکردایەتییەکی ڕامیاریی دەبێت.

ئەمەش ڕەفتارێکی بارودۆخییە، چونکە سەرکردایەتی پشت بە شێوە دیاریکراوەکانی سە .دەیەك و لایەنگرەکان و ئامانجەکان و ڕێگەکانی بەدی هێنانی

ئامانجەکان لە ژینگەیەکی دیاریکراودا دەبەستێ. پەسەندکردنی سەرکردایەتیش لە لایەن لایەنگرانەوە بەندە بەڕێزگرتنیان لەشەرعیەتی ئەو سەرکردەیە لەگەڵ لێوەشاوەیی چاوەڕوانکراو لەو سەرکردەیە،، لەوانەیە ئەو شەرعیەتەش بەند بێت بەوەرگرتنی دەسەڵات لەلایەن سەرکردەوە بەشێوەیەکی ڕەسمی. نەخشەی ویبەری پۆلێنکەریی جۆرە نموونەییەکانی سەرکردایەتی پێ لەسەر جیاوازییەکان لە بنەماکانی پەسەندکردنی سەرکردایەتی دادەگرێت.

ویبەر ئەو سەرکردایەتیە بەهرەدارە جیا دەکاتەوە کاتێك کە سەرکردەکان گوێڕایەڵیان دەکرێت چونکە خاوەنی تایبەتمەندی ناوازە یا سیحرین لەگەڵ ئەو سەرکردایەتییە ئاساییەی کە تیایدا سەرکردەکان گوێڕایەڵیان بکرێت چونکە پایەیەکیان هەیە لەکۆمەڵگادا کە مافی ئەوەیان پێ ئەدات کە گوێڕایەڵیان بکرێت. بۆ نموونە بەهۆی لەدایك بوونەوە لە بنەماڵەیەك یا چینێکی فەرمانڕەوادا، وسەرکردایەتی یاسایی –ئەقلانی کە لەسەر بناغەی دەسەلاتێك دامەزراوە و لەکۆمەڵێکە وە سەرچاوەی گرتووە کە بەشێوەیەکی ئەقلانی کەلە بنەماو ڕێ و شوێنەکانەوە چەسپێنراوە.

سەرباری بنکەی دەسەڵاتی سەرکردایەتی ئەواشێوازەکانی سەرکردایەتیش جۆراو جۆرن.هەندێك لەسەرکردەکان ئامرازەکانی قەناعەت پێکردن بەکار دێنن و هەندێکی تر ئامرازەکانی سەپاندن و هەندێکی تریشیان ئامرازەکانی لێك گەیشتن پەیڕەو دەکەن، لێکۆڵینەوەی ئەم جۆرە شێوازە جیاوازانە یەکێکە لەبوارەکانی دەرون ناسی ڕامیاریی. وا دیارە ڕادەی پێویست بەندە بە بوونی یەکێك لەو شێوازانەوە نەوەك بەتوانای هەڵبژاردنی ئەو شێوازانەو گونجاندنیان لە چوارچێوەی ئەو ئەرك و ئامرازانەی کە لەبەر دەست دان و ڕوالەتی لایەنگرەکان. جیاوازییەکانی نێوان (ترۆتسکی و ستالین و چەرچل و ئەتلی و ڕۆزفەلت و ترومن و برانت و کۆل) یش ئەو جۆرە جیاوازانەی شێوازی سەرکردایەتی و ئاستەکانی سەرکەوتنی سەرکردایەتی لەدەولەتە نوێکاندا ڕوون دەکاتەوە، دەستخستنی سەرکردە ڕامیارییەکان لە ڕێگا

جیاوازەکانی ڕۆشنبیرییە ڕامیارییە جیاوازەکانەوە دابین دەکرێت .

شێوازەکانی فێرکردن و جیاوازییەکانی نێوان چینە کۆمەڵایەتییەکان و جۆرەکانی مەڵبەندی سەرکردەیی و ئەو کۆت و بەندانەی کەبەسەر پاڵێوراوەکاندا سەپێنراوە (لەژنان و ئەندامانی کەمینە ڕەگەزیی یا ئایینیەکان و ئەو خەڵکانەی کە لە تەمەنێکی دیاریکراودا نین) هەموو ئەمانە کار دەکەن سەر پەیدا بوونی سەرکردەکان.

بێجگە لەمەیش لەو مەسەلە گرنگانەی کەدەبێت تێبینی بکرێت ئەوەیە کەپرۆسەی نیزامی و نانیزامیەکان کار دەکەنە سەر هەڵبژاردنی سەرکردەکان، هەروەها ڕەنگە کێشەیەك کە لەئارادا هەیە ببێتە هۆی سەرهەڵدانی سەرکردەیەکی چاوەڕوان نەکراو کە بێت و ئەو پۆستە وەربگرێت، هیتلر و چرچڵ و دیگۆل.

**See also: Authority; dictat- orship;
Elite; ideal type: legitimacy; political
Psychology;ruling class.**

## Legislature ئەنجومەنی یاسادانان (*المجلس التشریعي*)

ئەو دامەزراوە حکومیەیە کە دەسەڵاتی دانان و ڕێکسازی و هەڵوەشاندنەوەی یاساکانی کۆمەڵگا هەیە .

دەکرێت ئەنجومەنەکەیش هەڵبژێراو بێت یا بۆی مابێتەوە لەپێکهاتنیدا یاناوێتەیەك بێت لیی: ڕەنگە لەیەك ئەنجومەن یا کۆمەڵە ئەنجومەنێك پێك بێت: لەزۆربەی دەوڵەتەکاندا شێوەی دوانیەتی یان پێ باشە لەئەنجومەنی یاسادانانا. بۆ ڕێزگرتن لە بنەمای جیاکردنەوە لەنێوان دەسەڵاتەکاندا زۆرێك لەدەوڵەتەکان دامەزراوەی سەرۆکی جۆراو جۆر بۆیاسادانان و کارگێڕی لەخۆ دەگرن. بەڵام لەلایەنی ڕامیارییەوە ئەوا قورسە بتوانرێت جیاکردنەوەیەکی ڕەها لەوەزیفەدا بکرێت و زۆر جاریش دەسەڵاتە یاسادانانە پێدراوەکان دەدرێنە دەست جێبەجێکەرەکان.

See also : Biocameral ; delegated ;
**Legislation ; executive ; separation of**

Powers.

## Legitimacy (الشرعية) شەرعیەت

ڕواڵەتێك بۆ پیادەکردنی دەسەلاَتی ڕامیاریی کاتێك کە بزانرێت ئەو دەسەلاَتە بەپێی ڕێبازو پیادەکردنێکی دیاریکراو دەڕوات بەڕێوە. لەوانەیە زاراوەکە وەك پێوانەیی یا پۆزەتیڤی یا وەسفی بەکار بێت: پێی دەوترێت پێوانەیی لەو کاتەدا کە حوکم بەسەر دەسەلاَتێکدا دەدرێت بەوەی کە شایەنی پەسەندکردنە بە پێی کۆمەلێکی پتەوی پێوەرەکان یان حەق وداد، وەك پۆزەتیڤیش کاتێك کە دەسەلاَت لە چوار چێوەی ئەو کۆت و بەندانەدا پیادە دەکرێت کە یاساو دەستور لەلایەن کەسەکانەوەو بەپێی ڕێ و شوێنە دیاریکراوەکان دایدەنێن وەك وەسفیش ئەو کاتێك بەکار دێ کە دەسەلاَت بەگشتی پەسەندە لەلایەن ئەوانەی کە لە گەلیاندا پیادە دەکرێ بە پێی ئەو ڕێبازانەی کە هەلیدەگرن. زانستی ڕامیاریی بە تایبەتی بایەخ بەو ئایدۆلۆژیاو مومارەسانە دەدات کە بەڕاستی لەسیستمێکدا هەن بۆیە (شەرعیەت) لەمانای وەسفیدابەکار دێنێ. سروشتی وردی ئەو ڕێبازو پیادەکردنانەیش کە شەرعیەت دەبەخشن لەکۆمەلگایەکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێ و بەتێپەڕ بوونی کات : لەو نمونە باوانەش دەسەلاَتی خوداوەندی و یاسای سروشتی و ڕێك کردنی دەستوری و حوکمی یاساو بڕیارە دیموکراتیەکان یاهەلبژاردنەکان یا بۆ ماوە.

لەڕاستیدا شەرعیەت گرنگە لە کاری حکومەت و مانەوەی سستمی ڕامیاریدا. هەموو حوکمەکەش بە تەواوی پشت بەحەقی خۆی دەبەستێ لە پیادەکردنی دەسەلاَتدا هەتا ئەگەر ئەو باوەڕە کۆمەلیش نەبێ و هەندێ جار بەند بێ بە چەند ڕەگەزێکی سەرەکیی دەزگای دەولەت لەبەر ئەوە حکومەتەکان هەولی ئەوە دەدەن کە پاساوی شێوەی حوکمەکەیان و ناوەڕۆکەکەی بەگەڕانەوە بۆ ئەو بنەمایانەی

کەزیاتر قایلکەر دیارە بهێننەوە. بەرهەم هێنانی ئایدۆلۆژیا گونجاوەکان، چ لە رێگەی دروست کردنی هۆشیارانە لای کۆمەڵە فەرمانڕەواکانەوە بێت یا بە پرۆسە کۆمەڵایەتیە نا ئەنقەستەکان بە (چەسپاندنی شەرعیەت) وەسف دەکرێت.

چەسپاندنی شەرعیەتیش بەشێوەیەکی کۆتایی بەدی نایەت و دەبێت پرۆسەیەکی بەردەوام بێت و بەشێوەیکی بەردەوامیش رێك بکرێت تا لەگەڵ گۆڕانە نوییەکان بۆ ژیانی رامیاریی و گۆڕانی بارودۆخدا بمێنێتەوە. ئەمەش چەندین کێشە دروست دەکات : لەوانەیە رژێمەکە شەرعیەتی خۆی بۆ نموونە لە چەسپاندنی پابەند بوون بە رێبازێکی ئایدۆلۆژییەوە وەربگرێت، کە پەیوەستە بەو پەیوەندییە گونجاوەی نێوان حکومەت و دەزگا کۆمەڵایەتیەکانەوە، بەڵام لەڕوو بەڕوو بوونەوەی سەختییە کۆمەڵایەتیەکان.

لەوانەیە هەڕەشە لەو رێو شوێنانە بکات کە قایلکەرن بە پێچەوانەی ئەوەوە شەرعیەتی رژێمەکە: کاتێك کە حکومەتە دیموکراسییە ئازادەکان رامیاریی دەستێوەردەرانە پەیڕەو دەکەن یا کاتێك کەحکومەتەکۆمۆنیستیەکان هەوڵ دەدەن کە ئابوری ئازاد بکەن. ئەگەر ئەم جۆرە رامیارییانەی جێبەجێکرد ئەوا شەرعیەت لاواز دەکات و نایەکسانی و چەوساندنەوە مەیلی حکومەت بەلای بەباشتر زانینی هەندێك بەرژەوەندیدا زیاتر ئاشکرا دەکات. لە هەندێك باری دەگمەنیشدا (قەیرانی چەسپاندنی شەرعیەت) دەوروژێنێ کە هەڕەشە لە بنکەی سستمی حکوم دەکات. وەکو خودی شەرعیەتیش ئەوا پرۆسەی سەلماندنی شەرعیەت خۆی لە پیادەکردنی دەسەڵاتی رامیاریدا دەبینێتەوە بەڵکو کۆت و بەندیش بەسەر پیادەکردنیدا دەسەپێنێ.

See also : Authority ;constitution; Contradiction;hegemony ; ideology ; Law (b) : stipulative law ; law (c) : nat-Tion ; power ; state.
See : bolshevism

پەیڕەوێکە لە بیری ڕامیاریدا لەبەهای ئازادی تاکە کەسی و پەیوەندییە بە دەوڵەتەوە چڕ دەبێتەوە. دەوترێت کە تاکەکان ئەو مافانەیان هەیە کەزۆرجار (مافی سروشتین) و بوونیان سەربەخۆیە لە حکومەت و تەنانەت لەکۆمەڵگاش وەبنکەی کۆت و بەندە دەستورییەکان پێك دەهێن لەسەر دەسەڵاتی ڕێ پێدراوی حکومەت. ئەم جۆرە مافانە بریتین لە چێژ وەرگرتنی ئارام لەژیان و ئازادیی و خاوەنداریی ئازادی قسەکردن و چوونە ناو کۆمەڵەکانەوە. ئەرکی حکومەتیش بریتییە لە ڕێزگرتن لەم مافانە و پاراستنیان و ڕێگەدان بە تاکەکان بۆ هەوڵ دان لەپێناوی بەدی هێنانی ئامانجە هەڵبژێراوەکانیان لەگەڵ ڕێزگرتن لەمافەکانی ئەوانی تر.

گەوهەری لیبرالیزمی کلاسیکی دەتوانرێت کە لە دوادوایی سەدەی هەقدەوە دیاری بکرێت بەتایبەتی لەئینگلتەرا لەنوسینەکانی جۆن لۆك دا، پەرەسەندنی سنورداری حکومەت هاو تەریبە لەگەڵ لابردنی کۆت و بەندەکانی دەوڵەت لەسەر بەرهەم و بازرگانی. لیبرالیزم لەم مانایەدا بەشێوەیەکی پتەو بەلانی کەمی دەسەڵاتی حکومەتەوە پەیوەستە، چونکە حکومەت تەنها بریتییە لە ئامرازێك بۆ هێشتنەوەی چوار چێوەی کۆمەڵایەتی و ڕامیاریی پێویست بۆ کاری تاکە کەسی ئازاد.

هەر چۆنێك بێت لیبرالیزم لە بەشی دووەمی سەدەی نۆزدەدا دیدگایەکی زۆر پۆزەتیڤی پەیڕەو کردوە بەوەی کە حکومەت دەبێت ڕێ بە بەشداریی دیموکراسی بدات و ئەو مافانەی کە پەیوەندن بە تەندروستی و چاودێری و خوێندن فراوان بکات بە مەبەستی هاندانی ئەو هاوڵاتییە تاکەی کە دەتوانێت ئامانجە گونجاوەکان بەشێوەیەکی ئەقڵانی هەڵبژێرێت.

ئەم گۆڕانە لە مانای لیبرالیزمدا سروشتی بەر فراوان و پەنهانی ئەم پەیڕەوە ڕوون دەکاتەوە، لیبرالیزم بۆ وەرگرتنی ئاڕاستەکەی بای داوە بەلای ئەو بیرو گرفتانەدا کە پەرەیان پێداوە لە ئەورووپای کیشوەریدا. بۆ نموونە لیبرالیزم بە

نەتەوەییەوە پەیوەند بووە چونکە ئەم پەیوەند بوونە پشت بە بوونی هێزە بەرهەڵستکارەکانی ڕزگاری و چەوساندنەوەی نیشتیمانی دەبەستێت زیاتر لە هەر پەیوەندییەکی پێویستی تری نێوان ئەم دوو پەیڕەوە لەوانەیە جیاکردنەوەی لیبرالیزمی ئابوری لە لیبرالیزمی ڕامیاری شتێکی بەسود بێت چونکە ڕامیاری جەخت دەکاتە سەر لایەنە جیاوازەکانی چالاکی و مافەکانی تاك، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە تێورو پراکتیکدا بەگشتی پێکەوە گرێ دراوە. حکومەت (بۆنموونە چیلی لە هەردوو دەیەی حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی بیستدا) لەوانەیە هەوڵ بدات کە پارێزگاریی لەچوار چێوەی بازاڕی کراوە بکات لەگۆڕەپانی ئابوریدا بەڵام لەهەمان کاتدا ئازادی ڕامیاریی کۆت دەکات.

**See also ; Citizen ; conservatism ;con-
Tract theory ;ideology law (c) :natu-
Ral law ; nationalism ; new right ;pul-
Ralism ;radicalism ; social social contract ;
Utilitarianism ; welfare stste.**

## List System سیستەمی لیستەکان (نظام القوائم)

سیستمێکی هەڵبژاردنە کەبەپێی نوێنەرایەتی کردنی ڕێژەیی حیزب و کۆمەڵە لەیەك چووەکان بەڕێوە دەچێ کە هەر یەکەیان لیستی پاڵێوراوەکانی خۆی پێشکەش دەکات و پاشان دەنگدەر دەنگی خۆی دەداتە یەکێك لەو لیستانە ئەنجا بەشێوەیەکی ئاسایی هەڵبژاردنی پاڵوراوەکان ڕادەگەیەنرێ بەپێی ڕیزبەندییان لەلیسەکەدا. لە هەندێ سیستەمدا دەنگدەر دەتوانێ کە ناوەڕۆکی لیستەکە یان ڕیزبەندییەکەی بگۆڕێت (یا هەر دووکیان بکات) . دەکرێت کە زۆر ڕێگەی جیاواز بەکار بهێنرێت بۆ حساب کردنی دەنگەکان و گەیشتن بە ئەنجامەکە لە ڕووی ئامادەکردنی کورسیەکانەوە وەك ڕێگەی هارا–نمایر کە ئێستا لە ئەڵمانیا بەکار دێت

و ڕێگەی دۆنت. ڕێگەی لیستەکان، لە سیستەمە هەڵبژاردنیەکانی بەلیجیکاو فیلەنداو سویسرا بەکار دێت.

See also : Cumlativevote;d,Hondtmethod ; Electoralsystem ;Hare-
Niemeyer Method ;porportional repre-
Sentation.

## Lobby کۆمەڵی فشار (*مجموعة الضغط*)

ئەم زاراوەیە چەندین مانای پێکەوە گرێ دراوی هەیە. فرمانی (to lobby) (فشار پیادە دەکا) بەمانای پیادەکردنی دەسەلآت بەکار دێت بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لەسەر یاسادانەرەکان بەمەبەستی قایلکردنیان یا ناچار کردنیان بەوەرگرتنی بڕیارێك لەبەرژەوەندیی فشار پیادەکارانە.

لەچوار چێوەی پیادەکردنە پەرلەمانییەکانی بەریتانیەکانیشدا زاراوەی (lobbs) ئاماژەیە بەو ناوچەیە لەهۆڵەکانی پەرلەماندا بەلآم لەهۆڵە یاسادانانییەکاندا نا کەلەوانەیە لەوێ ئەندامانی پەرلەمان و لۆردەکان بەو ڕۆژنامەوانانە بگەنکە باری جیاکەرەوەیان پێبەخشراوە (پەیامنێری کاریگەریی) کە پێیان دەوترێت کۆمەڵی فشار) .

لەگەڵ ئەوەشدا کە هەندێك دەسەلآت بەکار هێنانی بەرفراوانتری ئەم زاراوەیە بەباشتر دەزانێ بەشێوەیەك کە هاو واتای کۆمەڵەکانی بەرژەوەندی بێت (وەك :
See S-E.Finer:Anonymous
Eupier: A study of the (obby in Great Britiain.
Pall mall press, 1958,esp (chapter;
(what is the lobby))

بەلآم هەندێکی تر پێناسەیەکی ئاڵۆزتریان پێ باشترە، ئەم پێنایەش کۆمەڵی فشار ( A lobby) لە کۆمەڵەکانی بەرژەوەندی جیادەکاتەوە بەبەکارهێنانی

زاراوەکە بۆ وەسفی کۆمەڵە ڕێکخراویەکان بەتایبەتی بەمەبەستی کارکردنە سەر یاسادانەرەکان لەگەڵ ئەوەشدا کەئەم جۆرە کۆمەڵانە لەوانەیە لەکۆمەڵی ترەوە دروست ببن کە بۆ نازناوی کۆمەڵێ بەرژەوەندی ئامادەیە چونکە چالاکییەکانی تەنها بەند نیە بەو جۆرە هەوڵانە بۆ کارکردنە سەر یاسادانەرەکان. نموونەی کۆمەڵەکانی فشاریش بریتین لەو کۆمەڵانەی کە بۆ پشتگیریی و بەرگری لەبەکارهێنانی تەلەفزیۆنی بازرگانی لەبەریتانیا پێ هاتوون و کۆمەڵی فشاری پشتگیریکردنی گواستنەوە بە ڕێگاکان لە بەریتانیادا، کۆمەڵی فشار لەپێناوی نمایشی ڕەسمی گواستنەوە بەڕێگاکان لەئەڵمانیا و کۆمەڵی پشتگیریی حەوزەکانی پەروەردەی ماسی لە نەرویج، و کۆمەڵەی جەنگاوەرە پێشینەکان لە ئەمەریکا و کۆمەڵی بەرهەمهێنەرانی مەی لەفەرەنسا.

ئەندامی کۆمەڵی فشار (**Lobbyist**) یا بریکاری کۆمەڵەکە کەسێکە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ نوێنەرایەتی بیروڕای کۆمەڵی فشار دەکات لای یاسادانەرەکان: بۆ نموونە لە ئەمەریکا کەسانێکی زۆر هەن کەکرێ وەردەگرن بۆ پیادەکردنی ئەم ئەرکە و بەپێی یاسای فیدراڵی بۆ ڕێکخستنی پیادەکردنی فشاری ساڵی 1946 تۆمارکراون. لەبەریتانیاشدا حوکمی لەم جۆرە نیە لەگەڵ ئەوەشدا کە لێژنەکانی فشار و کۆمپانیاکانی فشار هەن و هەندێك جار پێیان دەڵێن (ڕاوێژکارە پەرلەمانیەکان) .

**See also : Interestgroup ;interests.**

## Local Government حوکمی خۆجێیی (*الحكم المحلي*)

حوکمی خۆجێی ئەو پرۆسەیەیە کە فەرمان و خزمەتگوزاریی گشتی دیاریکراوی پێ جێبەجێ دەکرێت لە کۆمەڵێکدا لەو یەکە هەرێمیانەی کە یەکە لقیە کارگێڕیی و ڕامیارییەکانی دەوڵەت پێك دێنن.

مەودای ئەو فەرمانە خزمەتگوزارییانەش لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی تر

بەتێپەڕ بوونی کات جیاواز دەبێت بەلاّم بەگشتی لەپیادەکردنی ئەو دەسەلاّتە پێدراوانەوە پێك دێت کە پاڵپشت کراوە بە باش هەڵسەنگاندنێك کە دەیبەخشێتە دەسەلاّتە خۆجێییەکانی دەوڵەت بەپێی دەستورو حوکمە یاسادانانییەکانی‌تر. پێویستە کە تێبینی ئەوەش بکرێت کەئاژانسی مەیدانی سەر بەدەوڵەت لەوانەیە کە فەرمانی خۆجێیەتی تر جێبەجێ بکات لەباتی فەرمانگەکانی دەسەلاّتی حوکمی خۆجێیی.

زۆر گۆڕاوی گرنگ لەحوکمی خۆجێیەتیدا هەیە وەك پەیکەری ڕێکخراوەیی دەسەلاّتە خۆجێیەکان و کایەی ئەو فەرمانانەی کە بەم دەسەلاّتانەوە پەیوەندن (بەتایبەتی لەنێوان دەسەلاّتە فرە مەبەستەکان و دەسەلاّتە تاك مەبەستەکان کە مامەڵە لەگەڵ فەرمانێکی دیاریکراودا دەکات وەك دەسەلاّتە تەندروستیە هەرێمییەکان لە بەریتانیا یا ئەنجومەنەکانی بەڕێوەبردنی قوتابخانەکان لە ئەمەریکا)،و هەڵبژاردنی ئەندامانی دەسەلاّتە خۆجێیەکان یادانانیان لەکاتی هەڵبژاردنی شێوەی هەڵبژاردن و دووبارە بوونەوەی و شێوەکانی کۆمەکی حوکمی خۆجێیی و سەرچاوەکانی و پەیکەری لەیەکەی حوکمی خۆجێیدا، لە سیستمە فیدراڵییەکاندا لەوانەیە ئەم جۆرە گۆڕاوانە جیاوازبێت بۆ نموونە لەنێوان پارێزگایەك و یەکێکی تردا وەك لە ویلایەتەکانی ئەمەریکاو ئەڵمانیادا) . هەروەها پێویستە کە ئەو ڕێکخراوەی حوکمە خۆجێییە کە تێیدا یەکە خۆجێییەکان هیچ دەسەلاّتێکی ڕێپێدراوی سەربەخۆیان لە حکومەتی ناوەندیدا نییە جیا بکرێتەوە لەو سیستمە فیدراڵییانەی کە یەکە فیدراڵیەکان تیایاندا، ئەم دەسەلاّتە سەربەخۆیەیان هەیە.

See also :Devolution ;federation.

## Lag-rolling سازشی پەرلەمانی (*المساومة البرلمانية*)

پرۆسەیەکی سازشی تۆڵە سەندنەوەیە لە نێوان ئەندامانی دەستەی یاسادانانداندا (بۆ نموونە کۆنگرێسی ئەمەریکی و لیژنەکانی) بەوەی یەکێك لە یاسادانەرەکان بەڵێن

دەدا كە دەنگ بداتە پرۆژەیەك –یاسایەك یا تایبەتكردنێك كە یاسادانەرێكی تر لایەنگیریی دەكاو وا چاوەڕێ دەكا كە لە بەرامبەردا پشتگیری ئەو لای دەست بكەوێ لە كاتێكی ترلەئایندەدا.

ئەمەیش زاراوەیەكە دەكرێت جێبەجێ بكرێت بەتایبەتی لەئەمەریكا بەلاّم دیاردەكە سنوردار كراوە لەهەر دەستەیەكی یاسادانانداا كەتۆزێك ئازادیی هەڵبژاردنی دەنگدەرانی تێدا بێت بۆیاسادانەرەكان (نەك ڕادەیەكی بەرزی دیسپلینی حیزبی) و دەنگی تۆماركراوی تێدایە (نەك دەنگدانی نهێنی) بۆ زامن كردنی پابەندبوون بەجێبەجێكردنی گرێبەستەكانەوە، ڕەنگە زاراوەكە بەو دەنگانەش بوترێت كە سەبارەت بە تایبەتكردنی پرۆژەكانی دابەشكردنن و بە (pork-barrel) ناسراون.

See also : pork-barrel.

## Longitudinal Studies (الدراسات الطولية) لێكۆڵینەوەكانی باری درێژیی

بریتیە لە لێكۆڵینەوەكانی بەردەوامی و گۆڕان لە بارێك یا بەهایەكی دیاردا لەماوە یەك بەدوای یەكەكاندا بیروڕای دەنگدەران و هەڵوێستەكانیان لەكاتی هەڵمەتی هەڵبژاردندا یا بەهۆی زنجیرەیەك هەڵبژاردنەوە لە ڕێگەی لێكۆڵینەوەیەكەوە كە دەستەی ڕاوێژكاران پێی هەڵدەسن.

See also : Cross-sectionalanalysis ;
Panel study.

# M

## Machine politics ڕامیاریی دەزگای حیزبی (*سیاسة الجهاز الحزبي*)

بریتیە لەو بارە ڕامیاریانەی کە تیایدا دەسەلاّتی پەیکەرێکی حیزبی ناوخۆیی ڕێکخستن بەرز پیادە دەکرێت کە لە ژێر ڕکێفی سەرکردەیەکدایە کە- ڕەنگە لەڕێگەیەکی پڕ گەندەڵی و بەیارمەتی توندوتیژی لەسەر دانان کەحزب و هەڵمەتە هەڵبژاردنیەکان و پاڵفتەکردنی پاڵێوراوەکان و خشتەی کارە ڕامیارییەکان چاودێری بکەن هەروەك چۆن ئەمە کار دەکاتە سەر کاروبارە ناوخۆییەکانیش، دەزگای حیزبیش لەخزمەتی بەرژەوەندییە ڕامیارییەکانی کرپارە ناوخۆیی و هاوکارەکانیدا کار دەکات نەوەك بەرژەوەندییەکانیحیزب یا جەماوەر یا ڕێکخراوی نیشتمانیی حیزب.

ڕامیاریی دەزگای حیزبی بەتایبەتی پەیوەندە بە ڕامیاریی شارستانیەوە لە ئەمەریکادا، بەلاّم زاراوەکە لەوانەیە هەندێك جارو بەشێوەیەکی گونجاو بەو ژیانە ڕامیارییە ناوخۆییەش بووترێت لەزۆر وولاّتی تردا کە تیایدا دەسەلاّتی دەستە بژێرێکی بچوك لەڕێی حیزبێکی ناوخۆییەوە بەردەوامی بەخۆی دەدات.

**See also :Clientelism.**

## Macro-sociology

**See :political history.**

## Majority زۆرینە (*الاکثریة، الاغلبیة*)

دەکرێت کە ئەم زاراوەیە بۆ وەسفی ئەو بەشەی کۆمەڵێك بەکار بهێنرێت کە زیاتر لە نیوە پێك دێنێت، هەروەها لەوانەیە کە زاراوەکە بۆوەسفی (زۆرینەیەکی ڕێژەیی) یا زۆرینەیەك بەکار بهێنرێت بۆ نموونە گەورەترین ژمارە لەدەنگەکان یا دەنگدەرەکان کاتێك هەڵبژاردن لە نێوان دوو جێگرەوەدا یا زیاتر دەبێت (بۆنموونە پاڵێوراوەکانی هەڵبژاردن) بەلاّم ژمارەکە لە 50٪ ی کۆی دەنگەکان کەمتر دەبێت.. و هەندێك لەڕێو شوێنەکان پێویستیان بە (زۆرینەیەکی ڕەها) هەیە واتە 50٪ئەوانەی کەمافی دەنگدانیان هەیە لەمەسەلەیەکی هەڵبژاردندا جا ئەگەر هەموویان دەنگ بدەن یان نا.

زۆرینەی تایبەتەکانیش ئەو زۆرینانەن کە پێویستیان بەڕێژەیەکی بەرزتر لە50٪ +1 هەیە: زۆرینەی دوو لە سێ یا زۆرینەی سێ چارەك دوو نمونەی باون (وەك پرۆسەی گۆڕینی دەستور لە ئەمەریکا) .

ئەنجومەنی ئاسایشی سەر بەنەتەوە یەکگرتووەکان و ئەنجومەنی وەزیرانی کۆمەڵەی ئەورووپی دوو دەزگان کەمەرجی شێوەی دیاریکراوی زۆرینەیان داناوە سەبارەت بە هەندێك جۆری مەسەلەکان.

زاراوەکە هەندێك بەکارهێنانی تریشی هەیە: وەك وەسفکردنی جیاوازییە بڕییەکان لە دەنگەکاندا لە نێوان پاڵێوراوی براوە لە هەڵبژاردنەکاندا و ئەو پاڵێوراوانەی لەپاش ئەم دێت یا لەنێوان ئەوانەی کەلایەنگیری لە پێشنیارێکی یاسادانان دەکەن لە پەرلەماندا یا بەرهەڵستی دەکەن یا بۆ وەسفکردنی ئەو کۆمەڵەیە یا هاوپەیمانییە یا حیزبەی کە زیاتر لە نیوەی ئەندامەکانی ئەنجومەنی یاسادانان یا دەستەی هاوشێوەی تر پێك دێنن.

**See also :Minority ;plurality.**

## Mandate (التفويض) دەسەڵات پێدان -ماندێت-

بریتیە لەو دەسەلاتەی کە سەبارەت بەو رامیارییەی کە لەدەنگ دەرەکانەوە بەخشراوەتە ئەنجومەنی یاسادانان یا پرۆژەیەك یا ئەو دەسەلاتەیکە حکومەتێك لافی پێوە لێدەدات بەهۆی سەرکەوتنیەوە لە هەلبژاردندا لەسەر بناغەی بەرنامەیەك یا روونکردنەوەیەکی راگەیەنراو. بوونی ئەم جۆرە دەسەلات پێدانەش زەحمەتە کە لەرپی رێوشوێنە هەلبژاردنیە ئاساییەکانەوە دابمەزرێت کە تیایدا ئەندامانی ئەنجومەنە یاسادانەکان لە ژێر ناوی حیزبەکان و لەسەر بناغەی بەیاننامە ئالۆزو فرە رامیارییەکان هەلدەبژێرین. کاری هەرە شەرعیش بەکارهێنانی زاراوەکەیە لەمانای نیگەتیڤدا بۆ نەفیکردنی بوونی دەسەلات پێدان بۆ جێبەجێکردنی رامیارییەکی نافەرامۆش کراو لە بەرنامەی هەلبژاردندا کە هیچ پێویستیەکی بەپەلەی بۆ دروست نەبووە.

زاروەی دەسەلات پێدان بەکارهێنانێکی تری هەیە کە بۆ وەسفکردنی ئەو مەراسیمانەی کە لەلایەن کۆمەلەی نەتەوەکانەوە دەرچووە بۆ هەندێك دەولەتی ئەندام پاش شەری جیهانی یەکەم و لەسەر داواویخۆیان و لەباتی کۆمەلە بۆ بەرێوبردنی هەندێك هەرێمی دیاریکراو کە لەوەوبەر کۆلۆنییەك بووە یاوولاتێك بووە کە لەو شەرەدا تێك شکێنراوە، لەسەربناغەیەکی کاتی وبەپێی هەندێکی مەرجی دیاریکراو.

See also :Referendum ; representiton.

## Manifesto (البيان) رونکردنەوە ـــ مانفێست ـــ

ڕوونکردنەوەیەکی بڵاوکراوەیە کە سەبارەت بە بیروڕا ڕامیاریەکان و ئەو ڕامیارییانە کە لە تاکتیکەوە دەردەچن یا وەك ئێستا زیاتر باوە لەحیزبێکی ڕامیاریی یا بزوتنەوەیەکی ڕامیاریەوە. لەوانەیە ئامانج لە دەرکردنی ڕوونکردنەوەیەکە بەکارهێنانی بێت وەکو بەڵگەیەکی بنەڕەتی بۆ بزوتنەوەیەك یا کۆمەڵێك سەبارەت بەئامانجەکانیان (مانفێستی کۆمۆنیستی کە مارکس و ئینگلز دەریان کردووە، وەك نموونە) یا وەك دەرخستنی نیازەکان کە دەنگدەران لەسەر بناغەیان دەتوانن کە ئەو هێزە هەڵبژێرن کە حەز دەکەن دەنگی بۆ بدەن: ڕونکردنەوەکانی حیزبە بەریتانیەکان لە هەڵبژاردنە گشتییەکاندا و هی حیزبە ئەمریکیەکان لەهەڵبژاردنی سەرۆکایەتییەدا وەك نمونە.

See also : platform.
Market socialism See: Socialism.

## Martial Law یاسای سەربازیی – یاسای عورفی *(القانون العسکری، قانون العورفي)*

حاڵەتێکە کە تیایدا ئەو ڕێنمایی و مەراسیمانەی کە لەلایەن سەربازییەکانەوە دەردەچێت شوێنی حوکمی مەدەنی دەگرێتەوە کاتێك کە دەسەڵاتی مەدەنی حکومەت دەسەڵاتی حوکم کردن دەبەخشێتە سەربازییەکانی و بەمەش حوکمی مەدەنی و یاسا ئاساییەکان و ڕێ و شوێنەکانی دادگاکان هەڵدەواسرێت یا سەربازییەکان لەڕێگەی کودەتایەکی چەکدارییەوە **putsch** (دەسەڵات دەگرنە دەست، یابەهۆی شۆڕشەوە یاسای سەربازیی لەوانەیە بریتی بێت لەبارێکی حوکمی سەربازیی لەو وڵاتەدا کە سەربازییەکان سەربەون (یۆنان لە 1967–1974) بۆ

نموونه) یا وەرگرتنی حوكمی دەوڵەتێك لەلایەن سەربازییەكانی دەوڵەتێكی ترەوە (ئەڵمانیا ڕاستەوخۆ پاش شەڕی جیهانی دووەم) ڕەنگە دەستور پێ لەسەر باسایەكی سەربازیی دابگرێت تا لەباری ناناساییدا دەربكرێت.

**See also :putsch ;revolution.**

## Marxism ماركسیزم (*الماركسية*)

پەیڕەوێكی تیۆرییە كە دراوەتە پاڵ دانراوەكانی كارل ماركسەوە (1818–1883). ماركسیزم لە كاریگەرییە سەرەكیەكان بووە لەڕەوتی پەرەسەندنی سۆسیالیزم لە ئەورووپادا لەسەدەی نۆزدەدا هەروەك چۆن سەرچاوەی تیۆریی سەرەكیی بزوتنەوەیەكی كۆمۆنیستی ئاشكراش بووە، پاشان ماركسیزم (یا ماركسیزم لینینیزم) وەك لینین پەرەی پێدا بووە ئایدۆلۆژیای سەرەكی ڕژێمە كۆمۆنیستەكان لەساڵی 1917 سەرەڕای ئەوەش كە ئەمە ڕێگەی لە زۆر كێشەو ململانێ نەگرتووە لە لێكدانەوەدا.

لایەنە هەرە گرنگەكانی دانراوەكانی ماركس ئەوانەن كەلێیانەوە ئەو پەیڕەوە پەرەی سەندوەو ئەو بیروڕایانە لەخۆ دەگرێت كە سەرجەم بە مەتەریالیزمی مێژوویی ناو دەبرێت: سروشتی مرۆڤایەتی لەكۆمەڵێك تواناو پێویستی پێك دێت بەتایبەتی توانای گۆڕینی جیهانی سروشتی كەخۆی لەشێوە جیاوازەكاندا دەنوێنێت لەڕێگەی كۆمەڵە جیاوازەكانی پەیوەندییە كۆمەڵایەتیەكانەوە.

دەرفەتی جێبەجێكردن تەواوی توانا مرۆڤایەتیەكان و دەستەبەركردنی سەرجەم پێویستە مرۆڤایەتیەكان نارەخسێنێت تەنها ئەو كاتە نەبێت كە داماڵران تێك دەشكێنرێت و دابەش بوونی چینایەتی تێ دەپەڕێنرێت لە ڕێگەی هەڵوەشاندنەوەی خاوەنداری تایبەتییەوە (ئەم ڕەوشە بەئاسانی لە دانراوە پێشینەكانی ماركسدا

دەست نیشان دەکرێت. ناکۆکەیەکیش لەئارادایە سەبارەت بە بەردەوام بوونی ئەم هەڵوێستە (مرۆڤایەتی) یانە لەنوسینەکانی دواتری مارکسدا بەڵام گرنگی ڕای زانستی ئێستا بەلای جێگیریدا دایدەشکێنێت.

-دروستکراوی کۆمەڵایەتی هۆشیاریی دیاری دەکات نەك بەپێچەوانەوە:

واتە پێوەرو بەهاکان و تێگەیشتنت لای خەڵك بەشارەزاییان لە کۆمەڵێکی دیاریکراوە لەپەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی ناو کۆمەڵگادا دەسازێنرێت: شێوەی هۆشیاریی (یا ئایدۆلۆژی) ی باو لەهەر کۆمەڵگایەکدا کە بۆ چینەکان دابەش بووە ئەو شێوەیە پێك دێنێت کە پاساوە بۆ بەرژەوەندییەکانی چینی باڵا دەست و لەخزمەتی ئەودایە.

- گرنگترین جیاوازییەکانی نێوان کۆمەڵگاکان دەکرێت کە تێیان بگەین بەگەڕانەوە بۆ پەیکەرە چینایەتیەکانیان کەئەمیش لەشێوەی ڕێکخستنی ئابوریی دەرەبەگی یا سەرمایەداریی یا سۆسیالیستییەوە سەرچاوە دەگرێت، وەك نموونە.
- بەم شێوەیە دەبێت کە لێکدانەوەی هەرە گرنگی چالاکیی کۆمەڵایەتی و ڕامیاریەکان وەسفی ئەو شێوە چینایەتییانە بکاتو ململانیی نێوان بەرژەوەندییە چینایەتیەکان کە ناتوانرێت یەك بخرێن ببێتە لێکدانەوەی سەرەکیی ململانیی کۆمەڵایەتی و ڕامیاریی.
- کار سەرچاوەی بەهای شمەکەو سوودو کەڵەکە بوونی سامان دەبێت کە دەرهێنانی (زێدەبایی) لەکار لەخۆبگرن بۆیە دەبێت کە ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیانەی کە ڕێ بەرشێدانی ئەم پرۆسەیە دەدەن چەوساندنەوەیی بن.
- هەر سیستمێکی بەرهەم هێنان ئەو هێزانەی بەرهەم هێنان پەرە پێ ئەدات کە لەگەڵ پەیوەندییەکانی بەرهەم هێناندا ململانێ دەکات (سیستمی خاوەنداریی و دەست گرتن بەسەر بەرهەم هێناندا) ئەم ململانێیەش لەکۆتاییدا دەبێتە هۆی ڕووخاندنی سیستمی بەرهەم هێنان و باڵا دەست بوون سیستمێکی تر .

بەم شێوەیە سەرمایەداریی وەك هەموو ڕژێمە پێشووەکانی تر، حوکمی ئەوەی

بەسەرا دراوە کە دژایەتییەکانی ناوخۆی تێکی بشکێنێت (زیادەڕۆیی لە بەرهەم هێناندا کەم بوونەوەی بەکاربردن و دابەزینی ڕێژەی قازانج و هەژارکردنی پرۆلیتاریا و جەمسەرگرتنی ململانێی چینایەتی) .

جیاوازیی گرنگی نێوان ڕوخاندنی سەرمایەداری و ئەو ڕژێمانەی پێشی ئەوەیە کە چینی نویی بالادەست (پرۆلیتاریا) بەرژەوەندیی لەوەدایە کە جیاوازییە چینایەتییەکان هەڵبوەشێنێتەوە نەوەك بەشێوەیەکی نوێ برەویان پێبدات.

- بەرژەوەندییە چینایەتییەکان لەکۆمەڵگای کۆمۆنیستیدا بەرەو نەمان دەچێت و لەگەڵیشیدا ململانێی چینایەتی نامێنێت ئەمەش دەبێتە هۆی (پوکانەوەی) دەوڵەت وەك هێزێکی ڕێکخستنی زۆرە ملیی پەیوەندیە کۆمەڵایەتییە چەوسانەوەییەکان.

بیروڕاکانی مارکسی سەرچاوەی ئایدۆلۆژیای بزوتنەوەی کۆمۆنیستی بوون و وەك ڕێبازێکی شیکردنەوەیی تایبەت لەبواری مێژوو و کۆمەڵناسیدا تەبەنی کرا. بانگەرانی مارکسیزم پەیوەندی لەنێوان ئەم دوانەدا بە باشی دادەنێن و پێ لەسەر یەکێتیی هەوڵەکانی تێگەیشتن لەجیهان و گۆڕینی دادەگرن، بەڵام دژەکانیان ئەمە بەخراپە دا دەنێن و پێیان وایە پابەندبوونی ڕامیاریی دەکرێت کە یەکسان بێت بەهەوڵ بۆ ئەو تێگەیشتنە.

کاریگەریی مارکسیزم لەسەر زانستە مێژوویی و کۆمەڵایەتیەکان قوڵ بووە. سەرەڕای بوونی جیاوازییەکی ئاشکراش لەنێوان پەیڕەوە مارکسی و نامارکسییەکاندا بەڵام هەندێك لە سەر سەخترین دژەکانی مارکسیزمیش دانیان بەوەدا ناوە کە مارکسیزم وەك ئایدۆلۆژیایەك (لەزۆر لایەندا ئێمە ئێستا هەموومان مارکسین) بەواتایەکی تر ئارەزووی گەڕان بەدوای ئەو لێکدانەوانەدا لەڕووی بەرژەوەندیە ئابورییە دژەکانی کۆمەڵگا چینایەتییەکانەوە و سەیرکردنی سەردەمە مێژووییەکان لەڕووی شێوەی بەرهەمهێنانی بالا دەستیەوە. بەلانی کەمەوە بەشێکە لەو ڕێبازەی زۆر نامارکسییەکانیش پەیڕەویان کردوە. لەشیکردنەوەی ڕامیارییشدا سروشتی

جیاکەرەوەی مارکسیزم لەو ڕایەدایە کە پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنان و پەیوەندییە چینایەتیە پەیوەندیدارەکان پلەی یەکەمی دەردێتی لەلێکدانەوەی پەیوەندییە ڕامیارییەکاندا بەتایبەتی لەکاتی لێکدانەوەی سروشتی دەوڵەت و چالاکییەکانیدا. بەلآم هەر وەك چۆن مارکسیزم کاری لەپەیڕەوەکانی تری لێکۆڵینەوە کردووە خۆیشی لەگۆڕان بەدەر نەبووە. لەدەیەکانی سەرەتای ئەم سەدەیەدا مارکسیزم بەگشتی لێکدانەوەکانی مەتریالیزمی لەخۆگرتووە بۆ پەرەسەندنی مێژوویی کەبەگشتی سروشتێکی توندو حەتمییان هەیەو هەموو ئەو بیروڕا جیاوازانەی پێوە بەستراوە کە سەبارەت بە ڕۆڵی سەندیکاکانی کرێکاران و حیزبە ڕامیارییە کرێکاریەکان بوون لە ململانیی سەر لەنوێ بونیادنانەوەی کۆمەڵگەی سۆسیالیستیدا.

یەکەمین ئەو لێکدانانەوە زۆر پێویستی بەپەرەپێدان و لێکدانەوە هەبوو، بەلای هەندێکیشەوە شێواندنی بیرەکانی مارکس هەبووە لەلایەن فردیك ئینگڵزی هاوڕێ و هاوبەشی مارکس خۆی، لێکدانەوەی دووەمیش بە ڕایەکانی لینین و بیرەکانی رەخنەگرەکانیەوە پەیوەند بووە وەك ڕۆزا لۆگسمبۆرك و کارل لیبکنشت و کارل کاوتسکی . لەگەڵ مانەوەی بایەخدان بەم مەسەلانە وەك بەشێك لەگەوهەری مارکسیزم بەلآم مارکسیزم لەو قۆناغەدا زۆر وەرچەخانی بەخۆوە دیوە. هەڵوێستی ستالینی لەبەرامبەر زۆربەی حیزبە کۆمۆنیستەکان و ڕەفتاریٔ یەکێتیی سۆڤیەت سەبارەت بە وولآتانی ئەورووپای ڕۆژهەلآتی ناو خولگەکەی و بوونی نوسینەکانی سەرەتای مارکس بونەتە هۆی سەر لەنوێ بیرکردنەوە لە ڕەگ و ڕیشەی فەلسەفیو ڕەوشتییەکانی مارکسیزم و گەشەکردنی کۆمەڵێك تیۆر کە بەناوی (مارکسیزمی مرۆڤانە) ناسراوە . بەهاتنی دەیەی پەنجاکانی سەدەی بیستەم مارکسیزمی ئەورووپی بایەخی بەمەسەلەکانی ئایدۆلۆژیاو هۆشیاریی چینایەتیدا بەقەدەر بایەخی بە پەیوەندییە ڕاستەخۆکانی نێوان گەشەپێدانی ئابوری و ڕامیارییەکانیش. گرتنی ئەم هێڵەی لێکۆڵینەوەش، سەرباری هۆکاری تریش، بووە هۆی دورکەوتنەوەی هەندێك نووسەر لەو ڕێبازە مادیی و زانستییەی مارکسیزم بەشێوەیەکی کلاسیکی

پێیەوە پەیوەند بوو لەدەیەی شەستەکان و حەفتاکانیشدا مارکسیزمی ئەورووپی وەك بەشێك لەپەرچە کردارەکان بەمارکسیزمی مرۆیی و ستالینی، کاریگەرە بەجەماتوەریەتی بونیادگەری بەتایبەتی لە ڕێگەی دانراوەکانی لویس ئەڵتۆسێرەوە، لەبەرامبەر ئەمەشدا، لەگەڵ بەرهەڵستیی زۆر لەمارکسیەکانیشدا بۆ تاکگەریی ڕێبازیی ئێستا لقێکی گەشەکردوی مارکسیزم هەیە کە ڕێگەکانی هەڵبژاردنی ئەقڵانی بەکاردێنێ.

ڕەنگە مارکسیزم هەمیشە ڕادەیەك لە زیادەڕۆیی لەخۆ گرتبێت لەبواری حەتمیەت و شیکردنەوە بۆ ڕەگەزەکان لە ستراتیژیەتی لێکدانەوەییدا، ئەمەیش وێنەیەکی ساختەیی مارکسیزمی ڕۆژئاوایی بووە بۆ ماوەیەکز بەڵام ئێستا و لەڕێگەی پەیڕەوی مارکسییەوە زۆر زەحمەتە کە لێکۆڵینەوەیەك بدۆزرێتەوە کەچالاکیەکانی دەوڵەتی نوێ لەخۆ بگرێت وەکو ئەوەی کەبەشێوەیەکی توند بەرژەوەندیەکانی چینێکی هەژموندار دیاری دەکات یا دۆزینەوەی وەرچەرخانێکی مێژوویی کەبەشێوەیەکی توند شوێن جۆرێکی دیاریکراو و پەرەسەندن دەکەوێ. ئەگەرو گرنگیی هەندێك بەرواری دیاریکراوی هۆکارە کاتی و شوێنییەکان وسەربەخۆیی ڕێژەیی دەوڵەتی نوێ هەمویان بەگشتی پەسەندبوون. بەو پەرەسەندنانە لەمارکسیزمدا کە باوەڕ وایە ئەوانە دورکەوتنەوەیەکی ڕیشەیی نین لە ئایدۆلۆژیای مارکسیی ڕەسەن (دەوترێت مارکسیزمی نوێ) . لە لێکۆڵینەوەی ئەکادیمیشدا چەند جیاوازیەك هەیە لە نێوان هەردوو زاراوەی (marxiam) (marxist) دا چونکە یەکەم وەسفی لێکۆڵینەوەکانی مارکس خۆی دەکات لەکاتێکدا دووەم وەسفی ئەو ئایدۆلۆژیا فراوانە دەکات کە لەلێکۆڵینەوەکانیەوە پەرەیان سەندوە .

**See also : Alienation ;bolshevism ; Capitalism ; communism;contraditici-Ton ;determinism;exploitation ;ideol-Ogy ;industrial society ;rational choice-Analysis ;reductionist theories ; revo-**

Lution ;social class ;aocialism ; state;
Structuralism.

## Mass هۆیەکانی ڕاگەیاندنی جەماوەریی *(وسائل الاعلام الجماهيري)*
## Media

ئەو هۆیانەی ڕاگەیاندنن کە ئاراستەی جەماوەرێکی فراوان و جۆراوجۆر کراون کە پەیامی یەکخراو پەخش دەکەن بەشێوەیك کە لەڕێگە لەڕاستکردنەوەی کەسی دەگرێت لەکاتی پەخشکردنیدا لە نێرەرەوە یا لەوەرگرەوە) بەپێچەوانەی قسەکردنی تەلەفۆنی یا هێڵێی ڕامیاریی لەبەردەم جەماوەرێکی بچوکدا) .بەم شێوەیە هۆیەکانی ڕاگەیاندنی جەماوەریی لەکۆمەڵگا پیشەسازییەکاندا بریتین لەپەخشی ئێزگەیی و تەلەفزیۆنی و تۆمارە دەنگی و ڤیدۆییەکان بەبرێکی زۆر، هەروەها سینەماو پۆستەرو بلاوکراوەکان و دەرکردنی ڕۆژنامەو بلاوکردنەوەی کتێبەکان. لەئەنجامی ئاراستەکردنی پەیامەکان بەرەو جەماوەرێکی فراوان و جۆراو جۆر ئەوا بەرهەم هێنانی ئەمە جۆرە پەیامانە بە بەکارهێنانی ڕاگەیاندنی جەماوەریی زۆری تێ ناچێت لەچاو قەبارەی جەماوەری گریمانەکراودا.

See also : mass society ; political com-
Munication propaganda.

## Mass Society کۆمەڵگای جەماوەریی *(المجتمع الجماهيري)*

کۆمەڵگایەکە کە تاکەکان تیایدا پەیوەستیی بەها بەرزیان نیە بەکۆمەڵە کۆمەڵایەتییەکانەوە یابەپێوەرە تەقلیدییەکانەوە. دەزگا سەرەکییەکانیش پرۆسەو جۆرەکانی پەیوەندیکردن لەگەڵ دانیشتواندا وەك کۆمەڵێکی گشتیی هەمە جۆر

مامەڵە دەکەن. دەسەلاّت مەڵبەندییە و حەز بە سەربەخۆیی هەرێمی یا ناوخۆیی ناکات.

ئەم ڕواڵەتانە لەشیکردنەوەی ڕامیاریی هاوچەرخدا بەئاستێکی بەرز لەشارستانی و دابەشکردنی کارو پیشەسازییو چڕی دانیشتوانەوە پەیوەندبوون لەسایەی ئەم بارو دۆخانەدا دانیشتوان حەز دەکەن کە زۆر بجوڵێن و دەرفەتی تا ڕادەیەك کەمیان هەیە بۆ پەرەپێدانی ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیانەی کەسروشتێکی زیاد لەکاتییان هەیە.

بەشداری کردنی ڕامیاریی لەڕێگەی ڕێکخستنی خۆبەخشەوە لاوازە، هۆی ئەمەش بە شێوەیەکی هەندەکی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە دەرفەتەکانی دەسەلاّتی ڕامیاریی کەم دیارە و هۆەکەی تریش بریتیە لەزەحمەتیی پەرەی پێدانی ڕێکخستنی ڕامیاریی خۆبەخش لەکۆمەڵگایەکدا کەتاکەکانی زۆر دەجوڵێن .هۆیەکانی ڕاگەیاندن بۆ جەماوەرێکی نیشتیمانی هەمە جۆر ڕێکخراوە کەپەیوەندییەکانی پشت بەم جەماوەرە دەبەستێ.

چەمکی جەماوەر لەسەدەی نۆزدەدا تیۆرێکی خەمۆك و ڕەشبینی بەرجەستەکردووە بەگشتی. زاراوەکە بەمانایەکی لاقرتێیانە بەکار دێ : هەندێك جار سەبارەت بە ئاسانی هەڵخەڵەتاندنی جەماوەر و کۆنترۆڵکردنی لە لایەن سەرکردە توندڕەوەکان یا دەستە بژێرە پارێزگارەکانەوە، هەندێك جاری تر وەك بەشێك لەڕایەك لەبارەی دارمانی ڕۆشنبیری و بەها شارستانیەکان لەکۆمەڵگەی نوێدا.

چەمکە کە بەگشتی ئاماژەیە بە نەبوونی بەشداریی دیمۆگرافیانە و چوون بەرەو حوکمی زۆرداریی.

ئاشکرایە کە کۆمەڵگا نوییەکان لەهەندێك لەڕواڵەتەکانی کۆمەڵگای جەماوەری دەردەخەن، بەلاّم زاراوەکە ڕوانینێکی ڕەشبینانە لەخۆ دەگرێ سەبارەت بە هەندێك ئاراستە لەکۆمەڵگای نوێدا بەپێچەوانەی ئەو ڕوانینەوە کە هەندێك ڕۆمانتکیەتی هەیە بۆ شێوە پێشینەکان لەبری وەسفکردنی بێ لایەنانەی باری کۆمەڵایەتی نوێ.

See also : Alienation ;anamomie ;in-
Dustrial society ; mass media ; plural-
Isb ; totalitarianism.
Methodological holism See : reduc-
Tionis theories.

See: **reductionst** theories

## Methodogical individualism Metodology پەیڕەوگەرایی ـــ میتۆدۆلۆجی ـــ *المنهجية*

بریتیە لە لێکۆڵینەوەی ڕێگەکانی توێژینەوە لە لقێك یابوارێکی لێکۆڵینەوەدا. هەروەك چۆن زاراوەکە بۆ وەسف کردنی ئەو ڕێگە تایبەتییانە بەکاردێ کە توێژەرەوە دەیگرێتە بەر یا لە ڕێبازێکدا بەکاردێ کە گشتیەتی زیاتر پێوە دیارە بەم شێوەیە زاراوەی (پەیڕەو گەرایی مارکسی) ڕەنگە وەسفی لێکۆڵینەوەو مشتومڕی ئەو ڕێگە گونجاوانە بکات لە شیکردنەوەی مارکسیدا و ئەو ڕێگایانەی کە مارکسیەکان بەگشتی بەکاری دێنن.

پەیڕەوگەرایی لەشیکردنەوەی ڕامیاریدا بایەخ دەدا بە گشت لایەنەکانی توێژینەوە لە ئایدۆلۆژیای تیۆرییەوە سەبارەت بەباشترین ئامرازێك بۆ وێناکردنی مادەی بابەتی بڕیار دراو و توێژینەوەی تا تەتەڵەکردن و هەڵبژاردنی ئامرازەکانی کۆکردنەوەی زانیارییەکان و شیکردنەوەیان، مەبەستی ئەم جۆرە مشتومڕە هەڵسەنگاندنی سودو دروستی ڕێگەکان و دیارکردنی کۆت و سازدانیەتی.

See also : political analysis ; scientific
method.

## ئینتیلافی براوە بەکەمترین کورسی (الائتلاف الفائز باقل المقاعد) Minimal-winning Coalition

ئەو ئیتیلافەیە کە زۆرینەیەکی براوەی دەنگەکانی نابێت ئەگەر هەر حیزبێکی ناوی پاشەکشیی کرد، نموونەی ئەم جۆرە ئیئتیلافەش لەمە پێك دێ:
حیزبی (ا) =30٪ کورسیە پەرلەمانیەکان و حیزبی (ب) =15٪و حیزبی (ج) =8٪ ئەگەر ئەو ئیتیلافە هەر حیزبێکی تر لەخۆ بگرێت (بۆ نموونە (د) = 6٪ی کورسیەکان) ئەوا بەبراوەی لانی کەم دانانرێ چونکە یەك حیزب لە لانی کەمدا دەتوانرێ کە پاشەکشێبکات بەبێ بێبەشکردنی ئیئتیلافەکە لەزۆرینەی کورسیەکانی (لەم نمونەیەشدا حیزبی (ج) یا حیزبی (د) .

Seealso : Coalition ;minimum winning Coalition.

## ئیئتیلافی براوە بە لانی کەمی کورسیەکان (الائتلاف الفائز بالحد الادنی من المقاعد) Minimum-winning Coalition

ئیتیلافێکە لە حیزبەکان پێك هاتووە کە بچوکترین ئیئتیلافە کە مومکین ببێ (لەڕووی ژمارەی کورسییەکان لە ئەنجومەنیپاساداناندا) لەگەڵ ئەوەشدا 50٪ تێ دەپەڕێنێ. ئەگەر ئەنجومەنی یاسادانان لە پێنج حیزب پێك هاتبێ: (ا) =35٪ی کورسیەکان و (ب) =28٪ و (ج) =17٪و (د) = (12٪) و (ه) = 8٪ ئەوا ئیئتیلافی براوە بەلانی کەم پێکهاتووە لە هەردوو حیزبی (ا) و (ج) (52٪) بەلام ئیئتیلافی حیزبەکانی (ب) و (ج) و (ه) (55٪ یا (ا) و (ب) (63٪) براوەی لانی کەم نابن. بە گریمانەی ئەوەی کە حیزبەکان بەپێی ڕەهەندی ڕامیارییڕێك

خراون (واتە ڕەهەندیچەپ– ڕاست) لەڕیزکردنی ئەبجەدیدا لـەحیزبی (ا) وەلەلایـەك ئەوا ئەو ئیئتیلافانەی سەرەوە (کراوە) دەبن بێجگە لە (ا) و (ب) کە ئیئتیلافێکی داخراو پێك دەهێنن.

**See also : Coalition ; colsed coalition ; Minimal-winning ;opencoali- Tion.**

## Minority کەمینە (*الاقلية*)

کۆمەڵێکە کەمتر لەنیوەی کۆی ئەندامانی کۆمـەڵێکی گـەورەتر لـەخۆی دەگرێ. لەدەنگداندا کەمینە بریتیە لە دەنگدەرەکان یا ئەو دەنگانەی کە کـەمترن لـە 50٪ی ئەو دەنگانەی کـە دەدرێـن. لەکۆمـەڵگادا زاراوەکـە وەسـفی کۆمـەڵێکی ڕەگـەزیی یـا هەرێمی یا ئایینی یا هیتر دەکات کە ناسنامەیەکی دیاری هەیە و زۆر بەسـەریدا زاڵـە لە ژمارەدا بەنرخیدانیشتوان (وەك کەمینەی کاسۆلیکی لە ئیرلەندای باکورو کەمینەی دانیمارکی لە شلزویك–هۆڵشتاین) .

**See also : Majority.**

## Misery Index نیشاندەری کلۆڵی (*مؤشر البؤس*)

پێوەرێکە پێك دێ لە کۆی تێکڕایی ڕێژەی سەدی هەڵئاوسان و تێکڕایـی ڕێـژەی سـەدیی بێکـاریی، بـەکاردێ (بـۆ نموونـە)، بـۆ مەبەسـتەکانی بـەراوردی بـاری کۆمەلایەتی–ئابوری بۆ دەوڵەتەکان یا یەك دەوڵەت بە تێپەڕ بوونی کات.

**See also : Index numbers.**

## Mobilization (التعبئة) سازدان

پرۆسەیەکە وا لەکۆمەڵێکی رامیاریی دەکات کەبەشداریەکی راستەوخۆ بکەن لەکاروباری رامیارییدا، یەکێك لەشێوەکانیش بریتیە لەبەشداریی خۆبەخشانە لەژیانی رامیارییدا لەرێگەی چوونە ناو حیزب و بزوتنەوەکان یا کۆمەڵەکانی بەرژەوەندی و دەنگدان لە هەڵبژاردنەکان و هاوبەش لەمشتومڕی رامیاریی‌وچالاکیی هاوشێوە بەلام لەو کۆمەڵگایانەی کە حوکمی زۆرە ملێیان تیایە یا نا دیموکراتین (جەماوەرین) لەوانەیە سازدان شێوەکانی بەشداری بەزۆر لەخۆبگرێت لەخۆپیشاندانەکان و کۆبونەوەکان و هەڵمەتە رامیارییەکاندا.. یا ئامادەبوون بۆ دەنگدان لە هەڵبژاردنداکە هەڵبژاردن تیایاندا بوونی نیە و ئامابوونی و چوونە ناوی بەزۆرە بۆ رێکخراوە رامیاریەکان (بۆ نموونە کۆمەڵە پیشەییە حیزبیەکان و پارێزەرەکان لە ئەڵمانیای نازیدا) .

بەکار هێنانێکی تر هەیە کە پەیوەندیدارە بە زاراوەکەوە لەچوار چێوەی‌خۆ ئامادەکردن بۆ ململانێیەکی سەربازیی کە بریتیە لە سازدانی هێزە چەکدارەکان و هێزە یەدەکەکان بەئامانجی بەشداری پێکردن لەباری ئامادەبوون بۆ شەڕو جولاندنی بەرەو پێگەکانی هێرش یا بەرگری و سپاردنی بەم جۆرە کارە سەربازییە.

**See also : Participation**
**Mobilization of bias See :Non-Decision.**

## Model (النموزج) نموونە ــ مۆدیل ــ

لێکدانەوەیەکە بۆ تیۆرێك بۆ پێشکەشکردنی نواندنێك یا روونکردنەوەیەك بۆپەیوەندییەکان کە بەشێوەیەکی تیۆریی دەربڕاوە. لەشیکردنەوی رامیاریشدا زۆر

جار نموونەکان لەشێوەی وێنەی ڕوونکردنەوە یا دانانی هاوشێوەییلەنێوان ڕامیاریی وپرۆسەکانی تردا پێشکەش دەکرێن کە زیاتر ئاشنان یا بەشێوەیەکی باشتر لێیان تێدەگەین. لەم بارانەدا مەبەستی سەرەکی بریتیە لەپێشکەشکردنی هێڵکارییەك کەئاسان وێنا دەکرێ بۆ ئەو پرۆسەیەی کە تیۆریی دەریراوە.

لەوانەیە هەروەها زاراوەکە بۆ وەسفکردنی تیۆرێك بەکار بێ وا دانانرێ کە ڕەگەزەکانی هاو جووتن بەشێوەیەکی ورد لەگەڵ دیاردە ڕامیارییە کردارییەکاندا، بەڵام ئەمە لێکدانەوەیکی سادەکراو یاوێناکراو بەشێوەیەکی نموونەیی بۆ پرۆسە پەیوەندی دارەکان پێشکەش دەکا.

**See also : Analog ; ideal type ; metho-**
**Dology ; simulition.**

## Modernization نوێکردنەوە (*التحديث*)

زاراوەکە زۆر جار وەك هاومانایەکی نزیکی زاراوەی (گەشەپێدان) (Development) بەکاردێبەڵام زیاتر لەزاراوەی دووەم بە باشتر دەزانرێ، چونکە سەرنج بەشێوەیەکی ساکارتر ڕادەکێشێ بۆ سروشتی گشتیی گۆڕانی کۆمەڵایەتی و خۆی بەدور لەو گریمانە پێشینانە دەگرێ کەپەیوەستن بە باش بوون یا ڕا تەکنیکیەکان لە پرۆسەی نوێکردنەوەدا کەزۆر جار پەیوەستن بەچەمکەکانی گەشەپێدانەوە .

دەکرێ نوێکردنەوە وا پێناسە بکرێ کە بریتیە لەو پرۆسەیەی گۆڕانی کۆمەڵایەتییەی کە پێشکەوتنی ئابوری لەخۆ دەگرێو ڕۆڵە ڕامیارییەکان تایبەت دەکاو هەوڵدان بۆ بەدی هێنانیماقوڵی لە داڕشتنی ڕامیارییەکانداو پەرەپێدانی تەکنۆلۆژیو گۆڕانە بنەڕەتیەکانی ئەو شێوە کۆمەڵایەتییانەی کە شارستانی بوون و

توانای گواستنەوەی کۆمەلآیەتیو جوگرافیو گەشەپێدانی پەروەردەییو پێکهێنانی کۆمەلگا دووەمییەکانیان هەیە.

هەموو ئەمانەیش کۆمەلگایەك دەگۆرێ کەپشتی بەستووە بە بەهاو دەزگا تەقلیدییەکان بۆ کۆمەلگایەك کە دەتوانێ تایبەتمەندییەکانی کۆمەلگا پەرەسەندووەکان یا نوێکان وەربگرێ (واتە ئەو کۆمەلگایانەی کەسیستمی ئابوری تایبەتمەندو ئالۆزیی بەرزی هەیە و ئەو دەزگا رامیارییانەی کە روالەتی بیرۆکراسیو تەکنیکە پێش کەوتووەکانی هەیە...هتد) بەهۆی سروشتی پرۆسەی نوێکردنەوەوە ئەوا لێکۆلینەوەو شیکردنەوەی هەلسەنگاندنێکی هەستیار لەخۆدەگرێ بۆ ئەو لایەنانەی کە پەیوەندیدارن بە رۆشنبیرییەکانی ئەو کۆمەلگایەی کە هەستاوە بەنوێ کردنەوەو زانینێکی جووتکراو بەچەمك و تیۆر و شێوازەکانی لەچەندین زانستی کۆمەلآیەتی و رەفتارییو هۆشیاریی بە پەیوەندییە ئالوگۆرکراوە ئالۆزانە لەنێوان فاکتەرە کۆمەلآیەتی و ئابوری و رامیاریی و دەروونیی و رۆشنبیرییانەی کە گۆرانی کۆمەلآیەتی لەخۆ دەگرێ.

See als0 :Political development ; Third World.

## Monarchy پاشایەتی ــ مۆنارشی ــ (الملكية)

بریتیە لەحوکمی سەرۆکی یەك دەولەت کەنازناوی پاشا (پاشاژن) یا هاو واتاکەی هەلدەگرێو پایەی سەرۆکی دەولەتی هەیە بەبۆماوەبیی لەگەل ئەوەشدا کە هەندێك پاشایەتی (وەك پۆلەندا) بەهەلبژاردن بووە. باوەر وا باوە کەپاشا گرنگییەکی رەمزیی ئایینی یاتەقلیدی هەیە بۆدەولەت و دەزگاکەی.

پاشایەتی بەند بووە بەتایبەتی بەچاخە دەرەبەگیو ناوەندەکانەوە لەمێژوودا و ئەمرۆ وا دانانرێ کەگرنگییەکی رامیاریی هەبێ تەنها لەهەندێك دەولەتی کەمدا نەبێ

بەتایبەتی لەئەفەریقاو ئاسیادا.زنجیرەیەك شۆڕش لەشەڕی سەربەخۆیی ئەمەریكاو شۆڕشی فەرەنسادا. سستمە پاشایی و دیكتاتۆرییە زۆردارانەكانی گۆڕیوە. یا وەك بەریتانیا و هۆڵەندا بووەتە پاشایەتییەكی دەستوریی، لەم جۆرە سیستمانەدا پاشا وەك سەرۆكی دەوڵەت كار دەكات، بەڵام ئازادیی رەفتاریی رامیاریی نیەو پابەند دەبێ بەبڕیارەكانی رامیاریی كەحكومەت بەرپرسیارێتییان لە ئەستۆ دەگرێت .

ئیسپانیای پاش مردنی (فرانكۆ) ش یەكێكە لەو نموونە نوێیە دەگمەنانەی كە تیایدا پادشا دەگەڕێتەوە بۆ وەرگرتنەوەی سەرۆكایەتی دەوڵەت.

**See also :Head of State.**

## Movement (الحركة) بزوتنەوە

پێكهاتەیەكە هەوڵ دەدات لەرێی ئامرازە ئاشتییەكانەوە گۆڕانكاریی گرنگ لەرامیاریی و دەزگا كۆمەڵایەتیەكاندا بەدی بێنێ یا لەبزوتنەوە شۆڕشگێڕەكاندا وەك بزوتنەوە جودایی خوازەكان كە دەیانەوێ سیستمێكی رامیاریی تەواو نوێ بێننە كایەوە. رەنگە بزووتنەوەكان پشتگیرییەكی جەماوەریی فراوان بۆ خۆیان رابكێشن یا ژمارەیەكی كەمی لایەنگیریان هەبێت.دەكرێ كە لەكۆمەڵەكانی بەرژەوەندی جیابكرێنەوە بەهۆی سروشتی بنەڕەتیی ئامانجەكانی و نەبوونی پشت بەستن بەیەك بنكەی رێكخستن و بایەخ نەدانی بەشێوازە رامیارییە لێزانەكان .بزوتنەوەكان جیاواز دەبن لەحیزبە رامیارییەكان چونكە هەوڵی پیادەكردنی ئەركەكانی حكومەت ناداو رێكخستنێكی یەكخراوی نیە بەڵام لەوانەیە كەپشتگیریی پاڵێوراوەكان بكات لەهەڵبژاردنەكاندا بۆ وەرگرتنی پایەیەكی گشتی. لەگەڵ ئەوەشدا بزوتنەوە بەردەوامە زیاتر لە تەنها كۆكردنەوەیەك بەتواناتر لەكۆمەڵەیەكی بەرژەوەندیی رێكنەخراو.

لەرواڵەتە گرنگەكانی بزوتنەوە ئەوەیە كە ئامانجیكی هاوبەشی زۆر بنەڕەتیی

هەیە یا تەنانەت ئایدۆلۆژیایەك كە هەستێكی بەهێز دروست دەكات بە ناسنامەی كۆمەڵێك و لەوانەشە كە هانی دەركەوتنی پێشەوایەتیەكی بەهرەداریش بدات. دەشێت كە بزوتنەوە ئەو جیاوازییانەش تێپەڕێنێ كە لەچینی كۆمەڵایەتی و ئایین و سەر بەحیزب بوون و تەنانەت نەتەوەیشدا هەن. نموونەی ئەو بزوتنەوانەش:

بزوتنەوەی بانگەواز بۆ بەخشینی مافی دەنگدان بە ئافرەت،و بزوتنەوەی چینی كارگەرو، و بزوتنەوەی مافە مەدەنییەكان لەئەمەریكاو بزوتنەوەی لایەنگرانی پاراستنی ژینگەو بزوتنەوەی ئاشتی.

لەوانەشە كە بزوتنەوەیەك بگۆڕێ. بەحیزبێكی رامیاریی یا حیزبێكی رامیاریی دەستی بەسەردا بگرێت (وەك بزوتنەوەی میللی ئەمەریكا) یا حیزبێكی رامیاریی لێ دەكەوێتەوە وەك رێكخراوێكی (پێشەنگ) بەبێ وونكردنی سروشتی خۆی وەك بزوتنەوەیەك (وەك حیزبە سەوزەكان كە لەئەڵمانیا وبەریتانیا و دەوڵەتانی تری ئەورووپادا پەرەیان سەندووە) . یا لەوانەیە بزوتنەوەیەك ببێتە رێكخراوێك وەك كۆمەڵێكی بەرژەوەندیی ڕونترو رامیاریی توند ترو ئاڵۆز تردەگرێتەبەر.

See also : Environmentalism ; femi-
Nism ; interest group ; pacifism ; party ;
Zionism.

## Mulii-party System سیستمی فرە حیزبی (النظام متعدد الاحزاب)

سیستمێكی حیزبەكانە كە تیایدا زیاتر لەدوو حیزب ڕكابەریی یەكتر دەكەن.

Satori: ( لەكتێبی سارتوریداكە بەناونیشانی (حیزبەكان و پەیڕەوی حیزبەكان
(parties and party
systems: Cambridye; Cambridgy
University press; 1976)

جیاكردنەوەیەكی گرنگ هەیە لەنێوان زاراوەكان لەسستمی فرە حیزبیە (میانڕەوەكان) و سیستمی فرە حیزبیە (جەمسەرگیرەكانpolarized) یان

(توندڕەوەکان Entreme) دا وەکو ئاماژە بۆ ئەمە دەکرێت کە سستمی دووەم شەش حیزبی هەیە ............. و کۆمەڵێك ڕواڵەتی تر کە پەیوەستن پێیەوە وەکو بوونی حیزبە بەرهەڵستکارەکانی ڕژێم و نەیاری دوو لایەنی و نابەرپرسیارێتی و مەیلی دەنگدەرەکان بۆ وازهێنان لەحیزبە ناوەندەکان و چوونە ناو............ .کۆماری فایما– لەئەڵمانیا لەنێوان هەر دوو جەنگە جیهانیەکەدا دادەنرێت بەبارێکی تەقلیدی بۆ ڕژێمێکی فرە حیزبی جەمسەرگیریی سەسرای ئەوەی کە کۆماری فەرەنسی چوارەم و ئیتالیا پاش جەنگی جیهانی دووەم دەکرێت لەناو ئەم گروپەدا ڕیز بەند بکرێت.

هەندێك لەتوێژەرەوانیش هەوڵیان داوە جیاوازی بکەن لەنێوان سستمی فرە حیزبی (ڕاستەقینەدا) و سستمی حیزبی و نیو حیزبیدا، بۆ ئەمەیش دەڵێن بەریتانیاو کۆماری ئەڵمانیای یەکگرتوو، ئەگەر چی بەرێگەی جیاوازیش بێت،سستمی دوو حیزبی و نیوە حیزبیان بینیوە.

**See also: opposition; party sysytem;
Tow- paty system.**



**Nation** (الامة) **نەتەوە**

بریتیە لەو کۆمەڵە خەڵکەی کە هاوبەشن لەتەقلیدێکی مێژوویی و رۆشنبیرییدا کەپەیوەندە بە ناوچەیەکی جوگرافیی دیاریکراوەوە کە ناسنامەیەك دەبەخشێتە ئەو کۆمەڵە لەبەرامبەر کۆمەلەکانی تردا. بیرۆکەی (نەتەوە) ش هانی مافی رێکخستنی رامیاریی هاوبەشی ئەو کۆمەڵە دەدات ئەگەر ئەوە خۆی نەبوویێ، وەبەهێزێکی پێکەوە گرێدان دادەنرێ ئەگەر نەتەوە رێکخراوە حکومییە تایبەت بەخۆکەی هەبێت.

هێزی بیرۆکەی (نەتەوە) زۆر جار بەسە بۆ مانەوە لەدژی داگیرکردن و دابەش کردن و پەرت بوونی دانیشتوانی نەتەوەو پێکەوە گرێدانی خەڵك لەدەوڵەتێکی فیدراڵ یا ئیمپراتۆریەتێکداو و پیشەسازییو ئەو گۆڕانکارییانەیتر کەپەیوەندن بەنوێکردنەوە.

نموونەی ئەو نەتەوانەی کە لەو جۆرە بارودۆخانەدا ماونەتەوە پۆلەندییەکان و لیتوانیەکانو ئێرلەندییەکان و باسکیەکان و ئەڵمانەکانن.

پێناسەیەکی تریش هەیە کەبەندە بەکۆمەڵێك پێوەری خۆیی ترەوە کەپێی وایە هەر نەتەوەیەك یا هەر کۆمەڵێك لەخەڵك (کە بەشێوەیەکی راست یان هەڵە) باوەڕیان وایە کەئەوان تەقلیدێکی مێژوویی یا رۆشنبیریی هاوبەشیان هەیە. ئەمەش لەهەندێ دەوڵەتی ئەفریقیدا هەیە کە پشت دەبەستن بە دروستکردن و پتەوکردنی هەست کردن بە باری نەتەوە بۆ پاراستنی پێکەوە گریدانی رامیاریی.

**See also : Nationalism ; politicalinte-**
**Gration ; state.**

## Nationalism (القومية) نەتەوەگەرایی

ئایدۆلۆژیایەکە پێی وایە دەوڵەتەکان دەبێ بنکەی رەگەزیی رێك بخەن وەهەر نەتەوەیەکی دیاریکراویش کە هێشتا باری دەوڵەتی بەدی نەهێناوە یا بەشێوەیەکی تەواو وەك پێویست بەدی نەهێناوە. ئەم پەیوەندییەش بەباری دەوڵەتی ناتەواوەوە

نەتەوەگەرایی لە نیشتیمان گەرایی و ڕق لەبێگانەبوون ...هتد جیادەکاتەوە.

نەتەوەگەرایی نوێ لەلایەنی مێژووییەوە ڕیشەی لەهەردوو سەدەی هەژدەو نۆزدەدا هەیە و هەروەها کاریگەر بوو بەتایبەتی بەشۆڕشی فەرەنسیو داگیرکارییە ناپلیۆنییەکان و بزوتنەوە نەتەوەگەراییەکانی لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا.

ڕیکسازییەکان پاش شەڕی جیهانی یەکەم سالّی 1918 و 1919 کە (مافی بڕیاردانی چارەنووسی نەتەوەیی) چەسپاندووەو ئاراستەی دژ بەکۆلۆنیالیزم لەو قۆناغەی کە لەدوای شەڕی جیهانی دووەمەوە هاتوون کاریگەرییان لەسەر هاندانی بزوتنەوە نەتەوەگەراییەکان هەبووە بەتایبەتی ئەو ناوچانەی جیهان کە نوێکردنەوەیان بەخۆوە دیوە وەك ئەفەریقاو ڕۆژهەلأتی ناوەڕاست. دەکرێ کە پەیوەندیی دروست بکرێ لەنێوان نەتەوەگەراییو ئایدۆلۆژیاکانی تردا وەك کۆکۆنیزم (لەزۆر دەولّەتیجیهانی سێیەمدا) و دیموکراسی (لەهەر دوو دەولّەتی ئەلّمانیاو ئیتالیادا پێش یەك خستن) ومەیلی سەربازیی (لەپرۆسیا) وئایدۆلۆژیا ئاینییەکان (لە ئێرلەندای باکور) .

نەتەوەگەرایی پشت دەبەستێ بە هۆکاری وەك زمانی هاوبەش و مێژووی هاوبەش و دراوسێیەتی هەرێمی و لێکچوونی ڕەگەزیی و ڕۆشنبیری هاوبەش لەبەرەنگاربوونەوەی پێناسە کە لەسەر بناغەی ئەو پێکهاتانەی کە دەکرێت پێناس بکرێن بەشێوەیەکی بابەتی وردو بەپشت بەستن بە باوەڕێکی خۆیی کەسەر بە تەوەیەکی هاوبەش بوون زیاتر لە هەلّبژاردنە بابەتییەکانی نەتەوە.

See also : Nation ;xenophobia.

**Nitionalization** ***خۆمالّیکردن (التامیم)***

بریتیە لەپرۆسەی بەخاوەن بوونی دەولّەت بۆ پرۆژەیەکی بازرگانی و دەست بەسەرا گرتنی دوای ئەوەی کە هی کەرتی تایبەت بووە و لەژێر ڕکێفی ئەواندا بووە. پاشان پرۆژەکە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەلایەن فەرمانگەیەکی حکومیەوە دەخرێتە کار یا ناڕاستەوخۆ لەڕیی کۆمپانیایەکی حکومیەوە.

خۆماڵیکردن پەیوەندە بەو ئایدۆلۆژیا رامیارییانەی کە لەجۆری سۆسیالیستی یا هەرەوەزیین، ئەگەر چیحکومەتە پارێزگارەکانیش زۆر جار جێبەجێیان کردوە لە بەریتانیاو حیزبەکانی راستیش لە هەندێك جیی ئەورووپای رۆژئاوادا پشتگیریی خۆماڵیکردنیان کردووە. خۆماڵیکردن سەرەتا رەنگە ئاراستەی دەزگا گشتییەکان بکرێت (وەك پرۆژەکانی پێدانی ئاوو کارەبا و غازو کۆمپانیاکانی گواستنەوە) بەلاّم لەوانەشە هەر جۆرە چالاکییەکی ئابوری بگرێتەوە.

**See also : Collectivism ; communica-**
**Tion ; privatization ; socialism.**

## Neutrailty بێلایەنی (*الحياد*)

بارێکی ئاساییە لەپەیوەندییە نێو دەوڵەتیەکاندا کە تیایدا دەوڵەتێك نیازی خۆی رادەگەیەنێ کەنەبێتە لایەن لەهەر ململانێیەکدا بەکردەوەی دژیەیەکێك لەلایەنیبەشەڕ هاتووە بەدەر لەلایەنەکەی تر.

لەبەرامبەریشدا دەوڵەتانی بێ لایەن وا چاوەڕوان دەکات کەزەوییەکانی زەوت نەکرێ و ڕێ لە بازرگانی و چالاکییەکانی تری نەگیرێت بەپێی توانا بەهۆی کردەوەی دەوڵەتە بەشەڕ هاتووەکانەوە، دەکرێ کە ئەم بێلایەنییە لەپێشدا رابگەیەنرێ، سەبارەت بەململانێیەکی چاوەڕوانکراو لەنێوان چەند لایەنێکی دیاریکراودا یا هەر ململانێیەکی دەرەکی. لەوانەیە بێلایەنی وەك مەرجی بەستنی رێکەوتنامەیەك بەسەر دەوڵەتێکدا بسەپێنرێ بۆ نموونە. زاراوەی (بێ لایەنکردن **Neutralization**) یش بەم پرۆسەیە دەوترێت. نەمسا نموونەی دەوڵەتی بێلایەنە پاش شەڕی جیهانی دووەم و رێکەوتنی چوار دەوڵەتەکە لەساڵی1955دا سەبارەت بە باری ئایندەیی نەمسا.



## Oligarchy ((حکم الاقلية ـ الاوليغاركية)) حوكمی كەمینە-ئۆلیگاریشی

شێوەیەکە لەحوكمی كۆمەڵێكی دەستەبژێری بچووك كەبەپێی بەرژەوەندیەكانی نوێنەرایەتی نەكراوە بەتایبەتی لەڕووی كۆكردنەوەی سامان و سود. یەكێكە لەو شێوە بنەڕەتییانەی حوكم كە ئەرستۆ دیاریكردووە، زاراوەكە هەندێك جار بەشێوەیەكی زیاتر بەكاردێ وەك هاو مانایەك بۆ هەر دەستە بژێرێكی فەرمانڕەوا.

**See also : Aristorcracy ; iron law of ol-
lgarch ; plutocrac ; political elites.**

## Ombudsman (صاحب المظالم) خاوەنی ستەملێكراوان

بنەچەی ووشەكە بەمانای فەرمانێكی ئەسكەندیناڤ دێت كەبریتیە لە داواكاری گشتی، زۆر وولاتی جیاوازی تر لەدەرەوەی ئەسكەندنیاڤیا ئەم دەزگایەیان پەیڕەو كردووە لەگەڵ گۆڕینی ناوەكەیدا بەگشتی. لەبەریتانیا بریتیە لە پایەی ڕێپێدراوی پەرلەمانی بۆ كارگێڕیی و خزمەتگوزارییە تەندروستیەكان و كارگێڕیی خۆجێیی. لەنیوزلەنداش هەر ڕێپێدراوی پەرلەمانی بۆ كاروباری سەربازیی لە ئیسپانیای پاش سەردەمی فرانكۆ پایەی (بەرگریكەر لەگەلە) لەكاتێكدا وردەكارییەكانی تایبەت بەدەسەڵاتی دەزگاكان و مافەكانی ڕەفتاركردن كە هەیەتی لە ویلایەتێكەوە بۆ یەكێكی تر دەگۆڕێ، بەلام ئەركی گشتیی بریتیە لەوەرگرتنی سكاڵای هاوولاتیان و ئەوانەی

تووشی ستەم هاتوون بەهۆی بڕیارێك یا كاری یەكێك لەفەرمانبەرە حكومیەكانەوە و ئەمانە كەناڵە ئاساییەكانی دادی داوەریی لە بەردەمیاندا ئاوەڵا نیە. (چونكە ڕەنگە ئەو بڕیارە یان ئەو كارە كە سكاڵای لێ دەكرێ یاسایی نەبێت) ئەگەر بۆ یەكەم سات ئەوە سەلمێنرا كە بارێكی (خراپ بەكارهێنانی دەسەلآت)هەیە (واتە بەكارهێنانی ناڕاستی دەسەلآت یا جێبەجێكردنی پێوەری نەگونجاو لەسەر وەرگرتنی بڕیار یا لێكدانەوەیەكی هەڵەی یاسا) ئەوا خاوەنیستەم لێكراوان و كارمەندانی فەرمانگەكەی لەو مەسەلەیە دەكۆڵنەوەو ڕاپۆرتێك دادەنێن كەئەو ئەنجامانە لەخۆی دەگرێ كەپێی دەگەن و دەیدەنە ئەنجومەنی نوێنەران، لەوانەشە كەخاوەنی ستەم لێكراوان لەهەندێك وولآتدا بۆ خۆی هەندێك ڕێ و شوێنی یاسایی بگرێتەبەر ئەگەر بەشیاوی بزانێ.

ڕەنگە زاراوەكە لەچوارچێوەی ناحكومیدا، بۆ وەسف كردنی ئەو بەر پرسانە یا ئەو دەزگا پەیوەندیدارانە بەكار بێ كە سەبارەت بە سكاڵای جەماوەرن لەڕێڕەوی یاسایی یا بانقی یا دڵنیاییدا.

لەهەندێك وولآتیشدا خاوەنی ستەم لێكراوان لەڕێی سیستمێك لە دادگا كارگێڕییەكانەوە كاری جێبەجێ دەكرێت، بەڵام ئەمە بەپێچەوانەی خاوەنی ستەم لێكراوانەوە) بریكاری پاشكۆی ئەنجومەنی نوێنەران نیە.

**See also :Administrative law ; admin-
Istrative tribunal.**

## One-party System    سیستمی تاك حیزبی (*نظام الحزب الواحد*)

سیستمێكە كە تەنها یەك حیزبی تێدایە، لەوانەیە كە تەنها حیزبێكیش بێت كە پەیوەندیدار بێت بەهۆی حوكمە یاساییەكان یا دەستورییەكانەوە یا چونكە توندو تیژیی و هەڕەشە بەبەكارهێنانی توندو تیژی باری دەست بەسەردا گرتنی ڕا دەگرێ (وەك ڕژێمی سەربازیی)، یا لەهەندێك باری دەگمەندا، كاتێك كە هەست و سۆزە

خومەلایەتیەکان یا خێڵکیەکان یا نیشتیمانیەکان لەڕێگەی یەك حیزبەوە ئاڕاستە دەکرێت لەکاتی ململانێ لەپێناوی سەربەخۆییدا یا لەدوای ئەمە. پێویستە کە سستمی تاك حیزبی جیابکرێتەوە لەوەی کە جیوڤانی سارتۆری لەکتێبەکەیدا کەبەناوی (حیزبەکان وسیستمی حیزبەکان) کە لەچاپخانەی زانکۆی کامبریدج دەرچووە لەساڵی 1976دا، باسی کردووەو وای داناوە کە بریتیە لە سیستمی حیزبە (باڵادەستەکان) یا (دەسەڵاتدارەکان) چونکە حیزبی تری پەیوەندیدار هەیە، سەرەڕای ئەوەی کەسیستمی حیزبی (باڵادەست) کەحیزبەکانی تر بەتەواوی پشت بەم دەبەستن (وەك کۆماری ئەڵمانیای دیموکراتیهەتا ساڵی 1989) زۆرجیاواز نابێت لەڕاستیدا لەسیستمی تاك حیزبی.

**See also : Hegemony ;partysystem ;**
**Totalitarianism.**

## Open Coalition ئیئتیلافی کراوە (*الأئتلاف المفتوح*)

کاتێك کە حیزبە نوێنەرایەتی کراوەکانی ناو ئەنجومەنی نوێنەران بەپێی ڕەهەندی ڕامیاریی پەیوەندیدار ڕێك دەخرێن (وەك ڕەهەندی چەپ– ڕاست) وکاتێك کە لانی کەم یەك حیزب ئەندام نابێ لە ئیئتیلافی فەرمانڕەوادا لەسەر ئەم ڕەهەندەی نێوان دوو حیزبی ناو ئیئتیلافەکەدا، ئەوا پێی دەوترێ ئیئتیلافی (کراوە) .

**See also : Closed coalition ; coalition.**

## Operationalization

بریتیه لەپرۆسەی وەرگێرانی چەمکەکان بەمەبەستی پەرەپێدانی ئەو گریمانە ئەزموونیانەی کە دەکرێ چاودێری بکرێن و تاقی بکرێنەوە و هەندێك جاریش بپێورێن. بۆ نموونە دەکرێ کە هێزێکی رامیارییوا دابنرێ کەبریتیە لە (توانای چینێکی دیاریکراو بۆ بەدی هێنانی بەرژەوەندییە ئامانجییەکانی) .

ئەگەر بویسترێ بارە کردارییەکان دیاری بکرێن لەهێزی رامیاریدا یا ئەو یاساو تیۆرانە پەرەپێبدرێن کەهێزی رامیارییان لەخۆ گرتووە، دەبێت کە (چین) و (جێبەجێکردن) و (بەرژەوەندییە ئامانجییەکان) پەیوەندیدار بن بە نیشانەکانی رووداني لەجیهانی رامیاریی کرداریدا،و دەبێت کە ئامرازی پێوان بە بیرۆکەی (توانا) وە ببەسترێتەوە. زۆربەی شیکەرەوەکان وای دەبینن کە پێویست ناکا هەموو چەمکەکان وەربگێردرێن بەم شێوەیە مادەم توانای کردەیی بەسە بۆ بەرهەم هێنانی هەندێك گریمانەی ئەزموونی. رێوشوێنەکانی وەرگێرانی کردەییش بۆ تیۆرێکی دیاریکراو هەندێك جار پێی دەوترێت رێساکانی هاوجووتبوون یا لێکدانەوە.

See also :Concept ; theory

## Operational Research توێژینەوەکانی کردەکان (*بحوث العمليات*)

زاراوەیەکە کەبنەچەکەی لەبەکارهێنانی شێوازە ئامارییەکان و زانستەکانی ترەوە هاتووە لەشیکردنەوەی مەسەلە ئالۆزەکان ویەکلاکردنەوەیان لە شەری جیهانی دووەمدا. ئێستا توێژینەوەکانی کردەکان بریتیە لەجێبەجێکردنی شێوازە بڕییەکان لەسەر بناغەیەکی فرە لقی یا بەناو لقەکاندا لەگرفتە بڕیارییەکان یا فەرمانییەکانی هەر رێکخراوێکدا لەوانەش حکومەت.

## Opinion Leader سەرکردەی راکان (*قائد الاراء*)

کەسێکە کە کاریگەرییی لەسەر کۆمەڵگەیەك یا کۆمەڵێکی تر هەیە لەپێکهێنانی ڕای ئەوانی تردا چونکە بەسەرچاوەیەکی بڕوا پێکراو یاپشت پێبەستراو دادەنرێ بۆ زانیاریی یا ئامۆژگاریی، زۆر جار ئەوانی تر لەو کۆمەڵە کۆمەڵایەتیدا ڕاکانی وەك نموونەیەك پەیڕەو دەکەن. پێویستیش نیە کە سەرکردەی ڕاکان پایەیەك یا دەسەڵاتێکی نیزامیی هەبێ یا دەسەلات بگرێ بەسەر سەرچاوەکانی پەیوەندیکردندا لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەمە لەوانەیە پەیوەندیدار بێ بە پێکهێنانی ناوو ناوبانگی سەرکردەی ڕاکانەوە.

بیرۆکەی سەرکردەکانی ڕا لەنێو ئەو تیۆرە دوو هەنگاویەدایە لەلێشاوی زانیارییەکان کەپێی وایە زۆربەی خەڵك زانیارییەکانیان لەئاژانسی ساکارەکانی وەك سەرکردەکانی ڕاوە وەردەگرن و ڕایەکانیان پێك دێنن دەربارەی مەسەلە کۆمەڵایەتیەکان نەوەك بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەخزمەتگوزارییە هەواڵییەکان یا سەرچاوەکانی تری زانیارییە ڕاستەوخۆکانەوە.

See also ;Political communication.

## Opposition (المعارضة) بەرهەڵستکاری

زاراوەی (بەرهەڵستکاریی) لەڕامیارییدا و لەبەکار هێنانی هەرە گشتیدا بریتیە لەهەر کۆمەڵێك یا کۆمەڵە تاکێك کەجیاوازیان هەیە لەگەڵ حکومەتدا –لەسەر بناغەیەکی جێگیرو درێژ خایەن،ئەگەرچی دەکرێت کەبەرهەڵستکاریی تایبەت بەمەسەلەکان لەچوار چێوەی یەك یاسا یاپێشنیازێکی ڕامیارییدا وەسف بکرێت. زاراوەکە بەشێوەیەکی دیاریکراو تر بەسەر ئەو حیزبانەدا دەچەسپێ کە لە ئەنجومەنی نوێنەراندان و جیاوازییان لەگەڵ حکومەتدا هەیەو دەیانەوێ کەجێیان بگرنەوە.

لەهەنــدێك ئەنجومەنــەكانی نوێنەرایــەتی و نموونــەی ئــەم جــۆرە بەرهەڵــستكارییە پەرلەمانی و نیزامی و دەزگایی دەبێت: لەبــەریتانیا و ئەمــەریكاو ئــەڵمانیادا، هەنــدێك حوكم هەیە كــە تایبەتــە بــە پێشكەشكردنی دارایــی حكومیــەكان و بــارێكی رامیــاریی دیاریكراو بۆ بەرهەڵستكاران سەر باری مــافی وەڵامدانــەوەی ئــەو بەیانــە گشتییانەی كەلەحكومەتــەوە دەردەچــن و مــافی راوێــژكاری لەهەنــدێ مەســەلەی دیاریكراوداكــە تایبەتـــە بـــەدوو حیزبەكـــەوە وەك كاتـــەكانی ژوان و رێ و شـــوێنە یاســـاییەكان و راگەیاندنی شەڕو، رێكخستنەكانی ئاهەنگە رەسمییەكانی دەوڵەت. لەهەندێ دەوڵەتی تــردا (وەك بــەریتانیا پــێش نیــوەی ســەدەی نــۆزدە) لەوانەیــە بەرهەڵــستكاریی بــە (دەستە) یەك دابنرێت و بەنەیاری حكومەت دابنرێت سەرەڕای ئەوەی كە نەیاری ئــەو حكومەتەیەیە كە ئەو جۆرە دەسەلاتە دەگرێتە دەست، بەتایبــەتی لــەو دەوڵەتانــەی كە یەك حیزب حوكمی دەكات، ئەم جۆرە بەرهەڵستكاریە بــەناپاك دادانرێ. هــەروەك چۆن بەرهەڵستكاریی لەدەرەوەی پەرلــەمان گرنگــە لــە هەندێك دەوڵەتــدا بەتایبــەتی لەكاتی نەبوونی بەرهەڵستكارییەكی پەرلەمانیدا یا بوونێكی ناگاریگەردا. دەكرێت كــە زاراوەكە وەسفی ئەو كۆمەڵانەش بكات كە لەناو حیزبەكان یا نەورێكخراوانەی تــر دان و بەشێوەیەكی رێك و پێك لەگەڵ سەركردایەتی ی ئەو رێكخراوەدا جیاوازیان لەڕادەدا هەیە.

See also : Faction

## Organization (المنظمة) رێكخراو

كۆمــەڵێكی كۆمەلایەتیــە سنورێكی هەیــە كــە قــابیلی جیاكردنەوەیــە و هــەروەها رۆشنبیرییەكی لقیی هاوبەشی هەیە كەبەئەنقەست دامەزراوە بەمەبەستی هەوڵدان بۆ جێبەجێكردنی ئامانجێك لەرێگــەی كۆششی هاوبەشــی ئەندامەكانیــەوە. لەبــەر ئەمــە

ڕێکخراوی ڕامیاریی کۆمەڵێکە کە دامەزراوە بۆ کارکردن لەسەر جێبەجێکردنی ئامانجە ڕامیارییەکان.

See also : Movement ;organization theory.

## Organization Theory تیۆری ڕێکخراو (نظرية التنظيم)

چوار چێوەیەکی چەمکەکانە بۆ لێکۆڵینەوەی ڕێکخراوەکان و تایبەتمەندیو ڕەفتارو ئەندامێتییان بایەخە سەرەکییەکانی تیۆر داڕێژەرانی ڕیکخستن بریتین لە: کارلێك کردنی نێوان ئەندامانیڕێکخراوەکە بە دەورەکانیشیان و جۆرە هەرەمیەکان و پەیوەندیکردنی ئالۆگۆڕکراو..هتد و شێوازەکانی پەیکەری ڕێکخراوەیی و جۆرەکانی سەرکردایەتی، و پێوەرەکانی ڕێکخراوەکان و ڕۆشنبیرییان، و وەرگرتنی بڕیار تیایانداو یەکلایکردنەوەی ململانێکان و پەیوەندییەکانی نێوان پەیکەرە نیزامیو نانیزامیەکانی ناو ڕێکخراوەکان و کارلێکی نێوان ڕێکخراوەکان، لێکۆڵینەوەکە بریتیە لە بەکارهێنانی ئەو چەمك و ڕێگەیانەی کە لەچەندین لقەوە وەرگیراون وەك تیۆری یارییەکان و تیۆری کۆمەڵە بچوکەکەو دەروازەکانی تیۆری سیستمەکان.

تیۆری ڕێکخراو لەزانستی ڕامیارییدا بەکار هاتووە بەتایبەتی بەمانای لێکۆڵینەوەی لیژنەکان و کۆمەڵە بچووکەکانی ترو حیزب و دەستە یاسادانەرەکان.

See also : organization.

## ئەرکی زیاد لە ئەندازە (العبء المفرط)

(ا) ئەرکی حکومی زیاد لەئەندازە (العبء الحكومي المفرط)

(Overload (a:

Government Overload

ئەم زاراوەیە وەسفی ئەو بارە دەکات کە تیایدا حکومەتەکان کەوتونەتە ژێر باری

قورســـی داواکارییـــه زۆرەکـــانی گەلـــەوە بـــۆ یەکلاییکردنـــەوەی گرفتـــەکان یـــا پێشکەشکردنی سودی ڕامیـاریی سـەرباری زیـاد بـوونی ئـاڵۆزی ژینگـەی تـەکنیکی و ئابووریو کۆمەلایەتیو هی تر کە تیایدا سیستمی ڕامیاریی کار دەکات. ئەرکی زیاد لە ئەندازە بە پاساوێك دانراوە بۆ سەرنەکەوتنی حکومەتـەکان لەچارەسـەری قەیرانـدا و هۆیەك بۆ گەشەی چالاکیيە ڕامیارییە (جێگرەوەکـان) وەك (بزوتنـەوە کۆمەلایەتیـە نوێیەکان) ی تایبەت بە تەوژمی پاراستنی ژینگە یا بانگەواز بۆ پاراستنی مافـەکانی ئافرەت، کۆمەڵەکانی دەستپێشخەرییەکانی هاولاتیـان و پەیوەندییـە ناڕامیارییـەکانی هاوولاتیان وەك کاردانەوەیەك کەلەسەر بناغـەی متمانـە نەبوونـە بـەتوانای حکومـەت لەجێبەجێکردنی بەڵێنەکاندا بە تایبەتی لەو دەوڵەتانەی کەوەك ئـەڵمانیاو ئەمـەریکاو سوید و هوڵەندان .

**Overload (b)** **ئەرکی زیاد لە ئەندازە** (*العبء المفرط*)

**Government overload**

**( ب ) ئەرکی پەیوەندیکردنی زیاد لەئەندازە**

زاراوەیەکە پەیڕەوی پەیوەندیکردنەکان لە شیکردنەوەی ڕامیاریدا بـەکار دێـنن و بریتیـە لـە بـاری کەناڵـەکانی پەیوەنـدیکردن لەکاتێکـدا کەبـەکار دێ بـۆ گەیانـدنی ئامرازەکـان بەڕێژەیـەکی گـەورەتر لـە ئـەو پـەڕی توانـای. ئەگـەر ئـەم ئەرکـە زیـاد لەئەندازەیـە بـەردەوام بـوو ئـەوا لەوانەیـە ببێتـە هـۆی سـەرنەکەوتنی کەناڵەکـەو شـێواندنی نامـەکان و هـەتا ڕادەی هـەرەس هێنـانی سیـستمی پەیوەندیکردنـەکان. ئەمەش ئامازەیەکە بۆ پەرەپێدانی کەناڵی زانیاریی نوێ یا هی تر یـا کـەم کردنـەوەی ئەرك لەسەر کەناڵەکانی ئێستا.

See also : polityical communication.

# P

## pocifism ئاشتیگەرایی (السلامیة)

باوەڕ بوونە بەوەی کە توندو تیژی،تەنانەت لەشەڕیشدا، ناکرێت بە ئامانجە ویستراوەکان یا بەدی هاتووەکان پاساو بدرێتەوە. لەگەڵ زیاد بوونی توانی کاولکاری و واقیعی شەڕی نویدا ئاشتیگەرایی ڕۆلێکی گەورەتری وەرگرتووە لەبزوتنەوە جیاوازەکانی ئاشتیدا لەناو حیزبە رمیارییەکان و کۆمەڵەکانی فشاردا. ئەم جۆرە بیرو باوەڕانە بەچەند ڕێگەیەکی تر کاری کردووتە سەر چالاکیی ڕامیاریی: بەشێك لە جووڵە بەرەو شێوە جیاوازەکانی ڕاوێژو دادوەریی نێو دەوڵەتی بەکۆمەڵەی نەتەوەکان و نەتەوە یەکگرتووەکان و دادگای دادی نێو دەوڵەتیشەوە، لەڕێگەی پەیوەندبوون بە بەرنامەکانی بەرگریی نێگەتیڤەوە وەك ئەو بزوتنەوەیە کەگاندی سەرکردایەتی کرد لەهیند و لەناوەڕۆکەکانی بۆ ملکەچبوونی ڕامیاریی کاتێك ئەوانەی ویژدانیان ئازاریان دەدا پەیوەست نابن بە فەرمانە سەربازییەکان یا بەرهەڵستییخۆسازدان بۆ شەڕ دەکەن.

## Poct پەیمان (حلف)

ڕێکەوتنێکە لەنێوان چەند کەسێك یا کۆمەڵێك یا دەوڵەتێك سەبارەت بە بەڵێن دان بەکاری هاوبەش یا ئامادەبوون بۆ ئەنجام دانی ئەوە لەهەندێك بارودۆخی دیاریکراودا. پەیمان کەمتر نیزامییە و زیاتر پابەندە بە ناوەڕۆکی بەڵێن نامەکەوە سەرەڕای ئەوەش کەهەندێك لەو بەڵێننامانە پیی دەوترێت (پەیمان) (وەك ئەو بەڵێننامەیەی

کە مۆلۆتۆڤ و ریبنترۆب ئیمزایان کردوە بەناوی یەکێتیی سۆڤیەت و ئەڵمانیای نازییەوە لەساڵی 1939دا) .لەرامیاری بەریتانیاشدا، وەك ئەو ڕێکەوتننامەیەی نێوان حکومەتی کرێکاری بەسەرۆکایەتی کا لاهان و نوێنەرانی حیزبی ئازادیخوازان بە سەرکردایەتی دایڤید ستیل لەساڵی 1977 کە حکومەتی کرێکاریی لەدەسەلاّتدا هێشتەوە، سەرەرای نەبوونی زۆرینەی یەك حیزبی کە ناونراوە (پەیمانی ئازادیخوازان-کرێکاران) .

## Palace Revolution شۆڕشی کۆشك (ثورة القصر)

بریتیە لەگۆرینی فەرمانرەوایەك لەرێگەی هەرەشەوە بە بەکارهێنانی هێزەوە یا بەراستی بەکارهێنانی لەلایەن دەستەو تاقمی فەرمانرەوا یا ئەو رامیارانەی کە پەیوەندیی راستەوخۆیان بەفەرمانرەواوە هەیە. کە لەزۆربەی کاتدا رەگەزی کتوپریی تیایە لەگەڵ بەکارهێنانی لانی کەمی توندوتیژیی وکەمێك ورووژاندنی هەر وەك چۆن ئەم شۆرش بەجۆرێك لەکودەتای سەربازی دادەنرێت.

See also: Coupdetat; revdution

## لێکۆڵینەوەی پانێل (دراسة البینة)

جۆرێکە لەلێکۆڵینەوەی درێژیی کە شێوازی چاوپێکەوتنە دووبارە بووەکان بەکار دێنێ یا رێگەی تر بۆ دەست خستنی زانیاریی (وەك ئەو یاداشتانەی کە بەشدارەکان پری دەکەنەوە) زۆر جاریش نموونەیەك لە دانیشتوان وەردەگرێ کەهیوا وایە بەبێ گۆران بمێنێتەوە ئەگەرچی لەگەڵ ئەو ماوەیەی لێکۆڵینەوەی پانێلەکە کەمبوونەوەیەك بەخۆیەوە دەبینێ یا پەیدا بوونی کۆمەڵێکی بچوکتر لەهەر بەکار هێنانێکی دواتری پانێلەکەدا سەپاندن بریتیە لە لێکدانەوەی ئەو گۆرانکارییانە لە هەڵوێستەکانی بەشدار بووان و بیرو راو رەفتاریان ـــ پاشانیش رەفتاری ئەو دانیشتوانەی کە نموونەکە نوێنەرایەتیان دەکات و بیروڕایان و رەفتاریان) لەماوەیەکی دیاریکراودا. ئەم رێگەیە لەسۆسیۆلۆژیاو سایکۆلۆژی کۆمەلایەتی و

توێژینەوەکان و بازاڕدا بەکار هاتووە.

لەزانستی ڕامیاریشدا باشترین جێبەجێکردنە ناسراوەکانی لە لێکۆڵینەوەکانی دەنگدان لەهەڵبژاردنە گشتییەکاندا بووە یا دۆزینەوەی گۆڕانکارییەکان لەنیازەکانی دەنگدان و بەستنەوەی ئەم گۆڕانکارییانە لەگەڵ ڕواڵەتەکانی تری پێشنیازکەردا. وەك گۆڕانکاری لەبینینی بانگەشەی هەڵبژاردن یا گۆڕانکاریی لەپیشە یا جێگەی لەرەوشی خێزانیدا.

See also: Longitudinal
Studies: Psephology : sample; survey.

## نموونەی (أ) : بەکارهێنانی گشتی

*(النموذج (أ) الاستعمال العام)*

## Paradigm (a) :
## general usage

بارێکی ڕووت یا پێشکەوتوویی ڕێژەیی بۆ دیاردەیەك کەلەژێر لێکۆڵینەوەدایەو بەشێوەیەکی ڕوون نوێنەرایەتی هەندێك ڕواڵەتی گرنگی دیاریکراو یا پەیوەندیدار دەکات لەبەر ئەوە بەسوودە وەك جۆرێك لە شیکردنەوە بۆ بارەکانی تر.

نموونەکە بەهەمان ڕێگە بەکار دێ وەك جۆرێکی نموونەیی بەڵام جیاوازە لەو چەمکەی کە ئەم بارێکی ڕاستەقینە پێك دێنێت.. لەوانەیە کە پەرەسەندنی ڕامیاریی بەریتانی وەك نموونەیەك بەکار بێت بۆ پەرەسەندنی ئازادی دیموکراسی، هەر وەك چۆن ئەمەریکا دەکرێت بەنموونەیەکی فیدرالیزم دابنرێت،زۆرە ملێیی جەستەیی وەك جۆرێك لە پیادەکردنی هێز پێشکەش دەکرێت.

See also : Ideal type.

## نموونەی (ب) بەکارهێنانی کون

## puradigm (b) Kuhnian usagy *(النموذج (ب) استعمال کون*

مانایەکی زیاتر پابەندە بۆ زاراوەی نموونەی (ا) تۆماس کوون بەکاری هێناوە لەشیکردنەوەی پەرەسەندنی زانستدا . بەپێی کوون توێژینەوەی زانستی لەهەر بوارێکدا بەو جیا دەکرێتەوە کە دوا یەکە لەنێوان ماوەکانی زانستی (ئاسایی) و زانستی (شۆڕگێڕی) دا. بەسەر زانستی ئاسایدا یەك ڕووانین زاڵە لەجۆری ئەو تیۆرەی پەرەی پێنەدا، وەجۆرەکانی ئەو ئەزموونەی کە جێبەجێ دەکرێو ڕێو شوێنەکانی پێوان و هی تر، کۆمەڵەی زانستی مەیدانی توێژینەوەی خۆی نادۆزێتەوە تەنها لەو چوار چێوەیەدا نەبێت، هیچ تێڕامانێکی جیدی نیە لە هیچ جێگرەوەیەکدا. بەڵام گونجاوی ئەم نموونە پەسەندکراوە زوو یا درەنگ ڕووبەڕوی گومان دەکرێتەوەو ماوەیەکی شۆڕشگێڕانەی بەدوا دێت کە تیایدا جەدەلێکی بنەڕەتی ڕوو دەدات و کۆمەڵێکی جۆراو جۆر جێگرەوە پێش نیاز دەکرێت تا جێی نموونە کۆنەکە بگرێتەوە. ناکرێ کە ڕێسای جێگیری حوکم بەسەر جێگرەوە ململانێ کارەکاندا جێ بەجێ بکرێت،بەڵام ڕا لەکۆتاییدا لەسەر یەك پاڵێوراو چڕ دەبێتەوە، ئەمەش دەبێتە ڕای سەرکەوتووی نموونەی زاڵ بوو لەماوەیەکی تردا لەزانستی ئاساییدا.

بیرۆکەی زانست بەو پێیەی شوێن کەوتنی نمونەکانە کۆمەڵە پرسیارێك لەبارەی سروشتی پێشکەوتنی زانستیەوە دەوروژێنێت. ئەگەر شۆڕشەکانیش خولی زانست پەرت بکات و جارێکی تر پێناسەو وەرچەرخانی تێڕوانینەکانی بۆ جیهان و شێوازە گونجاوەکان لە ..... و پێوەرەکانی دیاریکردنی گرفتە گرنگەکان بکاتەوە، ئەوا زانست ناکرێت لەهەر مانایەکی سادەدا، لەپرۆسەیەکی بەردەوامی کەڵەکە بوونی مەعریفی پێك بێت.

لەحاڵەتی نائامادەیی یەك تێڕوانینی تیۆری هەژموندراردا ئەوا دەبێت

جێبەجێکردنی ئەم بەکارهێنانە (گەردونیە) جیی گومان بێت. ئەمە لەکاتێکدا زاراوەکە زۆر جار بەکار دێ بۆ دیاریکردنی ڕێبازە ململانێکەرەکان لەشیکاریکردنی رامیاریدا، (مارکس) یان ڕێبازی (فرەیی) هەروەها ئەم بەکار هێنانە ئەوە لەخۆ دەگرێت کە هەر دوو ڕێبازەکە بۆ خۆیان راوبۆچوونی ڕیشەیی جیاواز تەبەنی دەکەن لەجیهانی ڕامیاریی و گرفتەکاندا بەشیوەیەك کەناکرێت گفتوگۆیەکی مانادار لەنێوەیاندا ئەنجام بدرێت.

See also: Falsificationism;
Positivsm; problematic ; scientific method.

**parameters** (*القیود ـ الحدود*) **کۆتەکان ـ سنورەکان**

کۆتەکان لەشیکردنەوەدا بریتیە لەڕەهەند یا بارەکانی دژخە دەرەکییە پەیوەندیدارەکان کە بەجێگیریی دەمێنێتەوە لەهەر زنجیرەیەك تاقیکردنەوەو ئەزموون و پێوانەکاندا....هتد.
بەلام ڕەنگە هەمە جۆری لەزنجیرەکانی تری وەك ئەم تاقیکردنەوە یا پێوانانە هەبێت.
هەروەها زاراوەکە بەشیوەیەکی خوازراو بەکار دێ بۆ وەسفکردنی ئەو سنورو کۆتانەی کەناکرێت یا نابێت کەشتێك لیی تێپەڕێ وەك ئەم ووتەیە دەڵێت: (دەستورەکان سنورەکانی هێزی ڕامیاریی دادەنێن) .

See also: variables.

**Pareto optimnm** (*درجة باریتو المثلى*) **پلەی باریتۆی نموونەیی**

زاراوەیەکە لەزانستی ئابوورییەوە وەرگیراوە بریتیە لە تایبەتکردنی دەرامەتەکان بەشێوەیەك کە ناکرێت سەر لەنوێ تایبەتکردنێکی تری ئەم دەرامەتانە سودی بۆ هیچ یەکێك هەبێت بێ زیان گەیاندنی بەوی دی. هەروەها بیرۆکەکە بەکار دێ لەهەڵسەنگاندنی توانای دابەشکردنی سیستەمەکان و دیاریکردنی هەڵوێستەکانی هاوسەنگی لە سازشدا. زەحمەتی سەرەکیش لەدیاریکردنی سنووریی سەر لەنوێ هەڵسەنگاندنەکاندایە کەئێمە زیاتر وەك بڕیارێکی هەڕەمەکی دەردەکەوێت.

See slso: Bargaining thcory;
equilibrium.

## Participont observation (الملاحظة الشارك) تێبینی بەشدارێك

ڕێگەیەکە لەتوێژینەوەی زانستە کۆمەڵایەتیەکاندا کە تیایدا ئەندامی کۆمەڵێك یا ڕێکخراوێك یا بەشدارێك لە چالاکیەکدا وەك کودەتایەکی چەکداری لەهەمان کاتدا دەبێتە چاودێر و زانیارییە پەیوەندیدارەکان تۆمار دەکات یا دەیگوێزێتەوە کە دەربارەی ڕەفتاری کۆمەڵەکە یا ڕێڕەوی ڕووداوەکانە یا کەسێکی دەرەکی دەبێتە ئەندام لەو کۆمەڵە یا ڕێکخراوەدا بۆ هەمان مەبەست.

دەکرێت کە چەندین سود لەتێبینی بەشدار وەربگیرێت نەوەك لەتێبینی دەرەکی یا شێوازە بەرامبەرەکان. دەشێت کە کاریگەری بارەکە لەژێر ڕکێفی تێبینیدا بە توێژینەوە کەمتر بێت ئەگەر ئەندامانی کۆمەڵەکە نەزانن کە ئەوان لەژێر تێبینیدان یا کەمتر ئەو ڕاستیە بزانن کەئەوان لەژێر تێبینیدان. چاودێر دەتوانێت بیرۆکەیەکی هەستیار بەدەست بهێنێت لەکۆمەڵەکەو چالاکیەکاندا بە بەشداریکردن زیاتر لەمانەوە لەدوورییەوە. بەڵام ئەمە گرفتی ڕەوشتیی و کرداری دەورووژێنێت سەبارەت بە هەر شاردنەوەیەك بۆ ڕۆڵی دوو سەرەی چاودێری بەشدار .

ئەم شێوازە بەتایبەتی لەزانستی مرۆڤدا بەکار هاتووە، هەروەها لەلێکۆڵینەوە پیشەسازی و ڕێکخراوەیی و لێکۆڵینەوەی کۆمەڵەکان لەسۆسۆلۆژیاداو لێکۆڵینەوەی کۆمەڵە بچووکەکان لە سایکۆلۆژی کۆمەڵایەتیدا، جێبەجێکردنەکانیش لە زانستە ڕامیارییەکاندا بەتایبەتی لەبوارەکانی ڕامیاریی کۆمەڵگاو ڕامیاریی کۆمەڵە بچوکەکان وەرگرتنی بڕیارەکان و لێکۆڵینەوەی هەڵبژاردنەکاندا بوون.

**Participation** **بەشداریی (المشارکة)**

زاراوەکە بەکار دێ بۆ وەسفکردنی چالاکییە خۆبەخشەکان نەوەك زۆرەملێیەکان سەرەڕای ئەوەی کە ئەم جیاوازییە لەناو بیرۆکەکەدا نیە.

بەم شێوەیە ئەوا بەشداریی، هەروەك بەکار دێ لەبوارە ڕامیارییەکاندا، بریتیە لە چالاکییەکی خۆبەخشی تاك لەکاروباری ڕامیارییدا وەك : دەنگدان،ئەندامێتی و چالاکی پەیوەند بە کۆمەڵە ڕامیارییەکانی وەك کۆمەڵەکانی بەبەرژەوەندی و بزوتنەوەکان و حیزبە ڕامیارییەکان و وەرگرتنی پلەو پایەکان لەدەزگا ڕامیارییەکاندا، پیادەکردنی سەرکردایەتی ڕامیاریی، و چالاکییە نانیزامیەکانی وەك بەشداریکردن لە مشت ومڕە ڕامیارییەکان یا ئامادەبوون لەبۆنە ڕامیارییەکانی وەك خۆ پیشاندانەکان،و هەوڵەکانی قایلکردنی دەسەڵاتەکان یا خەڵك بە کارکردن بەڕێگەی دیاریکراو سەبارەت بە ئامانجە ڕامیارییەکان. لەبەر ئەمە زاراوەکە بەتوندی پەیوەندە بە سیستمە ڕامیارییە دیموکراسیەکانەوە چونکە سیستمە نادیموکراتیەکان حەز دەکەن کە بەشداری جەماوەر کۆت بکەن یا بەڕێگەیەك ئاراستەی بکەن کە پێشتر دیاریکراوە، بەڵام زاراوەکە ناچەسپێت بەسەر شێوە تەقلیدییەکاندا یا تەنانەت شێوە یاساییەکانی چالاکیە ڕامیارییەکان بەتەنها. دەبێت کە چالاکییە تەقلیدیی و نایاساییەکان لەناوەڕۆکیانەوە تێبگەین.

**See also: Mobilization.**

**Party** **حیزب (الحزب)**

حیزبی ڕامیاریی بریتیە لە کۆمەڵێکی ڕێکخراو کە پێک هاتووە لەو ئەندامانەی کە کۆمەڵێکی هاوبەشی لەبەهاو ڕامیارییەکان هەڵدەگرن و ئامانجی سەرەکیان وەرگرتنی دەسەلاتی ڕامیاریی و پلە و پایە گشتییەکانە بەمەبەستی جێبەجێکردنی ڕامیارییەکان. حیزب هەوڵ دەدات کە ئەم دەسەلاتەی دەسکەوێت بەڕێگە دەستورییەکان بە تایبەتی بە پێشبڕکێ لە هەڵبژاردنە گشتییەکاندا سەرەڕای ئەوەی کە حیزبە شۆڕشگێڕەکان یا بەرهەڵستکاری ڕژێم لەوانەیە چالاکی ڕامیاریی لەدەرەوەی دەستور پیادە بکات بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی.

حیزب جیاواز دەبێت لەکۆمەڵەکانی فشار یا کۆمەڵەکانی بەرژەوەندی چونکە ئەمانە بایەخ دەدەن بە بەکارکردنە سەر بڕیارە حکومیەکان یا پێشنیازە یاساییەکان لەبارێکی دیاریکراودا یا لەمەودایەکی دیاریکراوی بارەکاندا، لەکاتێکدا حیزب هەوڵدەدات کە بەشداری بکات لەحوکمدا پاشانیش جێبەجێکردنی ڕامیارییەکانی بەلانی کەمەوە، لەمەودای تەواوی کاروبارە گشتییەکاندا، هەروەها حیزب جیاوازە لەبزوتنەوەش بەهۆی پەیکەرە ڕێکخراوەییەکەیەوە کە زیاتر نیزامییە و لەگەڵ سروشتی زیاتر دیاریکردنی ئامانجەکانی.

پیادەکردنی دەسەلاتی حکومیی تەنها کارێکە کە حیزبی ڕامیاریی هەوڵی جێبەجێکردنی دەدات. ئەو بریتیە لە ئاژانسێك بۆ هەموو لایەنگرە ڕامیارییەکان و ئامرازێك بۆ ڕێکخستنی ڕامیاریی کۆمەڵگاو کەناڵێك بۆ پەیوەندیی ڕامیاریی... هتد لەڕووی سیستمی ڕامیاریشەوە فەرمانی هەیە (چاودێریدابینکردنی خزمەتگوزارییە گشتییەکان Gate-keeping ) لێك بەستنی بەرژەوەندیەکان و گەیاندنی داواکاریەکانی ئەوانەی کە نوێنەرایەتیان دەکاو دارشتنی ئەو داواکاریانە لەشێوەی پێشنیازی پتەودا بۆ وەرگرتنی ڕێوشوێنی پێویست دەربارەیان لەلایەن دەسەلاتەکانەوە.

حیزبەکان لەدەوڵەتە یەك حیزبیەکاندا هەمان ئەو ئامانجە بنەڕەتییەیان هەیە کە

تایبەتە بەدەست بەسەراگرتنی دەسەلاتی حکومی وەك حیزبەکانی ناو سیستمی حیزبە ڕکابەرەکان. ڕەنگە سەرچاوەکانی ڕکابەریی ڕمیاریی جیاوازی هەبێت (بۆ نموونە وەك چین و یەکێتی سۆڤیەت لەڕابردوودا ڕکابەریی لەنێوان سەربازییەکان یا بیرۆکراتیەتدا دەبێ) .

حیزبە تایبەتمەندەکان و حیزبە بچووکەکان کە هیوایەکی گەورەیان نیە لە بەشداریکردن لەدەسەلاتدا بارێکی پەراوێزیین لەم پێناسەیەدا کە لێرەدا خراوەتە ڕو، لەوانەیە باشتر وابێ کە وەسفی هەندێکیان وا بکرێ کە بریتیە لە کۆمەڵەکانی بەرژەوەندی کەهەڵمەتەکانی هەڵبژاردن بۆ ستراتیژیەتی دەسەلات بەکار دێنێ:

حیزبی پەنابەران لەئەڵمانیای ڕۆژئاوادا لەدەیەی پەنجاکاندا بۆ نموونە، ئەویش ڕەنگە وا وەسف بکرێ کە بریتە لە (حیزبەکانی یەك مەسەلە) وەك حیزبە (سەوزەکان) لەقۆناغی یەکەمی بوونیدا.

زاناکانی ڕامیاریی چڕ بوونەتەوە لەلێکۆڵینەوەی حیزبەکاندا بەتایبەتی لە لایەنەکانی پەیکەری ڕێکخستنیو سەرکردایەتی وڕێگەکانی خستنە ڕووی لایەنگرەکان و ڕامیارییەکان و پرۆسەکانی دانانی ڕامیارییەکان و پێشینە کۆمەلایەتی و ڕەفتاری ڕامیاریی ئەندام و لایەنگرەکان. هەر وەك چۆن گەلێك لێکۆڵینەوەش لەلایەنەکانی سیستمی حیزبەکاندا دانراوە.

**See also: Faction:interest group:**
**Interests; iron low of oligarchy; lobby;**
**Movement; political system.**

## Party Ideutification ئینتیمای حیزبی (*الانتماء الحزبی*)

بریتیە لە هەستی ئینتیما بوون بۆ حیزبێکی ڕامیاریی دیاریکراو، ئەم هەستەش بەرەو ئەوە دەڕوات کە بەردەوام بێت لەڕێگەی بەرهەمهێنانی بۆ ڕوانگەیەکی حیزبیانە بەرەو ڕووداوە ڕامیارییەکان و دیاریکردنی هەڵوێستی دەنگدەران لەپێشدا

لەخەیاری هەڵبژاردندا. ڕەنگە تاکەکان هەست بە ئینتیما بۆ حیزبێك بکەن هەتا ئەگەر درێژەی ڕامیاییەکانی ئێستای ئەو حیزبە نەزانن.

ناسنامەی حیزبی، لەتوێژینەوە ئەزموونیەکاندا بە و پرسیارە دیاریٌ دەکریٚ کە ئایا تاکەکان بەگشتی خۆیان بەلایەنگری حیزبی پارێزگاران یان کرێکاران یا حیزبی دیموکراتی لیبراڵ...هتد دەزانن.. ئەم جۆرە پرسیارانە هەوڵ ئەدەن کەبوونی ئەو هەڵوێستانە دیاری بکەن کە هاو جووت دەبێ لەگەڵ ڕەفتاری هەڵبژاردنی کرداریدا یاجیاوازە لیی. بۆ نموونە، لەوانەیە دەنگدەرێك لە ئەمەریکادا سۆزی هەبێ لەگەڵ حیزبی دیموکراتیدا بەلاّم بەدڵسۆز نامێنێتەوە بۆ ئەو حیزبە کاتێك کە کەسێتی پاڵێوراوی سەرۆکایەتی کۆمارییەکانی زۆر پێ باشە یا شێوازی و تواناکانی بەدڵە. توێژینەوە ئەزموونیەکان لەوەدا چڕ دەبنەوە کەدەربارەی سەرهەڵدانی پەیوەندی و توندیەکەی و پەیوەستیی بە ڕەفتاریی هەڵبژاردنی و ناوەڕۆکی جیاوازەکان لەسەر هەڵدانی پەیوەندی و توندییەکەی بە تێپەڕ بوونی کات یا لەنێوان سیستمە جیاوازەکانداو لەسەرچاوە کۆمەڵایەتی و دەروونییەکانیدا.

(نموونەی ئینتیمای حیزبی) وای دا دەنێ کە ڕەفتاری هەڵبژاردنی لەڕێگەی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیەوە بەتایبەتی لەخێزان خۆیدا، زۆربەی دەنگدەران دەبنە لایەنگری حیزبێك یا زیاتر لەحیزبە سەرەکیەکان و ئەم پەیوەستییانەش جێگریی دەبەخشنە ڕژێمی ڕامیاریی نەوە دوای نەوە.

(ئینتیمای حیزبی) لێکدانەوەیەکی جیاواز هەڵدەگرێ لەنموونەکانی هەڵبژاردنی ئەقلانیدا وەك ئامرازێك مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ کە دەنگدەران لەپێشدا پێوەی پەیوەست دەبن بەهەڵبژاردنی حیزبێك بەپێی گونجانی ئایدۆلۆژی گشتی لەگەڵ ڕابوبۆچونەکانیاندا بەمەش خۆیان لەو پرۆسە گران تێچوونە لا دەدەن بەکۆکردنەوەی زانیارییە درێژەکانی تایبەت بەپێشنیازە ڕامیارییەکان و جێبەجێکردنەکانی لەهەر هەڵبژاردنێکدا.

**See also : Attitudes: dealignment: Electral volatility ; ideology: issues;**

**Party; political socialization; rational choice Analysis:realignment; values.**

## Party system سیستمی حیزبەکان (*نظام الاحزاب*)

بریتیە لەو پەیوەندییە ئالوگۆڕ کراوە ئالۆزەی نێوان حیزبە رامیارییەکان لەیەکێك لە دەوڵەتەکاندا یا لە رێکخستنێکی رامیاریی تردا (وەك حوکمی خۆجیی و پەرلەمانی ئەوروپی) هەوڵدانەکان لەوەدا چڕ بوونەتەوە کە سیستمێکی پۆلێنی دروست بکەن بۆ جیاکاریی لەنێوان جۆرەکانی سیستمی حیزبەکان بەشێوەیەکی تەقلیدی لەنێوان ژمارەی حیزبەکان لەسیستمی حیزبەکاندا (وەك کتێبی دۆفیرگر بەناوی حیزبە رامیارییەکان و: رێکخستن و چالاکیەکانیان لەدەوڵەتی نویدا کە خانەی پەخشی ماپوین لە لەندەن دەریکردووە لەساڵی 1954دا) . کەمتەرخەمی شیکاریی ئەم پێوەرە گشتییەش بووەتە هۆی هەوڵدان بۆ پەرەپێدانی سستمێکی ناونانی وردتر و ئالۆزتر بەدەسەلاتترینیان ئەو سیستمەیە کە ساتۆری داینـاوە لەو کتێبەدا کە لەچاپخانەی زانکۆی کامبریدج دەرچووە لەساڵی 1976 دا.

بەدەست پێکردنیش بە دابەشکردن لەنێوانی دەوڵەتەکانی یەك حیزبی و فرە حیزبیدا دوو خاڵی گرنگ دەخاتە ڕوو: یەکەم بریتیە لەگرنگی بوونی (ڕێساکانی ژمێریاریی) ڕوون بەمەبەستی جێگیر کردنی ژمارەی حیزبەکان بە بەکار هێنانی خاڵەکانی هێزی هەڵبژاردن و یاسایی حیزبەکان بۆ پەرەپێدانی چەمکی حیزبە (پەیوەندیدارەکان) سەبارەت بە پێك هێنانی حکومەتەکان (ئەم پەیوەندییە بتەوە – لەڕووی ئەزموونیەوە جیاواز دەبێ بەپێی کایەی رامیاریی) . خاڵی دووەمیش بریتیە لە (کردنەوە unpacking) دەستە سادەکانی یەك حیزب بۆ جیاکاریی لەنێوان ئەوەی کە کۆمەڵەی حەوت جۆرە لەسیستمی حیزبەکان سێ جۆرەکانی لەبنەڕەتەوە نارکابەرانەیە (یەك حیزبی بالادەست و زاڵ) چوار جۆری نا ڕکابەریش (سیستمی دوو حیزبی تەقلیدی و فرەیی سنوردار و فرەیی جەمسەریی و

سیـستمی پـەرت کـراو) . بەکۆکردنـەوەی نێـوان هۆکارەکـانی قـەبارەی ڕێـژەیی و ڕەهەنـدی ئایـدۆلۆژیی لەگـەڵ تایبەتمەندییـەکی بنـەڕەتی ژمـارەی حیزبەکانـدا، سیستمێکی هیمای هەستیار دێتە کایەوە کە بەسودە بۆ سیستمی حیزبەکان.

سـارتۆری پـێ لەسـەر دوو هۆکـاری گـرنگ تـر دادەگـرێ: یەکـەم ئەوەیـە کـە لەمانایەکی زۆر گرنگدا، لۆژیکی نیە کە قسە بکرێ لەسـەر (سیـستمی یـەك حیزبـی) چونکە زاراوەی (سستم) کارلێك لەنێوان دوو ڕەگەز یـا زیـاتر لـەخۆ دەگـرێ. بـەڵام باری یـەك حیزبـی بـارێکی سنوردارو زۆر بەسـودە لـەجیهانی سیـستمی حیزبەکاندا بەشـێوەیەك کـە زاراوەی (سیـستمی یـەك حیزبـی) دەکـرێ هـەر بـەکار بێـت و بمێنێتەوە. دووەمـیش ئەوەیـە کـە سیـستمی حیزبـەکان جـێگیر نیـە و ڕێڕەوەکـانی گۆڕان لەسیستمی یەکەم حیزبەوە بۆ سیستمێکی تر بابەتێکە بۆ شیکردنەوەیەك کە جیی بایەخە. وا دەردەکـەوێ کـە ڕووداوەکـان لـە ئـەورووپای ڕۆژهـەڵات و ئـەمریکای لاتینی لە دواییەکانی دەیەی هەشتاکاندا بەرەنگاری ئەو گریمانە دەبێتەوە بەوەی کە گـۆڕانی ناشۆڕشـگێڕی لـەجۆرەکانی حیزبـە نارکابەرەکانـەوە بـۆ سیـستمی حیزبـە ڕکابەرەکان دەکرێت ببێت بەشێوەیەکی بۆماوە.

See also:Cleavage: multi- party
System; party; two- party system.

## Patronage سەرپەرشتی (*الرعاية*)

بریتیە لە پیادەکردنی دەسەڵات بۆ دانانی کەسەکان لەفەرمانەکان یا پاڵاوتنیان بۆ وەرگرتنی خەڵاتەکانی ڕێز لێنان لەسەر بناغەی ڕای ئەو دەسەڵاتەی کە سەرپەرشتی مومارسە دەکات (وەك سەرەك وەزیران یا سەرۆك یا ئەندامی ئەنجوومەنی پیران) .

لەوانەیە هێزی سەرپەرشتییەکی لەم شێوەیە کۆتـدار بکرێـت بـەداب و نـەریت یـا داواکارییــە یاســاییەکان یاپێویــستی جــێگیر کردنــی پاڵاوتنــەکان لەدەزگایــەکی دەرەکییەوە وەك پاشا یا ئەنجومەنی پیرانی ئەمەریکی.

بەلآم بنەڕەتی سەرپەرشتی بریتیە لە هەڵبژاردن بەپێی نرخاندنێك كە لەتوانای دەسەلآتدایە بەپێچەوانەی پێویستی بەدانان بەپێی چالاكییەك یا پێوەرێكی تر كە بەشێوەیەكی دەرەكی دیاریكراوە . لەوانەیە سەرپەرشتی كار بكات تەنانەت ئەگەر مەرجێكی دیاركراویش هەبێ بەلانی كەم (وەك هەبوونی ئامادەییەكی پیشەیی) .

زاراوەكە بەتایبەتی بەو دانانە دەوترێت لەپلەو پایەی رامیاریی یا كارگێڕییەكاندا وەك پایەی وەزاری و ئەندامێتی ئەنجومەنەكانی كارگێڕیی گشتی یا پایەی سەفیر. هەر وەك چۆن لەسیستمی رامیاریی بەریتانیدا دانان لە پایە دادوەریی و فێركارییە دیاریكراوەكانیش لەخۆ دەگرێ وەك ڕاگری لەهەندێك كۆلیژەكانی هەر دوو زانكۆی ئۆكسفۆرد و كیمبریدج، هەندێك پایە ئایینیەكان لە كڵێسای ئینگلتەرا وەك سەرۆكی ئەسقوفەكان،و ئەسقوفەكان سەر باری بەخشینی نازناوەكان و پلەی وەجاخزادەو پلەكانی سوار چاكی لەسیستەمی رامیاریی ئەمەریكیدا سەرپەرشتی لەسەر ئاستی فیدراڵ و ولایەت و ئاستی ناوخۆدا سەرۆك و ئەندامەكانی ئەنجومەنی پیران و ئەندامەكانی ئەنجومەنی نوێنەران و حاكمەكانی ویلایەتەكان و ڕاگرەكان ... هتد بلآوەو دەسەلآتی سەرپەرشتیان هەیە.لەم دواییەدا زیادكردن لەرێژەی پایەكاندا (ئەوانەی سەرپەرشتی نین) لەخزمەتی مەدەنی فیدراڵیدا بوون پایەكان سەرپەرشتی لەحكومەتی فیدراڵیدا كەمكردوەتەوە زاراوەی (سەرپەرشتی) بۆ خۆی ئەو بەكارهێنانە لەخۆ ناگرێ كەلەسەر بناغەی بەرتیل و گەندەڵییە بۆ دەسەلآتەكانی دانان لەگەڵ ئەوەشدا كە لەهەندێك بواردا لەوانەیە بوونی پاڵنەرە نادروستەكان خۆیان مەلآس دابێت لەهەڵبژاردنی ئەم ووشەیەدا.

**See also: Clientelism; momenklatura.**

## **Peer Group** (*مجموعة الاقران*) **كۆمەڵی هاوشێوەكان**

كۆمەڵێكە كە هۆكارێكی هاوبەش لەنێوانیاندا هەیە وەك تەمەن یا پلەی خوێندن یا

باری کۆمەڵایەتی کە باوەڕ وایە پەیوەندیدارە بە بەهاکانی ئەندامانی کۆمەڵەکە و پەیوەندیی ئاڵوگۆڕکراوەکانیان .

لەوانەیە ئەندامێتی کۆمەڵەی هاوشێوەکان بۆ نموونە کاریگەر بێت لەدروستکردنی هەڵوێستە رامیارییەکان ودیاریکردنی ئاستی بەشداری رامیاریی تاك یا پەسەندکردنی شێوە جیاوازەکانی دەسەڵات .

See also: Primary group.

**Pesonation** (*انتحال الشخصية*) **وەرگرتنی کەسێتی**

بریتیە لە هەوڵدان بۆ وەرگرتنی کەسێتیەکی تر بەرێگاکانی خەڵەتاندن. لەرامیاریشدا وەرگرتنی کەسێتی بریتیە لەهەوڵدانێکی تەڵەکە بازانە بۆ دەنگدان لەباتی کەسێکی تر.

See also: Manifesto.

**Platform plurality** (*المنهاج السياسي*) **پەیڕەوی رامیاریی**

بریتیە لە زنجیرەیەك پێشنیازی رامیارییەکان بەناوی پاڵێوراوەێك یا حیزبێك یا کەرتێك بۆ هەڵمەتێکی هەڵبژاردنی داهاتوو پێشکەش دەکرێت. لەوانەیە ووشەکە بەمانای هەموو پێشنیازەکانی یەك حیزب بێت (وەك پەیڕەوی حیزبی پارێزگاران، یان بەشێك لەو پێشنیازانە (وەك پەیڕەوی تایبەت بە پارستنی ژینگەی حیزبی کۆماری) .یەك پێشنیازی ئەم پەیڕەوەش هەندێ جار پێی دەوترێت پلان (**Plank**) واتە یەکێك لە بنەماکانی پەیڕەو.

See also:Manifesto.

**Plebiscite** (*الأستفتاء الشعبي*) **ریفراندۆمی میللی**

دەنگدانێکە کە تیایدا دەنگدەرەکان حوکمی خۆیان دەبەخشنە گۆڕانکارییەکی پێشنیازکراو لەسستمی حوکمدا یا ئەو جۆرە گۆڕانە دەچەسپێنن ئەگەر بەڕاستی رووی دابێ. بەم شێوەیە لەو ریفراندۆمە جیاوازە کە بریتیە لەدەنگدان لەسەر مەسەلەیەکی رامیاریی.

نموونەی ریفراندۆمی میللییش وەك ئەو ریفراندۆمانەی کە باری قونسولی بەدرێژایی ژیان دەبەخشن ساڵی 1802 و پایەی ئیمپراتۆر لەساڵی 1804 دا بۆ ناپلیۆن و جیابوونەوەی نەرویج لەسوید لەساڵی 1905دا، ئەو ریفراندۆمانەی هەرێمی (سار) لەساڵی 1935 و 1955دا سەبارەت بەگێڕانەوەی هەرێمی سار بۆ ئەڵمانیا.

لەوانەیە ریفراندۆمەکە رواڵەتەکانی ریفراندۆمی میللی راستەقینە وەربگرێت ئەگەر حاکم یا گەل ببەستێتەوە بەمەسەلەکانی گۆڕینی سیستمی حوکمەکەوە : دیگۆل ریفرانــدرمی لەدەستوری فەرەنسیدا داناوە پێش دەنگدان و وازی لە پایەی سەرۆکایەتی هێناوە کاتێك کە پێشنیازەکان شکستیان هێنا.

ووشەکە لەو زاراوە لاتینییەوە داتاشراوە کەوەسفی دەنگدانی ناوەجاخزادەکانی کردووە لەهاولاتیانی رۆمای کۆندا (**Plebs**) .

**See also: Referendum.**

## فرەیی ـ پلۆرالیزم ـ (*التعددية*)

زاراوەکە هەندێك جار بەکار دێت بۆ وەسفی کۆمەڵگایە کە لەکۆمەڵی جیاواز پێکهاتووە (رەگەزی یا ئاییني... هتد) زاراوەکە مانای وردتری لەزانستی رامیارییدا وەرگرتووە. زاراوەکە زۆر جار بەکار دێت لەجۆری پێوانەی یا بڕیاردراودا. فرەییش کەسێکە باوەڕی وایە کە دەبێ دەسەڵات هاوبەش بێت لەنێوان کۆمەڵ و

بەرژەوەندییە جیاوازەکاندا لەکۆمەڵگادا وەدەبێت بڕیارە ڕامیارییەکانی نوێنەرایەتی ئەو سازشە بکەن کە بە شێوەیەکەی ئازادانە دەردەپەڕێ وە لەگەڵ گونجاندنەکان لەنێوان ئەم جۆرە کۆمەڵانەدا. بۆیە دەبێت دەوڵەت خۆیشی بڕیارێك بێت لەم جۆرە پرۆسانەداو هەروەها وەك حکومێك یا دابڕکەرێکی بێلایەن کار بکات نەوەك ڕکەبەری بێت بەرژەوەندییە دیاریکراوەکانی خۆی هەبێت.

بەڵام هەڵوێستێکی تاڕادەیەك لێکچوو هەیە بەبێ ئەو ڕێسا پێوانەییەی کە پێشتر ئاماژەی پێدراوە. هەندێك لەشیکەرەوەکان ئەویان ڕونکردەوەتەوە کە بەبێ ڕەچاو کردنی هیچ بەباشتر زانینێکی ڕەوشتی بۆ کۆمەڵگایەکی فرەیی ئەوا ئەم لایەنەیە لەکۆمەڵگا نوێکاندا کە ڕێسایەکی زیاتر بەسود پێشکەش دەکات بۆ شیکارکردنی ڕامیاریی. جۆراو جۆر بوونی بەهاو بەرژەوەندی و ڕاو بەباش زانینە کردارییەکان سەرباری شێوەی تێهەڵکێشکردنی کۆمەڵایەتیان و بەدوادا چوونیان لەلایەن کۆمەڵەکانەوەیە کە مادە بنەڕەتییەکان دەداتە شیکردنەوە. جارێکیتر دەوڵەت بەهۆکارێك دادەنرێت لەم پرۆسەیەدا لەگەڵ گرتنە بەری ڕا جیاوازەکان لەشیکردنەوەی فرەییە جیاوازەکاندا سەبارەت بە سروشتی ووردی بەشداری دەوڵەت. وە بەهۆی پێداگرتنەوە لەسەر سروشتی بەشکراوی بۆ کۆمەڵگاو ژیانی ڕامیارییەوە، فرەییەکان تاونبار کران کە پەیڕەوی ڕێبازێکی لایەنگرانە دەکەن بەرەو ئەو دەرەنجامەی کە دەسەلاتی ڕامیارییە شێوەیەکی فرەیی داتاشراوە.

## Plurality زۆرینە (الاكثرية)

بریتیە لەڕێژەی ئەو دەنگانەی کە پاڵێوراوێك بەدەستی دەهێنێت کە (أ) زیاترە لەو ڕێژەیەی کە هەر پاڵێوراوێکی ڕکەبەر بەدەست دەهێنێت و (ب) کەمترە لە زۆرینەی ئەو دەنگانەی کە دەدرێن واتە ڕێژەیەك کەمترە لە 50٪ + 1 دەنگ.

See also: Majority.

## Plutocracy حوكمی دەوڵەمەندەكان (*حكم الاغنياء*)

ووشەیەكە لە زمانی یۆنانییەوە داتاشراوە بەمانای دەستورێك دێت كە پشتی بەستووە بە تواناكانی خاوەنداری و تیایدا دەوڵەمەندەكان حوكم دەكەن و هەژارەكان هیچ پشكێكیان نییە تێیدا. ئەم جێبەجێكردنەیش دورتر لەداواكارییە دەستورییە روونەكان دەڕوات تا ئەو سستەمانەیش دەگرێتەوە كە خەرجی بەرز پێویستە لەراستیدا بۆ وەرگرتنی پایەیەك بۆ نموونە لەدیموكراسیەتە نوێیەكاندا وەك (ئەمەریكا) كە هەڵمەتێكی هەڵبژاردنی سەركەوتوو پێویستی بە بڕە پارەی تایبەت و گەورە هەیە. زاراوەكە زۆر بەكار نایەت لەشیكردنەوەی رامیارییی نوێدا لەگەڵ ئەوەشدا كە سامان زۆر جار وەك یەكێك لەو هۆكارنە دادەنرێت كە پاڵپشتی حوكمی دەستەبژێرو دەوڵەمەندەكان دەكات.

See also: Aristocracy; elite; oligarchy.

## polarizaion جەمسەرگیری (*الاستقطاب*)

بریتیە لە كۆبوونەوەی رەگەزەكان بەدەوری خاڵێك یا دوو خاڵ یاچەند خاڵێك لەیەك رژێمدا. لەرامیاریی نێو دەوڵەتیدا بۆ نموونە، لەوانەیە زاراوەكە ئاماژە بێت بە پێكهێنانی هاوپەیمانیەتیەكان بەدەوری دوو هێزی گەورەدا (جەمسەرگەریی فرەیی) لەزانستی دانی دەنگە هەڵبژاردنییەكاندا ــ بەشێوەیەكی نا وردەكاریانە بەكار دێت ـــ بۆ وەسفكردنی مەیل بۆ بەخشینی دەنگەكان بە دوو حیزبە سەرەكییە ركابەرەكان نەوەك بەو حیزبانەی كە دەكەونە نێوانیانەوە، رەنگە بۆ وەسفكردنی مەیلی گشتیش بەكار بێت بەرەو پشتگیریكردنی حیزبە توندڕەوەكان نەوەك

میانڕەوەکان.

See also : Bipolarity

## Policy (السياسة) ڕامیاریی

بریتیە لەکۆمەڵێك بڕیار کە ڕەگەزێکی ڕامیاری یا کۆمەڵێکی ڕامیاریی وەریدەگرێت سەبارەت بە هەڵبژاردنی ئەو ئامانجانەی کە دەربارەی بارێکی دیاریکراوو ڕێگاکانی بەدەست هێنانین. دەبێت ئەم بڕیارانەش لەڕێگەی پرەنسیپەوە لەکایەی توانای دانەری ڕامیارییەکان بێت بۆ جێبەجێکردن .

لەوانەیە ڕامیارییەکە سادە بێت ـــ بۆ نموونە لەیەك بڕیار پێك بێت ـــ یا کۆمەڵێکی ئاڵۆز لەنەخشەکانی بڕیاری نائاسایی یا بڕیارێك بێت بەدواخستنی بڕیارێك (ڕامیاریی چاوەڕێکردن و تێبینی کردن) یا کەمێك واقیعی دەبێت (وەك بڕیاری کەمکردنەوەی باجە ڕاستەوخۆکان و زیاد کردنی باجە ناڕاستەوخۆکان) یا کەمێك دابڕاو (وەك ڕامیاریی دەستێوەرنەدان لەکاروباری دەوڵەتەکانی تردا) .

چوار ڕەگەز لەم پێناسەیەی ڕامیاریدا بایەخێکی تایبەتی دەخوازن.

(هەڵبژاردنی ئامانجەکان) ئەوە لەخۆ دەگرێ کە دانەری ڕامیارییەکان سیستمێکی ڕوونی بەهاکانی هەیە و زنجیرە بەندییەکە بۆ بەهاکان. لەوانەیە ئەم جۆرە ئامانجانە پۆزەتیڤ بن. (وەك گەشەی ئابوری) بان نێگەتیڤ (وەك ئازادی لەدوژمنکاریی) . یا لەوانەیە ئاستی دیاریکردنی جیاوازی هەبێ (وەك ڕامیاریی خۆماڵیکردن بەگشتی و ڕامیاریی خۆماڵی کردنی دامەزراوە گشتیەکان و ڕامیاریی خۆماڵی کردنی پیشەسازیی و ووزەی کارەبا) . دەبێت کە (ڕێگەکانی) بەدیهێنانی ئامانجەکان،لانی کەم بەشێوەیەکی بەشی، کارگێڕییەکی ئامانجدار لەخۆ بگرێ بۆ ڕەفتاری مرۆڤانە و بەم شێوەیەش ڕامیاریی لەو تەکنیکە جیا دەکرێتەوە کەدەست بەسەراگرتنی شتە نازیندوەکان و مامەڵەکردنیان لەخۆ دەگرێ. (دۆخی دیاریکراو)

واتـه كارلێـك كـردن لـەنێوان پرۆسـەی دانـانی ڕامیاریـیەكان و ژینگـە كۆمەڵایـەتی و سروشـتییەكاندا و ئەمـەیش ئـەو كارلێكردنەیـە كـە كـۆت و بەنـد دەسـەپێنێ بەسـەر بەدیهێنانی ئامانجەكاندا. ڕەنگە ڕەگـەزی (دەسـەت بەسـەراگرتن) لەلایـەنی دانـەری ڕامیارییەكانەوە لەڕێگەی دەسەڵات یا قایل كردن یا زۆرەوە بێت، بەڵام ئەگەر نـەبوو، لانی كەم لەڕووی پرەنسیپەوە، ئـەوا گونجـاو نیـە زاراوەی (ڕامیـاریی) بـەكار بێـت چونكە هەڵبژاردنی ئامانجەكان تەنها بەیانكردنێكە بۆ باش زانین یا نیازێك.

See also : Decision; incrementalism;
Non-decision; policy analysis.

## شیكردنەوەی ڕامیارییەكان (*تحليل السياسات*) Policy Analysis

بریتیە لە لێكۆڵینەوەو جێبـەجێكردن و هەڵسەنگاندنی ڕامیاریـیە گشتییەكان و بەهاكانی دانەرانی ڕامیارییەكان و ژینگـەی سیـستمی ڕامیاریـیەكان و تێـچوونەكانی جێگرەوەكـانی ڕامیاریـیـەكان (بــە بــەكارهێنانی پێوانــەیی بەرنامــە ڕێــژی و هاوسەنگكردننو ئابوری پێوانەیی و و تیۆری یارییەكان) و لێكۆڵینەوەی ڕامیارییەكان لەپێناوی چالاكردنی ڕەوشە ڕامیارییەكاندا.

شـیكردنەوەی ڕامیاریـیـەكان لـەزۆر لەپـەیرەوەكانی زانـستە ڕامیاریـیـەكان و ڕێگـەكانیان وەردەگێـرێ وەك دەروازەی تیـۆری سیـستم و پـەیرەوەكانی وەرگرتنـی بڕیارەكان و لایەنەكانی لێكۆڵینەوەی ڕەفتاریی ڕامیاریی بەڵام لەوانەشە كـە چـەمك و پەیرەوەكان لە لقەكانی تریش وەربگـرێ وەك زانـستی ئـابوری و تیـۆری كـارگێری و زانستی دەروونی.

لەبەكارهێنانی دووەمیشدا ڕەنگە شیكردنەوەی ڕامیارییەكان زاراوەیەك بەكار بێنێ بۆ وەسف پشكنینی درێژی ڕامیارییەكی دیاریكراو یاسیستمی دانانی ڕامیارییەكان.

See aso: policy.
Policy community See also : policy network.

## Policy Network **تۆڕی ڕامیارییەکان** (*شبكة السياسات*)

بریتیە لەکۆمەڵێك هۆکاری ڕامیاریی، حکومی یان ناحکومی، کە بەشداری دەکا لە بایەخدان بەمەسەلەیەکی ڕامیاریی‌و دەسەلآتێك پیادە دەکات لەبڕیارەکاندا سەبارەت بەئەنجامەکانی پەیوەست بەو ڕامیارییە، ئەمەیش هەندێك جار لەڕێگەی خستنە ڕووی ڕامیارییە نوێکانەوە دەبێت. نوێنەرایەتیکردنی ئەم جۆرە تۆڕە بۆ ئەوەی داخراو بێت لەڕووی قەڵەمڕەوی جەماوەر یا ئەنجومەنی یاسادانان، یا تۆڕەکانی ڕامیارییەکانی تردا. لەوانەیە تۆری ڕامیارییە نموونەییەکان کارمەندی چەندین وەزارەت لەخۆ بگرێ لەگەڵ نوێنەرانی کۆمەڵەکانی بەرژەوەندیی کارلێکراو لەهەندێ وولآتیشدا وەك ئەمەریکا و ئەڵمانیاو ئەندامانی لیژنەکانی یاسادانانی تایبەت بە بواری ڕامیارییە پەیوەندیدی دارەکان. لە بارەکانی بەردەوام بوونی ئەم جۆرە تۆڕانە بەتێپەڕ بوونی کات و پەرەپێدانی بەپێی هۆشیارییان بە بەرژەوەندییەکانیان لەبواری ڕامیارییدا ئەوا بەکۆمەڵگاکانی ڕامیارییەکان وەسف دەکرێت.

See also: Interest group;
Policy.

## Political Analysis **شیکردنەوەی ڕامیاریی** (*التحليل السياسي*)

زاراوەیەکە لەوانەیە لەمانای هەرە گشتیدا بەکار بێ بۆ وەسفی هەر توێژینەوەیەکی ورد لەمەسەلە ڕامیارییەکاندا...هتد بەمانایەکی وورد تریش بریتیە لەو بەشەی توێژینەوەی ڕامیاریی کە دیاردەکان و گرفتە ڕامیارییەکان شی دەکاتەوە

. .هتد بۆ ڕەگەزە پێ هێنەرەکانی کە بەشێوەیەکی دابڕاو دەربڕاوە بۆ مەبەستەکانی پێناسە کردن و پۆلێن کردن و لێکدانەوە شێوە جیاوازەکانی شیکردنەوە بریتیە لەمانە: شی کردنەوەی لایەنێك لە پرۆسەی ڕامیاریی (وەك شیکردنەوەی ڕامیارییەکان و شیکردنەوەی هەڵبژاردنی) و شیکرنەوەی لایەنێکی پرۆسەی توێژینەوە (وەك شیکردنەوەی چەمکی و پەیرەوگەرایی) یا شیکردنەوە بە بەکار هێنانی پەیڕەوێك یا ڕێگەیەك یا شێوازێکی دیاریکراو (وەك شیکردنەوەی بەراورد کاری و شیکردنەوەی هەڵبژاردنی ئەقلانی) .

**See also: concept; methodlogy ;
policy ;political science; rational choice analysis ;
systems analysis.**

## Political Anthropology زانستی مرۆڤی ڕامیاریی (*علم الانسان السیاسی*)

(ئەنترۆپۆلۆژیا) چەند لایەنێك لە لق و بواری زۆری توێژینەوەی تر لەخۆ دەگرێ لە بایۆلۆژیا و پەرەسەندنی مرۆڤایەتیەوە (کە زۆربەی کات شێوازەکانی شوێنەوار ناسی لەخۆ دەگرێت) لەڕێگەی زانستە ڕۆشنبیریی و کۆمەلایەتی و مێژوویی و لێکۆڵینەوە فەلسەفیەکانی سروشتی مرۆڤایەتیەوە. لەوانەیە کە ئەنترۆپۆلۆژیای کۆمەلایەتی لەناو ئەم کایەیەدا دەرکەوێ بەوەی کە لەگەڵ سۆسۆلۆژیادا تێکەڵ دەبێ، بەلام ئەنترۆپۆلۆژیای کۆمەلایەتی (**Political Communication**) زۆر لەبایەخی خۆی ئاراستە کردووە بەرەو کۆمەڵە خێڵەکییە سەرەتاییە دابڕاوەکان (بەرێژەیی) و بەرەو ئەو کۆمەلانەی کە داب و نەریت و ئەفسانە و تایبەتمەندییە نائەقلانییەکانی تری تێدا باوە، وەك دەردەکەوێ ئەنترۆپۆلۆژیای ڕامیاریی بریتیە لە لێکۆڵینەوەی پەیوەندییە ڕامیارییەکان لەم جۆرە کۆمەلانەدا و هەردەم هەوڵ ئەدات کە گرنگی ڕامیاریی بۆ ڕوشنبیریی و هێماکان و ڕافەی شێوازەکانی بەجێگەیاندنی فەرمانە

ڕامیارییە هاوبەشەکان لەنێوان هەموو کۆمەڵەکاندا دەربخات لەکاتی ناتامادەیی پەیکەرە ڕامیارییە نیزامیەکاندا.

See also : Custom ; functional explanation ; hermeneutics ; political culture ;politics; structural-functional analysis.

## Political Asylum پەنابەری ڕامیاریی (*اللجوء السياسي*)

بریتیە لەدانی مافی پەنابەری و پاراستن بۆ دانیشتوانی وولاتی بێگانە کاتێک کە بیروباوەڕو کارە ڕامیارییەکانیان تووشی سزا یا شوێن کەوتنیان دەکات و کاتێکیش کەحکومەتەکان بڕیاری بەخشینی مافی پەنابەریی دەدەن، ئەوا هەوڵ ئەدەن کە جیاوازیی بکەن لەنێوان ئەو جیابووانەو ئەوانەی کە (پەنابەری ئابووریین) و لەبەر نەبوونی مادیی ڕایان کردووە. شوێنی پەنابەریش بریتیە لەهەمان وولاتی خانە خوێ بەڵام لەوانەیە مافی پەنا بەریی لەناوچەی تریش بدرێ کە تیایدا دەوڵەتی خانە خوێ دەسەڵاتی ڕامیاریی خۆی پیادە بکات وەك باڵیۆزخانە یا کەشتی.

## Political Behaviour ڕەفتاریی ڕامیاریی (*السلوك السياسي*)

بوارێکی لێکۆڵینەوەیە لەناو زانستی ڕامیاریدا کەبایەخ دەدات بەو لایەنانەی ڕەفتاریی مرۆڤایەتی دەدات کە لەچوار چێوەیەکی ڕامیاریدا ڕوو دەداو چەقی بایەخدانیش کەسێکە- وەك دەنگدەرێك و سەرکردەیەك و شۆڕشگێڕێك و ئەندامی حیزبێك...هتد وەك کۆمەڵەکە یا سیستمی ڕامیاریی یا دەزگا یا پەیکەر، فەلسەفەو زانستە کۆمەڵایەتیەکان زاراوەی (ڕەفتار) بەکار دێنن تا بەشێوەیەکی وورد ئەو لایەنە چالاکەی وەسف بکات کەدەکرێت تێبینی بکرێ ئەمەش مەیلی تاکە

مەبەستەکان و بارە ناوەکییەکانیان ناگرێتەوە. ڕەفتار، لەم مانایەدا دابڕاوە لەبیروباوەڕەکانی تاك و نیازەکانی. بەڵام لێکۆڵینەوەکانی ڕەفتاری ڕامیاریی بەشێوەیەکی مەڵبەندی بریتیە لەپێگەیاندنی کۆمەڵایەتی ڕامیاریی و ڕۆشنبیریی و بیروباوەڕەکان و هەڵوێست و ڕاکان لەگەڵ پەیوەندییەکانی نێوان تاکەکان و کۆمەڵەکان و کۆتەکانی سیستم لەسەر دەرفەتەکانی تاك لەکارداو ڕێگەکانی پەیوەندی ڕامیاریی کە تاکەکان بەکاری دێنن . بۆیە ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە تەنها بایەخ بەڕەفتار نادات لەمانای بەر تەسکیدا بەڵکو بەشێوەیەکی گشتی تر بەچالاکی تاکیو پەیوەندیی بەهۆکارەکانی تریشەوە.

بەم شێوەیە (لێکۆڵینەوەی ڕەفتاریی ڕامیاریی) لەوانەیە لەڕەفتارگەرایی جیا بکرێتەوە. ڕەفتاریی ڕامیاریی بایەخی یەکەمی بەگەڕان لەڕەفتاریی تاکی ڕامیار ئەدات لەگەڵ ڕێگە دان بەکۆمەڵێکی بەرفراوان لەچەمك و شێوازەکان بەکارتێکردن لەم جۆرە مەسەلانەدا. لەناو زاراوەی دووەمیشدا دەتوانرێ مەودایەکی زۆر فراوانتر لەبابەتەکان زۆر بابەتی وەربگیرێ بەلام ڕێگەکانی شیکردنەوەو بەڵگەکان بەشێوەیەکی تەسکتر دیاری دەکرێن.

بێگومان ئەم جیاکردنەوەیش لێکۆڵینەوەی ڕەفتاری ڕامیاریی لەڕێی ڕەفتارگەراییەوە بەلاوە نانێ.

See also : Behaviouraliism ;
group theory ;political culture ;
political psycholorg ; political socialization ;political
system.

**Political Communication** **پەیوەندی ڕامیاریی (*الاتصال السياسي*)**

بریتیە لەو زانیارییە رامیاریانەی کە پەخش دەکرێن و وەردەگیرێن یا پرۆسەی پەخشی ئەم زانیاریانەو وەرگرتنیان لەلایەن رەگەزە جیاوازەکانی سیستمێکی رامیارییەوە لەوانەیە زانیارییە رامیارییەکان بە ئاماژە بەناوەرۆك و کاریگەریی ویستراویان یا وەبەر هێنانی لەلایەن وەگرەوە ئامادە بکرێ.

چەمکەکەش تەنها سنووردار نیە بەهەوڵدان بۆ قایل کردنی رامیاریی و رۆشنبیرکردن و بانگەشەوە، رەنگە زانیارییەکان لەو جۆرە بن کە لەرێی هەر ئامرازێکەوە پەخش دەکرێن: وەك راپۆرتە ئامارییەکان و روونکردنەوەکانی ریفراندۆمەکانی راو راپۆرتەکانی بریارەکان و داپۆشینی هەواڵی و فێرکردن... هتد.

دەکرێت لەچەندین رێگەی جیاوازەوە لەپەیوەندیکردنی رامیاریی بکۆڵرێتەوە و ناوەرۆکەکەی شیبکرێتەوە، لەوانەیە زاڵی شێوە جیاوازەکانی پەیوەندیکردن لەسیستمی رامیارییەکاندا ینکەی شیکردنەوەی بەراوورد کاری پێك بهێنن. هەروەها دەکرێت کە لەپەیوەندی نێوان سیستمەکانی پەیوەندیکردنی لقی و سیستمە رامیارییەکان بەگشتی بکۆڵرێتەوە. هەندێك نموونەی شیکردنەوەی سیستمەکانیش لەکورتکردنەوەی بیرۆکەی سیستمی رامیاریی نزیك دەبنەوە بۆ نموونەیەکی پەیوەندیکردن.

زۆر لێکۆڵینەوەش سەرنجیان بۆ رێگەی کەمکردنەوەی شێوازی داپۆشینی راگەیاندنی نوێ راکێشاوە، بەتایبەتی داپۆشینی ئێزگەیی و تەلەفزیۆنی بۆ رامیاری هەڵبژاردنی، نامە رامیارییەکە بۆ چەند پارچەیەکی کەم لە قسەو وێنە وەلەم زانیاریە کەمانەیشەوە سروشتی گشتیی رامیار و رامیاریی دادەتاشرێت.

See also : Content analysis ;
feed back ; mass madia ;
politcal socialization ;porpaganda ;rhetoric ;
systems analysis.

**Political Culture** **رۆشنبیریی رامیاریی (*الثقافة السياسية*)**

بریتیە لەنموونەی گشتگیری ئەو ئاراستەو بەهاو هەڵوێست و بیروباوەڕانەی کە تاکەکانی کۆمەڵگەیەکی رامیاریی پەیڕەوی دەکەن.مەزندە لەبیرۆکەی (ڕۆشنبیریەکی رامیاریی) ئەوەیە کە جۆرە ڕۆشنبیریەکان سیستمی رامیاریی دروست دەکەن و کۆت و بەندی دەکەن چەند جۆرێکی دیاریکراو لە را بەشێوەیەکی بەهێز بەجۆرە هاوجووتەکانی رامیارییەوە پەیوەند دەبن لەگەڵ ناوەڕۆکەکانی بۆجێگیر بوونی ئایندەیی و رێکەوتن لە راو پەرەسەندندا.

لایەنەکانی ڕۆشنبیریی رامیاریی کە گرنگییەکی ئایندەیی هەیە ئەمانەن: هۆکارەکانی پێگەیاندنە کۆمەڵایەتییە رامیارییەکان و شێوازەکانی،و هەڵوێستەکان لەبەرامبەر سەرکردایەتی و دەسەڵات و چاوگی ناسنامەی تاك و کۆمەڵەکان.

لەکاتێکدا رەنگە کە لەهەموو سیستمە رامیارییەکاندا هەندێك پێوەری بنەڕەتی هاوبەشی هەبێو بەشێوەیەکی فراوان ئەگەر گشتگیر نەبێ ئەوا رادەی هاوشێوە بوونی ڕۆشنبیریی رامیاریی جیاواز دەبێت جیاوازییەکی گەورە لەنێوان سستمەکانداو بەتێپەڕبوونی کات... ڕۆشنبیری رامیاریی بەگشتی ڕۆشنبیریی لقیی لەخۆدەگرێ کەجیادەکرێنەوە و دراونەتە پاڵ ئایین و هەرێم و رەگەزو باری کۆمەڵایەتی... هتد ئەم ڕۆشنبیرییە لقییانە لەهەڵوێست و بەها رامیارییەکان پێك دێ جیایە لەهەڵوێست و بەها رامیارییەکانی ڕۆشنبیریی رامیاریی گشتی. ڕۆشنبیریە لقییە بەهێزو زۆر ڕووتەکان لەوانەیە جووت بوونی رامیاریی کۆمەڵگا لاواز بکا یاهەڕەشەی تێکدانی بکات. نموونەی ڕۆشنبیرییە لقییە نەتەوەییەکانیش لەنێرلەندەی باکورو یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو و ڕۆشنبیرییە لقییە زمانییەکان لەبەلجیکا.

زۆر لەتوێژینەوەکانی پێشوو لەبارەی ڕۆشنبیریی رامیارییەوە لەدەیەی هەفتاکاندا جێی گومانە. وا باو بووە کە لەدەیەی پەنجاو شەستەکاندا ڕۆشنبیریی رامیاریی ئینگلیزی وا ببینینەوە کەوای دادەنێ ئەو تەنها ڕۆشنبیریی گرنگە لەشانشینی یەکگرتوودا و سروشتی هاوشێوەی ئەم ڕۆشنبیرییە بەکار هێنراوەبۆ لێکدانەوەی جێگیریی سیستمی رامیاریی لەشانشینی یەکگرتووداو نەرمی و سەرکەوتنی رێژەیی و

مامەڵەکردنی کلتورە رامیاریەکان بۆ کۆمەڵە نائینگلیزییەکان بەو پێیەی کە بریتین لە جیاوازیی چێوەیی (دور لەچەق) و کاریان نەکردووەتە سەر ئەنجامی نوێ هەندێك ئەم جۆرە چارەسەرکردنەیان بەهەڵە داناوە لەڕووی مێژووییەوە لەمەیلیدا بۆ ڕەتکردنەوەی بەشداریکردن لەپەرەسەندنی رامیاریی بەریتانیدا چونکە بریتیە لە پێویستی بۆگونجاندن لەنێوان ڕۆشنبیرییە جیاوازەکاندا و پاش هەڵچونی تەوژمی نەتەوەگەرایش لەسکۆتلەندە ویڵزو ئێرلەندای باکوور ئەم جۆرە چارەسەرانە وا دەردەکەوتن کەوێنەیەك پێشکەش دەکەن بە ئێستا کە خراپی و قایلکردنی پێوە دیارە.

بەکارهێنانی چەمکی ڕۆشنبیری رامیاریی بەشێوەیەکی بەرفراوان،هێرش دەکرێتە سەری وەك لێکدانەوەیەکی ساختە کە ناوەڕۆکی ڕۆشنبیریی لەرەفتاری رامیارییەوە هەڵدەهێنجێنێ و واش دادەنێ کە ئەو ڕەفتارە بەگەڕانەوە بۆ رۆشنبیریی ناوەکی لێك دەداتەوە. لەکاتێکدا لەوانەیە ئەم ڕەخنەیە ڕاست بێت بۆ هەندێك توێژینەوە لەم بوارەدا بەڵام لێکۆڵینەوەی تاوانبارنەکراویش بەم بازنە ڕوونە هەیە کە گریمانەی وای بەرهەم هێناوە لەکاتی ئەنجامدانی شیکردنەوەی بەراووردکاریدا شایەنی توێژینەوەو مشتومڕی زیاترن.

یەکێك لەگرنگترین لێکۆڵینەوەکانی ڕۆشنبیریی رامیاریی کتێبی ڕۆشنبیری مەدەنییە (The Civie Culture) لەدانانی ج . ئەلمۆند و س. فێربا کەچاپخانەی زانکۆی برنستن ساڵی 1963 دەریکردووە، کە دەربارەی پێنج سیستمی رامیاریی دیموکراتییە.ئەم لێکۆڵینەوەیەش هەردەم جێی بایەخی ڕخنەیی دەبێت لەگەڵ ئەو کتێبەی کە بەناوی (گەڕانەوە بۆ ڕۆشنبیریی مەدەنییە) (( The Civic Culture Revisited کە هەر ئەوان نووسیویانەو لەخانەی لیتڵ براون لە بوستن ساڵی 1980 دەرچووە.

**See also :Attitudes ;norm ;
political integration ;
political socialization ;post- materialism ;values.**

## پەرەپێدانی ڕامیاریی (التطویر السیاسی) Political Development

بریتییە لەپرۆسەکانی گۆڕانی ڕامیاریی خێرا کە لەکۆمەڵگا تەقلیدییەکاندا ڕوو دەدات، بەهاوبەشی لەگەڵ پرۆسەکانی تری نوێکردنەوەدا کەدەبێتە هۆی سیستمێکی ڕامیاریی ئالۆزترو جۆراو جۆرتر و کۆمەڵگایەکی ڕامیاریی جووتکراوی دیاریکراوتر. ئەم زاراوەکە بەتایبەتی بەو دەوڵەتانەی جیهانی سێ دەوترێ کە کۆلۆنیی پاشکۆی دەوڵەتە ئەورووپییەکان بوون بۆیە زۆر جار پەیوەندی بەپرۆسەکانی لەناوبردنی کۆلۆنیالیزم و بەدەست هێنانی سەربەخۆیی ڕامیارییەوە هەیە.

گرفتێکی چەمکی گەورە دروست دەبێ بەهۆی بەکار هێنانی زاراوەی (پەرەپێدانەوە Development) چونکە هەڵەیە وا دابنرێت کە هەموو دەوڵەتەکان هەمان ئەو ڕێڕەوەی پەرەسەندنی ڕامیاریی دەگرنەبەر کە دەوڵەتەکانی ئەورووپای ڕۆژئاوا یا دەوڵەتە کۆمۆنیستیە ئەورووپییەکان گرتوویانەتە بەر.لەلایەکی ترەوە زانایانی ڕامیاریی پێیان وابوو کە دەکرێ هەندێك ئاراستەی یەکخراو دیاری بکرێ کەوا دیارە پەیوەندە بەپرۆسەکانی پەرەسەندنی ڕامیارییەوە لەزۆربەی بارەکاندا ئەگەر نەڵێین هەموویان وەك زیاد بوونی ئالۆزی کۆمەڵایەتیو ڕامیاریی و تایبەتمەندبوونی ڕۆڵەکان و دەزگا کۆمەڵایەتییەکان و فراوان بوونی دەستە بژێری ڕامیاریی ڕۆشنبیر،و پێگەیاندنی دانیشتووان لەڕووی ڕامیارییەوە (لەڕێ حیزبە جەماوەرەیەکانەوە بۆ نموونە) و زیاد بوونی سەرهەڵدانی مەلەسە نیشتیمانیەکان وەك مەسەلە ڕامیارییە بەر تەسکەکان و پەیوەندییە ئالۆگۆڕ کراوە ڕوو لە زیاد بوونەکان لەنێوان بوارە ڕامیاریی و کۆمەڵایەتی و ئابورییەکاندا.

See also : Modernization ;Third Woeld

## Political Economy ئابوریی رامیاریی (الاقتصاد السیاسي)

لەبنچەدا بریتیە لە زانستی سامانی نەتەوەکان یا زانستی ئابووریی رامیاریی. زاراوەکە بەتایبەتی پەیوەندە بەو دانراوانەی کە لەسەدەی هەژدەو نۆزدەدا دەرچوون و تایبەتن بەئابوری نیشتیمانی وژیانی خەلك و دەرامەتەکانی حکومەت.

نوێترین بەکار هێنانیش لەشیکردنەوەی رامیاریدا بەلێکۆڵینەوەی رامیاریی ئابوریی دەوترێ و پەیوەندیی لەنێوان هۆکارە رامیاریی و ئابورییەکان لەرامیاریی گشتیداو لەئابوریشدا بەو بایەخە رەخنەییە دەوترێ کە لەچوار چێوە کۆمەلآیەتی و رامیارییە جیاوازەکاندا سیستەمە ئابورییەکان لەناویدا کار دەکەن.

See also : Economic theories of politics.

## Political Geography جوگرافیای رامیاریی (الجغرافیة السیاسیة)

بریتیە لەلێکۆڵینەوەی پەیوەندی لەنێوان ناوچە یا بوار یا دەزگا یا پرۆسە رامیارییەکان و ژینگە سروشتیەکانیان، و دەکرێت کەشوێن بنەچەکانی بکەوێت هەتا رامانی نوێ سەبارەت بەکەش هەوا لە رۆشنبیریی و داب و نەریتەکاندا.

هەروەها بوارەکانی بایەخی نوێترین و کاریگەرییە جوگرافیەکان لەدروست بوونی دەوڵەتەکان و گەشەی رامیارییەکان، و سروشتی سنورەکان و پەیوەندیەکانی نێوان چەق و چێوە لەدەوڵەتەکانداو لە سیستەمە نێو دەوڵەتیەکاندا و پەیکەری تۆرەکانی پەیوەندی و دابەشکردنی دەرامەتە سروشتییەکان دەگرێتەوە.

See also :Apporitonment ; geopoiltics.

## Political History مێژوویی رامیاریی (التاریخ السیاسي)

زاراوەیەکە بریتیە لەو لێکۆڵینەوە مێژوویییە کەپێ دادەگرێ لەسەر بەردەوامی و گۆڕان لەحکومەتە و حاکمەکان و دەستوور و شێوەکانی دەوڵەتدا ...هتد ئەم جۆرە توێژینەوانەش زۆربەی نوسینە مێژوویییەکان لەخۆ دەگرێ کە پێش سەر هەڵدانی مێژووی ئابوریی و کۆمەلآیەتین. نوێترین نموونەش لەم بوارەدا وەك ژیاننامەی رامیارییەکان و وەسفکردنی ماوەکانی حوکم یا پەرەسەندنی حیزبە رامیارییەکان ...هتد برێکی گەورە لەو توێژینەوانەی کە بەزانستی رامیاریی دادەنرێن، بێگومان مادە مێژوویییەکان بەکار دێنن، ئەمەش پرسیار دەوروژێنێ سەبارەت بەڕوونی جۆری (مێژوویی رامیاریی) و پەیوەندیی زۆر گشتی نێوان مێژوو زانستە کۆمەلآیەتیەکان.

دەتوانرێت کەڕای تەقلیدی لەجیاوازیی نێوان لێکۆڵینەوەی مێژوو و زانستە کۆمەلآیەتیەکان بەم شێوەیە دەردەبرێت: لەکاتێکدا کەلەوانەیە مێژوونوس یان زانای کۆمەڵناسی بایەخ بەڕووداوی شۆڕشی فەرەنسی بدەن ئەوا بایەخی سەرەکیی مێژوونوس بەو ڕووداوە ڕبووردوانە خۆیانە واتە یەکانگیرییان ڕاستیەك دەخاتە ڕوو کە ئەمانە وەك ڕووداوی ئالۆزو پەیوەند بەیەکەوە ڕوویان داوە، زانای کۆمەڵناسیش بایەخ بەو ڕووداوانە دەدات وەك ڕودانێکی گشتیی دیاردەیەك یا شۆڕشێك واتە دیاردەیەك کە دەکرێ لێکۆڵینەوەیەکی تیۆریی بۆ بکرێ.

دیاریکردنی سنور لەم بوارەدا زەحمەتتر دەبێ و زۆربەی توێژەرەوەکان لەکردنی دوو دڵ دەبن. زۆر توێژینەوەی نوێ پێکەوە گرێدانێکیان تیایە لەنێوان بایەخە تیۆرییە ئاشکراکانی زانستە کۆمەلآیەتیەکان لەگەڵ چڕکردنەوەو شێوازی مێژوویی‌دا. نموونە نوێیەکان وەك کتێبی بارنگتن بەناوی (بنەچە کۆمەلآیەتیەکانی دیکتاتۆریەت و دیموکراسیەت) کە لەچاپخانەی بیکن لەبۆستن سالی 1966 دەرچووە وکتێبی فیدا سکوسبول بەناونیشانی (دەوڵەت و شۆڕشە کۆمەلآیەتیەکان) کەلە چاپخانەی زانکۆی کیمبرج سالی 1979 دەرچووەو،و کتێبی دۆگلاس ا.ئاشفۆرد بەناوی (سەرهەڵدانی دەوڵەتەکانی سەرپەرشتی) لەخانەی بازل بلاکویل سالی 1987

زۆربەی ئەم توێژینەوە (ڕامیاریی) یە چونکە چڕ دەبێتەوە لەشێوەکانی دەوڵەتدا بەڵام زاراوەکانی وەك (زانستە کۆمەڵایەتییە مێژووییەکان Historical political science) بەگشتی بەکار نایەن . ئەو توێژینەوانەش کە هەوڵ دەدەن کە تیۆرێکی گشتی دابڕێژن لەڕووی هێزە ئابووریی‌و کۆمەڵایەتییەکانەوە،بەرەو ئەوە دەچن کە بەناوی (سۆسیۆلۆژی مێژوویی) بناسرێن یا (ماکرۆسۆسیۆلۆژیا — سۆسیۆلۆژیای گشتی) (وەك کتێبی مۆرسکۆکبۆل) کاتێك مێژوویەك بەوە وەسف دەکرێ کە (مێژوویەکی ڕامیارییە) وەك کتێبی ئاشفۆرد، ئەوا ئەنجامی ئاسراو ئەوەیە کە بایەخێکی درێژتر دەداتە ڕووداوەکان لەسەر ئاستی دەزگا ڕامیارییەکان و پرۆسە ڕامیارییەکان، ئەم جۆرە جیاوازییانە ڕەنگە کەمێك هەڕەمەکی بن و هەردەم قایلی مشتومڕ بن.

See also : Comparative analysis ; ex-Palantion scieence ; political Thought ; theory.

## Political Integration — تێهەڵکێش ـ جووتکردنی ڕامیاریی *(الدمج السياسي)*

بریتیە لەو بارە یەکانگیرییەی کە لەکۆمەڵگای ڕامیاریدا هەیە (وەك دەوڵەت یا هەرێم یایەکێتیی فیدراڵی) هەر وەك چۆن ئەمە ڕادەیەکی بەرزی کارلێکی ڕامیاریی ئاڵوگۆڕکراو پیشان ئەدەن لەنێوان ئەندامانی ئەو کۆمەڵگایەدا، تاکەکانی و کۆمەڵەکانی، کە بریتیە لە کارلێکێك لەسەر بناغەی پەسەندکردن نەوەك زۆر لێکردن. لەکاتێکدا جووتکردنی ڕامیاریی دەکرێت جیا بکرێتەوە لە لایەنەکانی جووتکردنی کۆمەڵایەتی (وەك جووتکردنی ئابووریی یا ڕۆشنبیریی) بەهۆی ئەم پێداگرتنەوە لەسەر کارلێکی ڕامیاریی بەو پێیەی دەربڕینێکە بۆی ئەوا بەشێوەیەکی ڕوون

پەیوەندە بە شێوەکانی تر لەم بابەتە.

رادەی جووتکردنی رامیاری بەندە بە چەندین هۆکارەوە لەوانە دەست بەسەراگرتنی رۆشنبیریی رامیاریی کۆمەڵگای رامیاریی گشتی بەسەر هەر رۆشنبیرییەکی لقی دیار تیایدا،و توانای دەزگاو پرۆسە رامیارییەکان لەبەجێگەیاندنی چاوەڕوانکراوەکان و ئاسانی پەیوەندیکردنی رامیاریی لەنێوان ئەندامانی کۆمەڵگای رامیارییە و دووو بارە بوونەوەی...هتد جووتکردنی نەگونجاویش کاتێك روو دەدات کە بواری بەها رامیارییە هاوبەشەکان کەم دەبێتەوە و زۆر داریی بەشێوەیەکی روو لەزیاد بوو دەبێتە شتێکی پێویست بۆ دابینکردنی ملکەچی بۆ یاسا و چەندین کەرتی کۆمەڵگای رامیاریی داواکاری جیابوونەوە پێش کەش دەکەن. دەبێت ئەم فشارانە کەم بکرێنەوە کە دەبنە هۆی لاوازکردنی جووتکردنی رامیاریی لە رێگەی کاردانەوە گونجاوەکانی دەسەڵاتە رامیارییەکانەوە بەپێچەوانەی ئەمەوە سیستەمەکە بەرەو ئەوە دەچێ کە پەرت ببێ یا بەتەواوی دارمێ.

رەنگە ئەم جۆرە فشارانە لەگۆڕانی کۆمەڵگا یامەترسیی دەرەکی یا سەرنەکەتن لەلابردنی سەرچاوەکانی دابڕ بوونی کۆمەڵایەتیو کەمکردنەوەیەوە سەرچاوە بگرن، یا بەهۆی نەتوانینی قایل کردنی ئەندامانی رۆشنبیرییەکی لقی دیار یا کەم دەرامەتیەوە... هتد، نموونەی فشارەکانی جووتکردنی نەگونجاو لەمێژووی نزیکدا سەرهەڵدانی تەوژمی نەتەوەگەرایی سکوتلەندی و ئێرلەندی لەرامیاریی بەریتانیداو داخوازییەکانی (هێزی رەش) لە ئەمەریکاو جووتکردنی نەگونجاوی دەزگایی رامیاریی رەگەز پەرستی لە باشووریی ئەفریقاو داواکارییەکانی دانیشتوانە فەرەنسی زمانەکانی کیوبیك و گرفتەکانی نەتەوەکان لەیەکێتی سۆڤیەتی پێشوو تەوژمی جیاوازی تامیلی لە سیرلانکا دەگرێتەوە هەندێك توێژەرەوە ئاماژەیان بۆ ئەوە کردووە کە تیپەکانی دەستە بژێرە جەماوەری دانیشتوان کرفتی سەرەکی جووتکردنی نەگونجاون بەڵام هەندێك توێژەرەوەی تر ئاماژەیان بەو سەرنەکەوتنانە داوە کە لەگەیشتن بەرێکەوتن لە رادا لەدەستە بژێرەکاندا کە رەنگە بەشێوەیەکی

یەکسان بێتە هۆی جووتکردنی نەگونجاو. لەگەڵ ئەوەشدا کە جووتکردنی رامیاریی گرفتێکی تەنها تایبەت بە دەوڵەتە نوێکەرەوەکان نیە بەلاَم مەسەلەیەکی باوە لەپرۆسەکانی نوێکردنەوەدا، کۆمەڵەی ئەورووپیش بارێکی تایبەت بووە لەشیکردنەوەی جووتکردنی رامیاریدا کە تیایدا جووتکردنی دەوڵەتە ئەندامەکان سەرباری بەشەکانی دانیشتووانەکەی گرفتێکی مەڵبەندی پێك دێنن.

**See also : Cleavage ; consensus ;**
**Political culture ;political sustem ; seces-sion**
**Political party See : party.**

## Political Philosophy    فەلەسەفەی رامیاریی (*الفلسفة السياسية*)

بریتیە لەشیکردنەوەی نیزامی و هەڵسەنگاندنی رەخنەیی، لەسەر ئاستێکی بەرز لە ئەبستراکت، بۆ لایەنە پێوانەیی و میتافیزیکیەکانی رامیاریی و توێژینەوەی رامیاریی .

لەو وولاَتانەی کە بەئینگلیزی دەدوێن بەشی گەورەی فەلسەفەی رامیاریی بایەخ دەدات بە شیکردنەوەی ئەو تیۆرو چەمکانەی کە بەکار دێن لەدیالۆگی پێوانەیی و توێژینەوەی ئەزموونیدا لەوانەیە کە چەمکە جیاوازەکانی دادپەروەریی وا شیبکرێتەوە کە بۆ دۆزینەوەی پەیوەندیی بەچەمکەکانی ترو مەسەلەکانی راستی و جۆری ئەو حوکمە پێوانەیی یانەی کەرێ پێنەداو رێکەوتنی لەگەڵ بەهاو پێوەرکانی تری حوکمدا و هۆیە گشتییەکانی پابەندبوون بەچەمکێکی دیاریکراو بێ لەوانی تر، هەر وەك چۆن چەمکەکانی (هێز) یش لەوانەیە لەرووی ناوەرۆکە پێوانەییەکانەوە شیبکرێتەوە یا لەرووی هەستیاریی بۆ وەرگێرانی کردەیی چەمکەکان و بەکار هێنانی لە توێژینەوەی ئەزموونیدا.

فەلسەفەی رامیاریی هەروەها بایەخ دەدات بە مەسەلەکانی تایبەت بە میتافیزیك و فەلسەفەی مێژوو: سروشتی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی، سروشتی ژیانی رامیاریی،

گریمانه پێشینه بنەڕەتییەکانی شاراوە لەپشت بیرەوە سەبارەت بە مێژوو و کۆمەڵگا بەشێوەیەکی گشتگیر یا لەقۆناغێکی دیاریکراودا. بۆ نموونە هیگڵ ئەوەی دەرخستووە کەوا لەدەوڵەت تێبگەین وەك بەشێك لەپرۆسەی بەدی هاتنی (هزر) یا (گیان) ئەمەش پێوا بوونێکە کە نەوەك ڕێسایەکی ڕەوشتی و نەوەك گریمانەیەکی ئەزموونی دیارە.

See also :Concept ; normative theory ; Political science ; politiccal theory ; po-Litical thought ; theory.

## Political Psychology دەروونناسی ڕامیاریی (*علم النفس السیاسي*)

بریتیە لەتوێژینەوەیەك کەزاناکانی ڕامیاریی و دەروونناسی ئەنجامی دەدەن لەپەیوەندیی نێوان ڕفتاریی ڕامیاریی و بارە دراوە هزرییە هۆشیارانەو ناهۆشیارانەکان.

لەبەشی یەکەمی سەدەی بیستەمدا هەوڵ دراوە بۆ هێشتنەوەی لێکدانەوەکانی ڕامیاریی لە سەر بناغەیەکی میکانیکی لەسروشتی مرۆڤانەی تاکدا یا ئەنجام دانی توێژینەوەی ڕەفتاریی لەهاندەرو وەڵامدانەوەدا . لەدەیەی پەنجاو شەستەکاندا توێژینەوەکان چڕ بوونەتەوە لە پەیوەندییەکانی نێوان هۆکارە کەسیەکان و ڕفتاریی ڕامیاریی و پۆلێنکردنی هەڵوێستە ڕامیارییەکان وریزکردنیان و پرۆسەی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی وڕێسا دەروونیەکانی شێوازەکانی سەرکردایەتی.

لێکۆڵینەوە هەرە نوێیەکانیش بەرەو دەروونناسی کۆمەڵەکان ڕۆیشتووە لەگەڵ نموونە ئیدراکییەکان بۆ وەرگرتنی بڕیارەکان، و (دینامیکیەتی دەروونی) بۆ وەرچەرخانی کۆمەڵایەتی، و دروستکردنی بیروباوەڕی کۆمەڵایەتی، و کارەکانی

ووتاربێژی رامیاریی) .

See also : Attitudes ; behaviouralism ; Determinism ;ideology ;political so-Cialization ;reductionist theories ;rhe-Thoric ; values.

## Political science　　　　زانستی رامیاریی (علم السیاسة)

• زاراوەی زانستی ڕامیاریی لانی کەم دوو مانای هەیە،لەوانەیە بەشێوەیەکی گشتی بریتی بێت لەلێکۆڵینەوەی مەسەلە رامیارییەکانی، یا بەکار بێت بۆ جیاکردنەوەی دەزگاو کردە رامیارییەکان لەلێکۆڵینەوەیەی ڕامیاریی بەتایبەتی پێناسەکردنی ئەو لایەنانەی لەلێکۆڵینەوەی رامیاریدا کە پشت بە تیۆرێکی ئەزموونی دەبەستێو دەیەوێ مەعریفەیەك بەرهەم بهێنێت کە هۆیەکانی جێگیر کەر بن. لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی ڕامیاریی یەك (لق) نیە لەهەر مانایەکی ووردی ووشەکەدا بەڵکو وەرگرتنی بۆ بابەتەکەی و ڕێگەکانی و شێوازەکانی لەکۆمەڵێکی فراوانی لقی و لقە وردەکانەوەیە کە بریتین لەفەلسەفەی مێژوو و ماتماتیك و یاسا ئابووریی و زانستی مرۆڤ، واش دەرکەوتووە کەئەم لقانە و لقی زۆری تر پەیوەندییان هەیە بەڕووداوە ڕامیارییەکانەوەو بەشداریی کردووە لەپەرەپێدانی زانستی ڕامیاریی و پێك هێنانیشی شێوەیەکە لە توێژینەوەی نادیار.

بەکارهێنانی زاراوەکە لەشێوەی هەرە تایبەتمەندیدا بۆ وەسفکردنی توێژینەوەی ڕامیاریی ئاراستەکراو بەشێوەیەکی ئەزموونی کۆمەڵێکی گەورە گرفت و چەند و چوون دەورووژێنێ سەبارەت بەسروشتی زانست و باری زانست کرداریی یاشیاو بۆ لێکدانەوەی ڕامیاریی، (زانستی رامیاریی) ئێستا بەکار دێ بۆ وەسفکردنی

توێژینــەوەی ئەوانــەی کەبیرۆکــەی یــەك ڕێگــەی زانــستی ڕەت دەکەنــەوە یــا هــەر لاسایکردنەوەیەك بۆ ڕێگەکانی زانستە سروشتییەکان سەرباری ئەوانەش بڕوایـان بـەو جۆرە بیرو ڕێگایانە هەیە.

See also :Explanation; government
(b) :Study area ;political anaalysis;political philosphy ; political theory ;
political ; thought ;politics;scientific
metod ; theory.

## پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی ڕامیاریی (التنشئة الاجتماعية السياسية) Political Socialization

پێگەیاندنی کۆمەڵایـەتی رامیـاریی پرۆسـەیەکە کـە تـاك لەرێگەیـەوە، لەلایـەك ئـەو زنیاری و هەڵوێست و ئاراستانەی دەست دەکەوێ کەسەبارەت بەدیاردە رامیاریەکانن و لەلایـەکی تـرەوە کۆمـەڵگا دەگوێزرێتـەوە بـۆ پێـوەرو بیروبـاوەڕە رامیارییـەکان لەنەوەیەکەوە بۆ یەکێکی تر و بۆ کۆچکەرە نوییەکان. لەوانەیە ئـەم دوو لایەنـە کـەم بکەن چونکە تاك وەك دەردەکەوێ کەهەڵوێست و ئاڕاستەی لادەریش وەردەگرێ.

پرۆسەی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی و رامیاریی بەرەو ئەوە دەچێ کە لەناو بارودۆخە مادییەکانــدا بــێ و، لەدرێژبوونــەوەی منــاڵی زووەوە بــۆ قۆنــاغی پێگەیــشتن و وەلەکاتیدا.

وا دیارە کە هەڵوێستە رامیاریە بنەڕەتیەکان لەپێشدا وەردەگیرێن: ملکەچ بـوون بـۆ کۆمـەڵگا (یـا دەوڵـەت یـا ڕەگـەز یـا نەتـەوە...هتـد) و دان نـان بەدەسـەڵات و هەڵوێستە پێشینەکان بەرەو بوونیان. ئەنجا ئەوهەڵوێستانە دێن کـەزیاتر دیـاریکراون وەك هەستی پەیوەند بوونی گشتی بـە حیزبێکـی رامیارییـەوە و شـوێن کـەوتنی ئـەو هەڵوێـستانە بـەرەو مەسـەلە رامیارییـەکان و هەڵوێـست لەبەرنامـە ڕامیارییـەکان.... لەکاتێکـدا ئـەم پرۆسـەیە لـە زنجیرەیەکـدا ڕوو دەدات لـەژیانی تاکـدا ئـەوا گۆڕانـە

کۆمەڵگەییە سەرەکییەکان یا چوونە ناوەوەی تاك بۆکۆمەڵگەیەکی نوێ (لەرێگەی کۆچەوە،بۆ نموونە) رەنگە پرۆسەیەکی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی رامیاریی نوێ لەخۆ بگرێ لەتەمەنێکی تا رادەیەك دواکەوتوودا.

لەوانەیە پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی رامیاریی لەرێگەی پرۆسە راستەوخۆ یا ناراستەوخۆکانەوە بێ. هەروەها پرۆسە راستەخۆکانی جۆرو رۆشنبیرکردنی رامیاریی نیزامی لەخۆ دەگرن (لەگەڵ ئەوەشدا کە هەندێك پێناسە پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی رامیاریی لەهۆشیارکردنەوەی رامیاریی ئاشکرا جیا دەکاتەوە) سەرباری بەشداریی رامیاریی کەسی. پرۆسە ناڕاستەوخۆکانیش فراوانکردنی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی نارامیاریی لەخۆدەگرن بۆ بارە رامیارییەکان (وەك وەرگرتنی هەڵوێستە کۆمەڵایەتییە گشتییەکان وەك هێزی کۆمەڵایەتی بۆ کاریگەریی) و بەشداریکردن لەو بارە ناڕامیاریانەی کە لەوانەیە سازشی وەرگرتنی بڕیارەکان یا پیادەکردنی دەسەڵات و تەقلیدییان تێدا بێت.

ئاژانسەکانی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی رامیاریی بریتین لەخێزان و کۆمەڵە نزیك لەیەکەکان و دەزگا فێرکارییەو رێکخراوە رامیاریەکانی (وەك حیزب) و ناڕامیاریێ (وەك کلێسا و یانە کۆمەڵایەتیەکان) .

هەڵوێستەکانی ئەم ئاژانسە جیاوازنەو بەهاکانی لەناوەڕۆك و ئاراستەدا دەگۆڕێ بەتێپەڕبونی کات کە لەوانەیە لێك نەچن بە بەراوردکردن لەنێوانیاندا.

بەم شێوەیە رەنگە تاك بەرەو رووی گرفتەکانی گونجاندن لەنێوان پرۆسە جیاوازەکانی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی ببێتەوە: بۆ نموونە دەرچووی زانکۆیەك لەچینی کرێکارو دانیشتوانە گوندنشینەکان لەکۆمەڵگا نوێکراوەکاندا. کاتێك کە لەشاردا دادەنیشن و ئەو کۆچکەرانەی کە لەروشنبیرییەکی تەقلیدییەوە دەگوزنەوە بۆ کۆمەڵگایەکی پیشەسازیی.

**See also : political culture ;**
**political integ ration.**

## Political Sociology سۆسۆلۆژیای ڕامیاریی (*علم الاجتماع السياسي*)

بریتیە لەلێکۆڵینەوەی پەیوەندییەکانی نێوان کۆمەڵگاو ڕامیاریی :لەنێوان لایەنە کۆمەڵایەتی و ڕامیارییەکانی پەیکەرە دەزگاکان و ڕەفتاردا، هەروەها بوارەکانی بابەخیش ئەمانە دەگرێتەوە، بنکەی کۆمەڵایەتی و شوێنەوارەکانی گۆڕانی کۆمەڵانی لەدەزگاکان و ڕامیارییە ڕامیارییەکان،و ڕۆشنبیری کۆمەڵایەتی وجووتکردنی ڕامیاریی‌و هۆیە کۆمەڵایەتییەکانی ڕێکەوتنی ڕاو ململانێ وشیکردنەوەی دەستەبژێرەکان و پەیوەندی نێوان پەیکەری کۆمەڵایەتی و هێزی ڕامیاریی. بەم شێوەیە سۆسۆلۆژیای ڕامیاریی لەنێوان توێژینەوەی هەندەکی لەهەڵوێستە کۆمەڵایەتیە پەیوەند بە ڕەفتاریی ڕامیاریی تاکییەوەوە لەنێوان توێژینەوەی گشتی لەپەیوەندییەکانی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگادا دێت و دەچێت.

ناکرێت کە هەر ئاستێکی دیاریکراوی توێژینەوەکان بەڕاستی وەسف بکرێت وەك نمونەیەکی سۆسۆلۆژیای ڕامیاریی زاراوەکەش هیچ گریمانەیەکی تایبەتی ناگەیەنێ کە سەبارەت بە پێشینەی هۆکارەکی هۆکارە کۆمەڵایەتیەکان بێت بەسەر ڕامیارییەکاندا.

**See also : political analysis ;political History ; political science ; politics ; Society; state.**

## Political System سیستمی ڕامیاریی (*النظام السياسي*)

زاراوەکە زۆر جار بۆ وەسفی ئەو ڕێکخستنە ڕامیارییانەی کۆمەڵگایەك بەکار دێت بەمەش خەریکە کە هاومانای ووشەی (دەوڵەت)بێت بەڵام ئەو دەلالەتە یاسایی و فەلسەفییانە هەڵناگرێ کە ووشەی (دەوڵەت) هەڵیدەگرێ، هەر چۆنێك بێت ئەوا ئەو کۆمەڵگایانەی کە پەیکەری دەوڵەتییان نییە دەکرێت دابنرێن کە سیستمی ڕامیارییان

هەیە. بەشێوەیەکی دیاریکراو تریش زاراوەکە لەزانستی ڕامیارییدا زاراوەکە بریتیە لە کۆمەڵێك پەیکەرو پرۆسەو دەزگا کە لەنێوان خۆیاندا کارلێك دەکەن و لەرێی سنورەکانی سیستمەکە بەژینگەوە (بۆ تایبەتکردنی بەهاکان بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە بۆ کۆمەڵگایەك) بەگشتیش ئەو فەرمانانە ئەنجام دەدات وەك یەکلایکردنەوەی ململانێکان و دانانە ڕامیارییەکان لەپلەو پایەکانی دەسەلأتدا کە ڕەنگە بە ڕامیاریی بناسرێت. سستمی ڕامیاریی خۆیشی سیستمێکی لقییە بۆ سیستمێکی کۆمەلأیەتی فراوانتر لیی جا ئیتر ئەگەر سیستمی کۆمەلأیەتی دەوڵەت بێت یا کۆمەڵگایەکی ناوخۆیی یا خێڵێك یا دەزگایەکی وەك زانکۆ یا خەستەخانە یا زیندان بێت.

بەشێوەیەکی ئاسایش وا لێی تێدەگەین کە بریتیە لەسیستمێکی کراوەی هاوبەش کە لە ئاڵوگۆڕدایە لەگەڵ ژینگەکەیەو سیستمێکی خۆ گونجاندنە کە دەتوانێت وەلأمی بارودۆخە گۆڕاوەکان بداتەوەو یەکە تایبەتیەکانی خۆی و ڕێك دەخات وکاردانەوەی بۆ فشارەکانی هەیەو لەرێگەی میکانیزمەکانی گێڕانەوەشەوە دەرچووەکانی بەپێی بارودۆخی چووەناوەکان دەگونجێنێ. لەدەروازەی تیۆری سیستمەکانی دایڤید ئایستن و کارل دویتچدا بەشێوەیەکی گشتگیر تر شیکراوەتەوە. لەبەر ئەوەی زاراوەکە بەفەرمانەکانیەوە دەناسرێت ئەوا دەکرێت کە ئاماژە بکات بەو ڕێکخستنە ڕامیاریانەی دەوڵەت و نادەوڵەتیش.

See also : Feedbak society ;state ;
Systems analysis

## Political Theory تیۆری ڕامیاریی (*النظرية السياسية*)

زاراوەکە هەندێك جار بەشێوەیەکی گشتی بەکار دێت تا لێکۆڵینەوەی هەموو لایەنە گشتیەو دابڕاوەکانی ڕامیاریی و شیکردنەوەی ڕامیاریی بگرێتەوە : لەبەشێکی زانکۆی زانستی ڕامیارییدا، لەوانەیە ئەو لێکۆڵینەوانەش بگرێتەوە کە بەناونیشانێکی گشتی پێشکەش کراون کە ئەمەیش (تیۆریی ڕامیارییە) کە لێکۆڵینەوەن لەبارەی

فەلسەفەی ڕامیاریی و مێژووی بیری ڕامیارییدا. بەلآم زاراوەکە بەکاریش دێت بەشێوەیەکی بەر تەسکتر بۆ وەسفی تیۆرە هۆیی و لێکدانەوەییەکانی زانستی ڕامیاریی.

تیۆریی ڕامیاریی لەم مانایەدا، پێك دێت لە تیۆرە بنکە ئەزموونیەکان بنکەکان سەبارەت بە سیستمەکان و پرۆسە ڕامیارییەکان و ڕەفتاریی ڕامیاریی.

**See also: political analysis ;political Poilosophy ; political science ;political Thought.**

## Political Thought بیری ڕامیاریی (*الفکر السیاسي*)

زاراوەیەکی زۆر گشتییە بۆ چەندین جۆر لەتیۆرو فەلسەفەو ئایدلۆژیاو پرۆسە هزرییەکانی تایبەت بەڕامیاریی...هتد و دەربڕینیان، لەم مانا فراوانەدا بیری ڕامیاریی فەلسەفەی ڕامیاریی و تیۆریی و ئایدۆلۆژیای ڕامیاریی لەخۆ دەگرێت، ئەمە لەکاتێکدا کە زاراوەکە لەبوارێکی تەسکدا ڕووبەڕووی مێژووی فیکری ڕامیاریی دەبێتەوە. لێرەشدا بایەخی سەرەکی بریتییە لە شوێن کەوتنی سەرچاوەو پەرەسەندن و کاریگەریی بیرە ڕامیارییەکان و شێوەکانی دیالیکتیك بەدرێژایی مێژوو یا شیکارکردنی هێماکانی مانای چەند بیرێکی دیاریکراو و شێوەکانی دیالیکتیك لەناو ڕەوتە مێژوویی و ڕامیارییە ڕاستەوخۆکەیدا. ناکۆکییەکیش هەیە سەبارەت بەوەی کە ئایا ئەم دوو هەواڵە هەر یەکەیان ئەوی تر بەلا دەنی کە ئەمەش بەباش دەزانرێ جا ئەگەر هەر یەکێکیان بکرێ و بەو شێوەیە .. بەلآم بایەخی مێژوونوسی بیر لەهەر یەکێك لەو دووبارەدا بریتیە لە بایەخی فەیلەسوف یاخودی تیۆردارێژی ڕامیاریی. مێژوونوسی بیر بەتایبەتی بایەخ نادا بەڕاستگۆیی بیرەکان یان جێگیری یا سودەکانی، بەڵکو لەماناو پەیوەندیدا بەبیرەکان یا کارەکانی تری پەیوەند لەڕووی مێژووییەوە.

بەلآم لێکۆڵینەوەی زانکۆییە یەکەمییەکان کە ناونیشانی وەك (مێژووی بیری

رامیاریی) هەڵدەگرن هەر چارەسەرێکی مێژوویی ڕووت تێ دەپەڕێنێ لەوەدا کەوا لەمەسەلە فەلسەفیەکان دەکات کە کار لەمادەی لێکۆڵینەوەکە بکات.

See also : Hermeneutics ; ideology ;
Politicalphilosophy ; political theory.

## Politics رامیاریی (*السیاسة*)

زاراوەکە لەووشەی (polis)ی گریکیەکەوە وەرگیراوە کەبەمانای کۆمەڵگایەکی رامیاریی ئەو هاولاتیانە دێ کە پەیوەندن بەدەوڵەتی ـــ شارێکی وەك ئەسینا یا ئەسپارتە، ووشەی (politics) لەبەکارهێنانی نوێدا بەمانای چالاکی دێ لەسیستمی کۆمەلایەتیدا، جائەوە سیستمی کۆمەلایەتی دەوڵەت بێ یا کۆمەڵگاو دەزگاکانی تر، کە تیایدا ئامانجەکانی سیستم هەڵدەبژێرێ و ڕێك دەخرێ بەپێی ئەولەویەت (کات و تایبەتکردنی دەراتەکانەوە) و جێبەجێ دەکرێت. بەم شێوەیە ڕێگەکانی هەڵبژاردنی دەسەلاتە رامیارییەکان و گۆڕینیان و سیستمی بەهاکانی کۆمەڵە بەشدارەکان لەڕامیارییدا وەکو بزوتنەوەکان و کۆمەڵەکانی بەرژەوەندی بزوتنەوەکان و ڕەفتاری تاکەکان وەك بەشدارییان لەرامیاریی و هەڵبژاردنەکانیان و ڕێکخستنی ئەو ئامێرەی دەسەلات کەبەهۆیەوە بڕیارە ڕامیارییەکان جێبەجێدەکرێ، دەگرێتەوە.

رامیاریی وەك پێویستی بریتیە لەبوونی ململانێ و ڕێکەوتن لەڕادا: بەبێ ململانێش هیچ پێویست بەڕامیاریی ناکات بێ ڕێکەوتن لەڕادەدا سەبارەت بەپێوەرو ڕێوشوێنە رامیارییەکان، ئەوا پرۆسەی رامیاریی ناتوانێ کە کار بکاو ڕێگەی تر شوێنی دەگرێتەوە بۆ گەیشتن بەئەنجامەکان وەك توندو تیژیو زۆر. رامیاریی بەوە لەپرۆسە کۆمەلایەتیەکانی تر جیا دەکرێتەوە کە بایەخ دەدا بە ئامانجە (گشتییەکان) ی کۆمەڵگا، واتە ئەو ئامانجانەی کە مەبەست وایە لێیان کەبایەخێکی گشتییان هەبێ

(بڕیارەکانی سەبارەت بەیاسای تەلاق بۆ نموونە، بەلاّم بڕیارێك نیە سەبارەت بەمەسەلەی تەلاق لەهیچ هاوسەرییەکی دیاریکراودا)، لەکاتێکدا لەوانەیە ئابوری، بایەخ بدات بەتایبەتکردنە تایبەتیەکان یاحکومیەکانی شمەك و خزمەتگوزارییەکان و یاساش بایەخ بدا بە جێبەجێکردنی کۆمەڵێك بڕیار بەپێی دەستورێك یا یاسایەکی دانراو بەم شێوەیە ئەمانە ئەو بڕیارانەن کە لەپرۆسەیەکی رامیاریی پێشوەوە وەرگیراون.

ناکۆکییەك هەیە سەبارەت بەپێناسەکانی رامیاریی لەزانستی رامیارییدا،هەندێك رامیاریی وا دادەنێن وەك چۆن تەنها بەپێی دەوڵەت پێناسە کراوە سەبارەت بەو داخوازییە سەرەکییانەی کەتەنها دەوڵەت دەتوانێ وای لێبکات کە زۆر ئاشکرابێ و لایەنێکی زۆر گرنگی رامیاریی بێت تاوا لەبەکارهێنانی زاراوەی (politics) بکات بۆ وەسفکردنی هەر چالاکیەکی رێکخراوەکانی تر جگە لەدەوڵەت راست نەبێ. هەندێکی تر چڕ دەبنەوە لە پرۆسەی رامیارییدا کە وەك فەرمانێك بێت بەر لەهەموو شتێك، وەك فەرمانێك کە دەکرێت دیاری بکرێت کە هەیە، ئەگەر چی بەشێوەیەکی روونیش نەبێ، لە هەر کۆمەڵگایەك یا رێکخراوێکدا، هەندێکی تر پێناسەکانیان لەهێزدا چڕ دەکەنەوە و ئەوانی ترلە وەرگرتنی بڕیارەکاندا، بەلاّم کەسانێکی تر لەململانێ و یەکلایکردنەوەی ململانێکانی ناخی پرۆسەی رامیارییدا قوڵ دەبنەوە.

See also : Government (a) : The inisitiu-
Tion ; society ; sovereignty ; satte.

## Polity (المجتمع المنظم سياسيا) کۆمەڵگای رێکخراو لەرووی رامیارییەوە

کۆمەڵگایەکی رێکخراوە لەرووی رامیارییەوە بەچاوپۆشین لەشێوەی حوکم، ووشەکە بەمانای رێکخراوی مەدەنیی دەوڵەتێك دێ بەلاّم دەکرێ کە بۆ وەسفکردنی ئیمپراتۆریەتێك یا کۆمەڵگایەکی رامیاریی نێو دەوڵەتی یا شارۆچکەیەك ....هتد بەکار بێ.

See also : politics ;society ;satte.

## Pol راپرسی (*الاستفساء*)

ڕێوشوێنێکە بۆ دەستخستنی گوزارشتەکان لەڕادا، لەوانەیە ئەمە لەڕێی دەنگدانێکی نیزامیەوە بێ (هەڵبژاردن یا ڕاپرسی) یا لەڕێی ڕوو پێوانێکی بەپاڵپشتی زانیاریی وەرگرتن و چاوپێکەوتن کەهەندێك جار پێی دەوترێ (زانیاری وەرگرتن لەسەر ڕا) (ڕاپرسی نارەسمی **Strew poll**)هەڵبژاردنێکی نانیزامییە بۆ ڕا لەمەسەلەیەکدا کەسەبارەت بەپێشنیازێکە هێشتا کاتییە.

مانایەکی تر هەیە کە لەووشەی (**poll**) وەرگیراوە وەك ئەو جێگەیەی کەدەنگدانی تێدا دەکرێ لەو بوارانەی وەك (نیوەی دەنگدەرەکان دەچن بۆ جێگەکانی دەنگدان پێش نیوەڕۆ).

**See also : Election ;plebiscite ;refe-**
**Rendum ;voting.**

## Polyarchy حوکمی زۆرینە (*حکم الکثیرین*)

زاراوەکە پڕاو پڕ بەمانای (حوکمی زۆربە) دێ و دەلالەتێکی وردتری وەرگرتووە لەزانستی ڕامیارییدا ڕەنگە هەندێك وای ببینێ کەدەسەلآت لەدیموکراسیە نوێنراوە نوێکانـدا ڕاستەوخۆ گەل پیادەی ناکا بەڵکو دەستەبژێرەکان. بەلآم ئەم دەستەبژێرانەش ڕەنگە لەناو خۆیاندا پێشبڕکێ بکەن لەسەر دەسەلآت بەدواندنی ئیئتلافە گۆڕاوەکانی ئەو بەرژەوەندیانەی کە هەیە لەدەنگدەرەکاندا. ئەگەر ئەو پێشبڕکێیە کراوە بێ و هیچ بەرژەوەندییەکی بەکۆمەڵ بەتەواوی فەرامۆش نەکات ئەوا زۆربە دەسەلآت پیادە دەکەن بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ و دەکرێت بوترێت کە حوکمی زۆرینە هەیە.

See also: Democracy; elite: Pluralism .

## Populism میللیگەرایی (الشعبية)

یەکێك لەبەکار هێنانەکانی ئاماژە دەکا بەو بیرە رامیارییەی کەسەر بەهای پەیوەندیی راستەوخۆ لەگەڵ (گەل) و بەشداری رامیارییان یان دامەزراندن تێشیدا دامەزراندنی دەزگا دیموکراسیە راستەوخۆکانی وەك دەستپێشخەریی چەپ یا راست و راپرسی و وازهێنان. بەم شێوەیە دەکرێ کەببەسترێتەوە بەهەر ئایدۆلۆژیایەکی رامیاریی چەپ یا راست یا تەوژمی نەتەوەکگەرایی یا بزووتنەوە ئایینی و رەگەزیی یا زمانییەکانەوە... هتد زۆر بزوتنەوەو رێکخراوی رامیاریی هاوچەرخ (وەك حیزبە سەوزەکان و بزوتنەوەکانی قوتابیان پێ لەسەر ئەم جۆرە رێو شوێن و ئامانجە میللیانە دادەگرن. رامیاریی میللی ئەو کەسەیە کە بانگەوازە راستەوخۆکان بۆ گەل وەك ئامرازێکی رامیاریی بەکار دێنێ بەلام بەبێ داناندیئامانج ورێگە میللیەکان بۆ بەشداریی رامیاریی وەکو پێویست. لەم مانایەشدا دەکرێت کە گۆبلزو هیتلەر و دیگۆل و بیرۆن و ئەندامی ئەنجومەنی پیران جۆزیف ماکارتی وقەزافی و کاسترۆ هەموویان بەمیللی دابنرێن. بەکارهێنانێکی زیاتر دیاریکراوتر ئاماژە دەکات بەو بزوتنەوەو حیزبانەی کەهەوڵی رێکخستنی (گەلی هاوبەش) دەدات (بە جووتیارانیشەوە کەهەندێ جار پێیان لەسەر دادەگیرێ) وەك هێزێکی دژی هێزە رامیارییە جیهانییە زۆرزانەکان یا گەندەڵەکان وەك دەردەکەوێ وەك دەرەبەگەکان و کەمینە رەگەزییە سامانداراەکانو پارە دەرەکان (لەئەمەریکا) و دەربار (لەروسیای قەیسەریی)،رەنگە ئەوانە بە بەشداریش بژمێردرێن لەپیلانێکدا لەدژی (گەل) . لەئەمەریکادا حیزبێکی میللی (حیزبی گەل) دامەزرێنراوە لەساڵی 1891داو وەك هێزێکی رامیاریی هەرێمی و نیشتمانی ماوەتەوە تا لەگەڵ دیموکراتییەکاندا یەکی گرتووە بۆ پشتگیریکردنی

پالآوتنی ولیەم جنگنز برایان بۆ سەرۆکایەتی لەساڵی 1896دا.

## ئەو پرۆژە حکومیەی کەقازانجی گەورەی بۆ لایەنگران دەبێ Pork –barrel
## (المشروع الحكومي الذي يعود على الانصار بمكاسب كبيرة)

زاراوەیەکە بەکار دێ بەتایبەتی لەڕامیاریی ئەمریکادا بۆ وەسفکردنی تایبەتکردنی پرۆژە حکومییەکانی وەك دەزگا سەربازییەکان و پەرەپێدانی بەندەرەکان و پێگەکانی نوسینگە کێلگەیەکانی ئاژانسە حکومییە فیدراڵییەکان وکارە گشتییەکانی تر کە یاسادانەرەکان هەوڵ دەدەن جێگەکانیان دیاری بکەن لەولایەتەکانیاندا یا لەبازنەی هەڵبژاردنیاندا. ئەگەر یاسادانەرەکان سەرکەوتوو بوون ئەوا ناو ناوبانگێکی کەسیی باشیان دەست دەکەوێ کەسوودی هەیە لەهەلی دووبارەکردنەوەی هەڵبژاردن و بازنە هەڵبژاردنیەکان سەرچاوەی نوییان دەست دەکەوێ بۆ دەرامەتەکانی باج و کار.لەگەڵ ئەوەشدا کەزاراوەکە خۆی بەکار نایە لەدەرەوەی چوار چێوەی ئەمریکیدا بەلآم ئەو دیاردەیەی کەوەسفی دەکا لەدەوڵەتی تریشدا هەیە ـبەتایبەتی فیدارڵیەکان– وەك ئەڵمانیا و کەنەداو بەرازیل و مەکسیك.

See also : Log –oplling

## Positivism (الاجيابية) پۆزەتیفیزم

زاراوەیەکە بەکۆمەڵێك هەڵوێست دەوترێ لەبەرامبەر مەسەلەکانی ڕێگەو مەعریفەی زانستیو پێشکەوتنی زانستیو پەیوەندییەکانی نێوان لقە جیاوازەکانی ناو توێژینەوەی زانستیو ڕۆڵی مەعریفەی زانستی لەپەرەسەندنی کۆمەلآیەتی و ڕامیارییدا. ئەو دوو کۆمەڵە بیرەی کەزیاتر لەجارێك ئاماژەیان پێ دەکرێ بریتین لەبیرەکانی کۆنت وبازنەی بەندبوونی مەعریفە هەمووی لەسەر ڕاستیە یاساییەکان بۆ

ئەوەی بتوانرێ بەووردی پێشنبینی بکرێو دەست بەسەر گرتنی مرۆڤایەتی بەسەر جیهانی سروشت و کۆمەڵایەتیدا بێتە دی. زانست خۆیشی بەسوودە بۆ وەسفی شێوازی ڕوودانی شتەکان، بەڵام گوێ ناداتە هۆی ڕوودانەکەی (واتەبەسروشتی ڕاستەقینەی یاگەوەەریی) . بۆ نموونە ستایشی نیوتن دەکا چونکە پەیوەندییە بڕییە ڕاستەقینەکانی جوڵەو کێشکردنی سەلماندووە بەبێ هەوڵدان بۆ لێکدانەوەی هۆی باڵادەستی ئەم پەیوەندیانە.

لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا بازنەی ڤیەننا ڕایەکی پەرەپێداوە کە بە پۆزەتیفیزمی لۆژیکی ناسراوە. بەپیی ئەم ڕایەش ئەوا مانای هەموو گریمانەکان هیچ نیە جگە لەو ڕێ و شوێنەی کەدەکرێت پەیڕەو بکرێت بۆ سەلماندنی گریمانەکە لەڕیی وێناکردنی تاقیکراوەی جیهانەوە.

ئەو گریمانانەش کەناکرێت بەم ڕێگەیە بسەلمێنرێت ئەوا پێویستە دور بخرێتەوە چونکە بێمانان.

دەسەڵاتی ئەم پێوەرانەو هەوڵی جێبەجێکردنیان لەزانستی ڕامیارییدا بەشێوەیەکی ئاشکرا بەسترانەوەی پێوە دیارە.زیاتریش بایەخ بەو ڕاستیانە دەدرێ کەدەکرێ تێبینی بکرێن و هەر پەیڕەوێکی فراوانتر ڕەت دەکاتەوە وەك تەنها تێڕامانێکی تیۆری یا هەلوێستێکی ڕەوشتی.

لەزانستی ڕامیارییدا زاراوەی (پۆزەتیفیزم) دەبینین کەئێستا بەشێوەیەکی زۆر باو بەکار دێ وەك ئیدانەیەکی ڕەخنەیی بۆ ئەو شیکردنەوە ڕامیارییەی کەبەشێوەیەکی بەر تەسك بایەخ بەکۆکردنەوەی ئەو ڕاستیانە دەدات دەدەکرێت ڕستەوخۆ تێبینی بکرێن سەبارەت بەڕامیاریىو ئاراستە کردنی تیۆریی نیە، لەزانستی ڕامیارییدا ئێستا پۆزەتیفیزم دەبینینەوەکە زۆر بەکار دێت بەو پێیەی سەرزەنشتێکی ڕەخنەییە بۆ شیکاری ڕامیاریی کەلەبوارێکی تەسکدا گرنگی دەدات بەکۆکردنەوەی حەقیقەتەکان کەدەکرێت ڕاستەوخۆ تێبینی بکرێت سەبارەت بەڕامیاریی و ئاراستەکردنی تیۆری نیە. ئەمە لەکاتێکدا بەهۆی لەخۆگرتنی بۆ کۆمەڵێکی هەمە

جـۆری ڕا جیاوازەکـان لەژمارەیـەك مەسـەلە سـەربەخۆکاندا ئـەوا بـەکارهێنانی مەرجداری زاراوەکە نامانگەیەنێتە هیچ مانایەکی وورد.

زۆر جـار زاراوەی لێکـچوو بەشـێوەیەکی ڕووکـەش بـەکار دێ کـە (پـۆزەتیفیزمی یاساییە Legal positivism) و وەسـفی پـەیڕەوێك دەکـات لەیاسـاو سیـستمە یاساییەکاندا. نەوەك گەڕان بەدوای پاساوێکی نمونەیی یاسـەریەخۆیی یاسـادا. بایـەخ لەیاساکاندا چڕ دەکرێتەوە وەك سیستمێکی تەواوی ئەو فەرمانانـەی کەدەسـەلاتێکی بالآدەست دایدەنێ وسزاکان پشتگیری دەکات.

See also : Authority ; behaviouralism ; Empiricism ; falsificationism;law (b) : Stipulative law ; operationalization ; re-Alism (a) :Scientific realism ; sove-

Post-industrial society See :Industri-Al society.

## پاش ماتەریالیزم (پۆست ماتەریالیزم) *ما بعد المادية*

## Post - materialism

زاراوەیەکی گشتییە بۆئەو هەڵوێست و بەهایانـەی کـەوا دیـارە لەهەنـدێك بەشـی کۆمەڵگاکانی پاش مەتریالیزمدا پەرەدەسێنن. ئەو نەوانـەی کـەدوای شـەڕی جیهـانی دووەم لەدایك بوون و پێگەیشتنی کۆمەلآیەتی و ڕامیاریی یان دەستکەوتووە لەسایەی ئاشتی و گەشەسەندنی ڕوو لەزیاد بووو دەرفەتەکانی فێربوون و لەڕێگەی بەرکـەوتنی ئامرازەکـانی ڕاگەیانـدنی جـەماوەریی نێـو دەوڵەتیـەوە، بایـەخێکی لاواز تـر ئـەدەن بەمەسـەلە تەقلیدییـەکانی تایبـەت بەخۆشـگوزەرانیی مـادیی تـاکی و ئاسایـشی نیـشتیمانی ئـەو تاکانـە زیـاتر بایـەخ بەمەسـە ژینگـەیی و (جـۆری ژیـان) ئـەدەن. لەوانەشەکە هەوڵ بدەنکەئاواتەکانیان لەپێشێوە ناتەقلیدییەکانی بەشداریی ڕامیاریی وناڕەزایی دەبڕێن و کاری ڕاستەخۆوە بـەدی بێـنن .زاراوەکـە گـشتێتی و بـەردەوامی

دەبەخشێتە ئەو دیاردانەی کەڕەنگە ناوخۆییو کاتیبن، بەلاّم ئەم هەڵوێستانە بەردەوام بوون وەکو دەردەکەوێ ئەگەر چی لەشێوەیەکی سوکیشدا بێت لەڕووی گومانە ئابورییەکانەوە لەدواییەکانی دەیەی حەفتاکان وسەرەتایی دەیەی هەشتاکاندا.

ووتراوە کە دەرکەوتنی ئەم بەها وەرنەگیراوانە گرفتی ئەرکی سیستمی ڕامیارییێن، چونکە هاو دژن لەگەڵ داخوازییە ئابورییەکان و پەیکەری ڕامیاریی کۆمەڵگای نویدا هەر وەك ئێستا پێك هاتووە.

**See also : Dealignment ; environmental-Ism ; industrial society ; political cul-Ture; political socialization;realignee Ment.**

## powar (القوة) هێز

چەمکێکی زۆر مەڵبەندییە لەسۆسۆلۆژیادا کەڕۆڵەکەی بەڕۆڵی ووزە بەراوورد کراوە لەفیزیادا. پێناسەی هەرە گشتی هێز ئەوەیە کەبریتیە لەتوانای کەسێك یا کۆمەڵێك بۆ کارکردن یا بەدی هێنانی شتێك : لەوانەیە کەسێك توانای قسەکردن و هێزی بەدی هێنانی هەندێك ئامانجی دیاریکراوی هەبێ بە بەکارهێنانی قسە. شیکردنەوەی ڕامیاریش چڕ دەبێتەوە لەتوانای کەسەکان یا کۆمەڵەکاندا لەکارکردن یا بەدی هێنانی ئامانجەکان لەڕیی زامنکردنی ملکەچی بوون ئەوانی ترەوە. شیکەرەوە ڕامیارییەکان چەمکی هێزیان بۆ سێ ئەرکی سەرەکی بەکار هێناوە : وەسفی دابەشکردنی گشتیی هێز لەسیستمی ڕامیارییدا و هەڵسەنگاندنی توانا ڕێژەییەکانی کۆمەڵەکانی بەرهەڵستی لەهەندێك ململانیی دیاریکراودا، و دیاریکردنی سروشت و کۆتی هێزی بەردەستی کۆمەڵەکان یا کارە دەزگاییەکان.

زۆر چەمك پێشنیازکراوە بۆ هێز و لەشیکردنەوەدا بەکار هاتووە،ناکۆکیەکیش

هەیە لەباشترین ڕێگەدا بۆ نەخشەکێشانی جیاوازییەکانی نێوان هێزو ئەو چەمکانەی کەزۆر پێوەی پەیوەندن. هێز بەگشتی وەك ئەو چەترە مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ کە لەژێریدا دەسەڵات و چارەسەرو زۆر کۆ دەبنەوە...هتد، بەو شێوەیە هەر یەك لەم دوانە وەك جۆرێك لەهێز مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ کەسەرچاوەیەکی دیاریکراو یا ئامرازێکی پیادەکردنی هەیە،بەڵام هێز خۆیشی زۆرجار وەك پەیوەندییەکی تایبەتی مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ کە زیاتردیارە لەناو هەندێ لەو چەمکانەداو تێهەڵکێشیان نەبووە. هێز، هەندێك جار جیایە لەدەسەڵات چونکە هێز ئاماژە دەکات بەدیاریکردنی کەسێکی تر یا دەست بەسەراگرتنی، چەمکی دووەمیش کاریگەرییەکی کەمتر یەکلاکەرەوەی هەیە. هەڵبژاردنە نمایش کراوەکان لێرەدا کۆتاییان نایەت، ووتراوە کە (دەسەڵات) بەشێوەیەکی باشتر وەسفی پەیوەندیی کاریگەریی بەردەوام و دووبارەبووەوە دەکات بەڵام هێز بریتییە لەو دەرامەتانەی کەڕەنگە یەکەم جار لەکارکردنە سەر ئەوانی تردا بەپێی ئیرادەی ڕەگەزەکە بەکار بێ.

ناکۆکییەکیگرنگتر هەیە سەبارەت بەڕواڵەتە سەرەکییەکانی پیادەکردنی هێز.. ئایا پێویستە هێز لەسەر ململانێی پێك بێت، ئەگەر هاتوو وەڵامەکە ئیجابی بوو وە ئایا ئەم ململانێیە لە نێوان پێویستی و بەرژەوەندییە وێناکراوەکان و بەرژەوەندییە ڕاستەقینەکاندایە؟ ئایا دەبێ کە پیادەکردنی هێز بەدی هێنانی نیاز بەشێوەیەکیسەرکەوتوو لەخۆ بگرێ یا هێز ناکرێ پیادە بکرێ تەنها کاتێك نەبێت ئەگەر ئەنجامی نەویستراو هاتە کایەوە؟ ئایا هێز پیادە ناکرێ تەنها لەڕێی کارەکانەوە نەبی یا هێز ناکرێ پیا بکرێ تەنها ئەگەر ئەنجامینەویستراوە هاتەکایەوە؟ ئایا هێز پیادەناکرێ تەنها لەڕێی کارەکانەوە نەبێ یاهێز بەبێ کاریش مومارەسە دەکرێت؟

وەڵامە جیاوازەکانی ئەم پرسیارە چەمکیانە دەبێتە هۆی کۆمەڵێك بیری جیاواز لەوهێزدا کەبەڕۆڵی خۆی کۆمەڵێك وێنەی جیاواز بۆ جیهانی ڕامیاریی بەرهەم دێنن. مشتومڕەکانی پێشو لەو جیاوازییانەدا چڕ بوونەتەوە کەئاماژە دەکەن بەڕواڵەتە

خۆ یەکانی تاکەکان: نیاز و بایەخ ... هتد بەلاّم هەندێك شیکەرەوەکان لێکدانەوە لەم ئاستەدا بەرووکەش و نایارمەتی دەر دادەنێن و لێکۆڵینەوە لەرواڵەتەکانی پەیکەریی سیستمێك بەباشتر دەزانێ. لێرەدا لەوانەیە هێز بەکار بهێنرێ بۆ وەسفی رێکخستنی رەگەزو دەزگا رامیارییەکان بەپیی پەیکەر یاتوانای بەرهەم هاتووی چینەکان بۆ بەدی هێنانی بەرژەوەندییە بابەتییەکان.

ئاستەنگەکانی پێناسەکردن زیاتر دەبێ کاتێك ئەوە دەزانرێ کەزۆربەی بەکارهێنانەکانی چەمکی هێز پێویستی بەرێگەیەك بۆ پێوانە یا بەراوردی ژمارەیەك لەسەرچاوەکانی هێزی هاودژ هەیە. بەگشتی رێگەیەکی پەسەند نیە. هەندێك پێشکەوتن بەدەست هاتووە لەپەرەپێدانی نیشانەکان بۆ بەراوردکردنی هێزەکانی رەگەز رامیارییەکان لەوەرگرتنی بریارەکان لەرێگەی سیستمە جیاوازەکانی دەنگدانەوە.هەروەها دەبێت کەرووبەرووی هەوڵەکانی پێوانی هێز ببێتەوە لەو بارانەی کە دیارییان ناکات وەك تێچوونەکانی پیادەکردن و مەودای ئەو بەرهەڵستکارییەی کەبەسەریدا زاڵ دەبێ و بەدیهێنانی بەرژەوەندییەکان.ئەو ناکۆکیەی کەدەوری ئەم جۆرە مەسەلەیەیان داوە بووەتە هۆی ئەوەی کەهەندێك کتێب (هێز) وەك نموونەیەکی سەرەکیی چەمکێك دیاری دەکەن کەتووشی بەرهەڵستیەکی گەوهەری دەبێ.

**See also: Authority ; esseentially con- tested concpts ; interests ;issuse ; non- decisi ; recision ; reputational approach; struturalism.**

## Pargmatism پاساوگەرایی ــ پراگماتیزم ــ (*الذرائعية*)

لەرووی فەلسەفیەوە بریتیە لەباوەڕبوون بەوەی کەماناى بیرو گریمانەکان و پاساوەکانیان و راستییان پێویستە هەڵنەسەنگێنرێ تەنها لەبەر رۆشنایی ناواخنە کردارییەکانی مەسەلەکانی جیی بایەخی مرۆڤایەتیدا نەبێت. ئەم ئایدۆلۆژیایەش

دەسەلاتێکی فراوانی هەیەلەولاتە یەکگرتووەکاندا بەتایبەتی و بەهاوشێوەی ئەزمونگەرایی‌و پۆزەتیفیزم کاری کردووەتە سەر زانستی رامیاریی.

زاراوەکە هەروەها بەشێوەیەکی گشتی زۆر جار بەکار دێ بۆ وەسفی پیادەکردنی رامیاریی‌و پێناسەکردنی ئامادەیی بۆ گونجان لەگەڵ پیویستی و توانا تایبەتییەکانی کاتی ئێستا بەبێ بایەخێکی بەهێز بەجێگیری تیۆری یان یا ئایدۆلۆژیی.

**See also: Eempiriciism ;positivism; re-alism (b) :political realism.**

## Precedent (السابقة) پێشینە

بڕیار یا کاریکی پێشوە کە وەك بەڵگەیەك یا نموونەیەك بۆ بڕیارێك یا کارێکی ئێستا بەکار دێ دەکرێت پێشینەیەکی سەپێنراو بێ، وەك لەزۆر لە کایە یاسایی و کارگێڕییەکاندا یا پێشینەیەکی راوێژکارانە وەك لەبوارە جیاوازەکانی پیادەکردنی رامیارییدا، بەم شێوەیە لەوانەیە لەیاسای دەستورییدا مەسەلەیەك وەربگیرێ کەپێشتر بڕیار دراوە بەو پێیەی پێشینەیەکە بۆ ئەم مەسەلەیەی ئێستا لەخزمەتی مەدەنیشدا لەوانەیە کەبڕیارێك لەرابووردودا پێشینەیەکی قایلکەری هەبێ بۆ یەکلایکردنەوەی مەسەلەیەکی هاوشێوە، کەجێگیر نەبوە تێیدا، لەئەنجومەنی یاسادانانیشدا لەوانەیە مەسەلەی ڕێو شوێنەکان بەگەڕانەوە بۆ نموونەیەکی رابووردوی لێك چوو یەکلایی بکرێتەوە وەك پێشینەیەکی رابەر...هتد رواڵەتی گرنگی هەموو ئەم نموونانەش هەموویان بریتیە لەپلەی نزیکی لەیەك چوون لەنێوان پێشینەو مەسەلەکەی ئێستادا.

## Preferntial Votion (التصويت التفضيلي) دەنگدانی بەباشتر زانین

سیستمێکە لەهەڵبژاردندا دەنگدەر پەیوەست دەکا کەناوی پاڵێوراوەکان بەپێی ڕێکخستنی بەباشتر زانین ڕیز بکا (1–2–3–...) هتد لەبری هەڵبژاردنی یەك پاڵێوراو وەلانانی ئەوانی تر بەدانانی نیشانەی لێکدان ( ) لەبەردەم یەك ناودا. سیستمی دەنگی جێگرەوە و سستمی یەك دەنگ کەقابیلی گواستنەوەیە هەردووکیان بەکار دێن بۆ دەنگدانی بەباشتر زانین وەك چۆن جۆرە جیاوازە نەرمەکانی سیستمی نواندنی ڕێژەیی لیستەیی ئەمە دەکات.

**See also: Aliternative vote system; electoral system ; porportional represenatation ; single transferable vote system.**

## Prerogative (*الامتيازات*) ئیمتیازەکان

بریتیە لەکۆمەڵێك دەسەلاتی عورفی کەهەندێك جار لەیاسادایە و حاکمێك هەیەتی (پاشا یا سەرۆك) کەناچێتە ژێر ڕکێفی سەرکوتکردن یا سڕینەوە یا چاودێریی دادگاکانەوە لەگەڵ ئەوەشدا

ئەگەر ئەم دەسەلاتانە بەشێوەیەکی ڕەمەکی پیادەکران لەدەوڵەتێکی دەستووریدا ئەوا بێگومان دەبێتە هۆی گرفتە ڕامیارییەکان. دەکرێت کەدەسەلاتە ئیمتیازیەکان لەواقیعدا بگوازرێتەوە بۆکەسانی تر، وەك زۆر لەدەسەلاتە ئیمتیازییەکانی پاشای بەریتانیا کەلەڕاستیدا سەرۆك وەزیران ئەنجامی دەدات. ئیمتیازەکان بریتین لەمافی سەرۆکی ئەمریکی بۆ دان پێدانان بە دەوڵەتە بیانییەکاندا و مافی پاشای بەریتانی لەهەڵوەشاندنەوەی پەرلەماندا پێش کۆتایی هاتنی ئەو پەڕی ماوەکەی کەپێنج ساڵە.

**See also; Monarchy.**
**Pressure group See Interest group.**

## Primary Election (*الانتخابات الاولية*) هەڵبژاردنە بەراییەکان

شێوەیەکە لەهەڵبژاردنە یەکەمینەکان بەمەبەستی هەڵبژاردنی پاڵێوراوی حیزبێکی رامیاریی تا نوێنەرێك بۆ ئەو حیزبە پێشکەش بکات لەهەڵبژاردنەکاندا بۆ پڕکردنەوەی هەندێك پلەو پایەی گشتی. ئەم شێوازەش جیایەیە لەهەڵبژاردن لەلیژنەی هەڵبژاردن لەحیزیدا بەوەی کەهەڵبژاردنە یەکەمینەکان کراوەن لەبەردەم هەموو ئەندامانی حیزب وتەنانەت (لایەنگرانی) حیزبیش کەخۆیان دەپاڵێون لە هەندێك باردا. لەوانەیە حیزب هەموو هەڵبژاردنە یەکەمینەکان رێك بخات- یا وەك ئەمەریکا – لەوانەیە لەژێر رکێفی یاسای گشتی دابێ و تووشی کۆت و بەند ببێ بەهەمان ئەو شێوازەی خۆیدا کەبەپیی هەڵبژاردنە گشتییەکان رێکدەخرێ. لەوانەشە ئەو رێسایانەی کەحوکمی مافی دەنگدان لەهەڵبژاردنە یەکەمیەکاندا دەکات مەسەلەیەك بێت کەحیزب بڕیاری لەسەریدات یا یاسای گشتی دیاری بکات. لەبەریتانیادا ژمارەیەکی کەم لەهەڵبژاردنە یەکەمییە نانیزامییەکان رێکخراوە کەحیزب دەستی بەسەردا گرتووە. بێ لەمانەش هەڵبژاردنە یەکەمییەکان بەتەواوی پەیوەندن بەهەڵبژاردەکانی وەرگرتنی پلەو پایە ناوخۆییە نیشتیمانیەکانەوە لەئەمەریکادا.

See also : Election

## Primary Group (*المجموعة الاولية*) کۆمەڵەی سەرەتایی

کۆمەڵێکی تا رادەیەك قەبارە بچووکە کەبەرواڵەتی پەیوەندیی ئاڵوگۆڕ و کارلێکی توندوتۆڵ دەناسرێتەوە، و زۆربەی جار پشت بەپەیوەندیی روو بەروو دەبەستێ کە تیایدا ئەندامەکان ئینتیمای خۆیان بۆ کۆمەڵەکە دەردەبڕن لەرووی کەسێتیەتەواویانەوە. نەك تەنها سەبارەت بەرۆڵێکی تایبەتیکراو.

خێزان و کۆمەڵەکانی هاوسەرەکان و تیپەکانی کار و لەهەندێ باردا لیژنە بچووکەکان**** نموونەی کۆمەڵە سەرەتاییەکانن.

See also : Perr gorup.
Prisoners dilemma See :Game theo-
Ry.

## Privatization تایبەتیکردن (*الخصخصة*)

بریتیە لەپرۆسەی گواستنەوەی خاوەنداریی پرۆژەو پشکی کۆمپانیاکان لەخاوەنداریی دەوڵەت و ژێر دەسەڵاتیەوە بۆ خاوەنداریی‌و دەسەڵاتی تایبەتی هەروەك بۆ نموونە، لەپیشەسازییەکانی غاز و پۆلا و پەیوەندییە سیمی و بێ سیمیەکان و پشکەکانی دەوڵەت لەکۆمپانیای نەوتی بەریتانیدا ڕووی دا هەروەها گواستنەوەی پشکەکانی کۆمپانیای فۆلکسواگن بۆ جەماوەر لەئەڵمانیای ڕۆژئاواداو گواستنەوەی خاوەنداریی زۆر پرۆژە لەئەڵمانیای ڕۆژهەلات لەو کاتەوەی کەیەکێتیی ئابووریی‌و دراوی لەگەڵ ئەڵمانیای دیموکراتیدا ئەنجام دراوە لەیەکی تەمموزی 1990. لەوانەیە تایبەتیکردن هەر یەك لەم شێوانە بگرێتەوە: دەرکردنی پشك بۆ جەماوەر و کڕینی کارگێڕیی کۆمپانیاو فرۆشتنی لەئەنجامی دانوستانی ڕاستەوخۆوە بەیەك بەرهەمهێنەری تایبەت یان زیاتر، وەك پرۆسەی فرۆشتنی خانووەکانی دەسەڵاتی ناوخۆیی بۆ کرێگرتەکان لەسەردەمی حکومەتە پارێزکارەکاندا بەسەرۆکایەتی تاتشەر.

See also :Nationalization.

## ئەو گریمانە تیۆریی و پەیڕەوییە سەرەکییانەی کەتوێژینەوە پشتی پێ دەبەستێ (*الافتراضات النظرية والمنهجية الاساسية التي يستند اليها البحث*) Problematic

زاراوەکە بەشێوەیەکی گشتی بەرامبەر یەکێك لەماناکانی ـــ نموونەیە ـــ (Paradigm)، ئەو گریمانانە دیاری دەکات کە کۆمەڵێك نوسەر دایدەنێن کە لەناو چوار چێوەیەکی هاوبەشدا کار دەکەن. بەم شێوەیە ڕەخنە گرتن لەنموونەی شیکردنەوەی ڕامیاریی لەوانەیە کە چڕ بێتەوە لە لاوازییەکی دیاریکراوی وا دانراودا لە (گریمانە مارکسییەکان) یا (گریمانە فرەییەکان) دا.

See also :Methodolog :paradigm (b) :
Kuhnian usage.

## گۆڕان بەرەو ئاستی پرۆلیتاریا (*التحول الى مستوى الشغلية*)
## Proletarianization

پرۆسەیەکە تیایدا ڕەگەزەکان لەچینێك یاچینەکان لەچینەکان لە چینی ناوەند یاجوتیاراندا، مەڵبەندێکی کۆمەڵایەتی یا ئابوریی بۆ کرێکاران بەدەست دێنێ یا هەڵوێست و بەهاکانی کرێکاران پیشان دەدا.

مارکسیەکان هەندێك جار زاراوەکە بۆ وەسفی لایەنێك لەجەمسەرگیریی چینایەتی چاوەڕوانکراو لەژێر سایەی سەرمایەداریدا بەکاردێنن، ئەوەش کەزۆر باوە ئەوەیە کەمە دەبێتە بەشێك لەلێکدانەوەکانی مارکسیزم بۆ فاشیزم کاتێك کەبۆرجوازیەتی بچوك و ڕەگەزەکانی چینی جووتیاریی کەئەم پرۆسەی گۆڕانە لەبارودۆخی قەیرانی ئابوریدا هەڕەشەی لێ دەکا،دژی دیموکراسیەت دەوەستنەوە.

See also:Fascism ; Marxism ; social
Class.
Proletariat See: Social class.

## propaganda پڕوپاگەندە (*الدعاية*)

بریتیە لەپەیوەندیکردنی قایلکەرانە لەرێگەی هەر ئامرازێك کە لەبەردەستدا بێ و ا
رێکخرابێ تا بە ئاراستەی دیاریکراو لەپێشدا ئەو رایانە بگۆڕێ سەبارەت بەهەندێك
بابەتی دیاریکراو کە گوێگرەکان هەڵی دەگرن بۆ ئەو پروپاگەندەیە بەتایبەتی
لەرێگەی ناوەڕۆکی سۆزداریی ئەو نامەیەوە نەوەك بابەتی. هەندێك توێژەرەوە
لەپێناسەکردنی پروپاگەندەدا زامنی ئەو بیرۆکەیە دەکەن کەپێویستە بەرەو هاندانی
کار ئاراستە بکرێ سەرباری پتەوکردنی را یا گۆڕینی. ئێستا زاراوەکە زیاتر بۆ لاقرتێ
پێکردن بەکار دێ نەك وەسفکردن.

**See also: political coounication ;**
**Rhetoric.**

## Peoportional Representation (*التمثيل النسبي*) نواندنی رێژەیی

سستمێکی دەنگدانە دروست کراوە بۆ هێنانە کایەی ئەنجامێك کە بەوردترین شێوە
نوێنەرایەتی پشتگیریی رێژەیی بەخشراو بەرواڵەتێکی دیاریکراو لەپاڵێوراوان دەکات
(ئەم رواڵەتە بریتیە لەئینتیمای حیزبی لەهەڵبژاردنە گشتییەکاندا) .
سستمەکانی نواندنی رێژەیی لە هەڵبژاردنە نیشتیمانییەکاندا بەگشتی بە بازنە
هەڵبژاردنیە فرە ئەندامەکان پشت دەبەستێت وەلەقەبارەدا نزیکەی شەش کورسییە
بۆبازنەیەکی هەڵبژاردن لەچوار چێوەی وولاتدا وەك لەئیسرائیل هەیە.چەندە بازنە
هەڵبژاردنییەکەش گەورەتر بێت لەرووی ژمارەی کورسیەکانەوە، ئەوا هاوکێشەکە
وردتر دەبێ لەنێوان پشکی دەنگەکان و پشکی ئەو کورسییانەی کە هەر حیزبێك
بەدەستی دێنێ. ئەو سیستمە هەڵبژاردنیانەی کەپشت بەدەنگدانی بەباشتر زانین
دەبەستن،وەك سیستمی یەکدەنگی قابیلی گواستنەوە لەکۆماری ئێرلەندەدا،لەوانەیە
لەراستیدا ببێتە هۆی ئەنجام گەلێك لەرووی نوێنەرایەتی کردنی حیزب لەئەنجومەنی

یاساداناندا، کەزیاتر رێژەییە لەسیستەمەکانی زۆرینە بەڵام زۆربەی سیستەمە بەباشتر زانینــەکان وا دروســت نــەکراوە کــەزامنی هــاوجووت بــوونی پتــەوی نێــوان پــشکی کورسیەکان و ئەو دەنگانە بکەن کە حیزبەکان بەدەستی دێنن.

ناکۆکیەکیشهەیەسەبارەت بەزیادکردنی سیستەمەکانی نواندنی رێژەیی بۆ هەڵبژاردنی ژمارەی ئەو حیزبانەی کە کورسیان بەدەست هێناوە لەئەنجوومەنی یاساداناندا، بەم شێوەیە ئەمە لەهەنـدێ وولاّتـدا بەشـداری دەکـا لـەناجێگیربوونی حکومیـدا (کۆمـاری ڤایمار لەئەڵمانیا پاش شەڕی جیهانی یەکەم وئیتالیا و فەرەنسا) هەر چۆنێك بێ ئـەوا سیستمی هەڵبژاردن تەنها یەك هۆکارە لەناو ئەو هۆکارە زۆرانەی کەکار دەکاتە سـەر ژمارەی ئەو حیزبانەی کەقابیلی گەشەکردنن لە سیستمی رامیارییدا. بوونی بەربەستە هەڵبژاردنییەکان لـەزۆر وولاّتـدا کەسیـستەمەکانی نوانـدنی رێـژەیی جێبـەجێ دەکـەن (وەك بەربەستی پێنج لەسەدا لەئەڵمانیا) ژمارەی ئەو حیزبە بچوکانە کەم دەکاتەوە کە دەتوانێ کورسی لەئەنجومەنی یاساداناندا زامن بکات.

دەوڵــەت ئەوروپییــە رۆژئاواییــەکانیش بێجگــە لەبــەریتانیا و کۆمــاری نێرلەنــداو فەرەنسا جۆرێك لەنواندنی رێژەیی بەکار دێنن لەهەڵبژاردنە نیشتیمانییەکاندا.

**See also :d,Hondt Method ; droop Quota ;electoral quota ; electoral sys-Tem ;Hare –Niemeyer Mrthod ;list sys-Tem ; preferential voting;single trans-Ferable votesystem.**

**Protectionism See ; Free trade.**

## Protectorate (*المحمية*) پارێزراوگە

هەرێمێکە لەیاسای نێو دەوڵەتیدا هەنـدێك رواڵـەتی دەوڵـەتی سـەریەخۆیی هەیـە

بەلاَم لەلایەنەکانی ترەوە سەر بە (دەوڵەتی پارێزەرە)، ئەم پاشکۆیەتیەش تایبەتە بەپەیوەندییە دەرەکیەکیەکانی دەوڵەتە پارێزگاروگەکە. زۆر جاریش پەیوەندیی نێوان هەردووکیان لەڕیی پەیماننامەیەکەوە رێك دەخرێن بۆنموونە، تونس هەتا ساڵی1956پارێزراوگەیەکی فەرەنسا بوو.

**See also :State treaty.**

## پرۆتۆکۆل (أ) مەراسیم

## Protocol (البرتوكول (أ) المراسم) Ceremonial

جۆرێکە لەڕێساکانی رێزکاریی کەلەسەری رێکەوتوون بۆمەبەستە حکومییەکان یا ڕەسمیەکانی دەوڵەت دانانی باڵوێزخانەکانو سەردانە ڕەسمییەکان و شێوەکانی دواندنی لێپرسراوانی دەوڵەت و خشتەکانی پێشینەیی (وەك لەکەژاوە ڕەسمییەکاندا).

**See also : Convention (a) the institution.**

## پرۆتۆکۆل (ب)

## Protocal (b) ; (البرتوكول (ب) المعاهدة) Treaty

شێوەیەکە لەڕێکەوتن لەنێوان نوێنەری دەوڵەتەکاندا کەپێش دەربڕینی هەرە ڕەسمی دەکەویٚ. لەم جۆرە رێکەوتنە لەپەیماننامەیەکدا یا برگەکانی پەیماننامەکە خۆی پێك دێنێ یا دەبێتە پاشکۆیەکی نهێنی لەپەیماننامەیەکی بلاَوکراوەدا (وەك پرۆتۆکۆلە

نهێنییەکانی پەیماننامەی 1339 ی نێوان یەکێتی سۆڤیەت و ئەڵمانیا سەبارەت بەئایندەی پێشنیازکراوی زەوییە پۆلەندییەکان و دەوڵەتەکانی بەڵتیق... هتد) .

See also :Pact;treaty.

## Proxy بریکار *(الوكيل)*

کەسێکە ڕاسپێراوە کەدەنگ بدات لەباتی کەسێکی تر بەپێی ئەو هەڵبژاردنەی کەپێشتر دەربڕاوە بۆ کەسە بزرەکە. دەکرێ کەزاراوەکە بەسەر ئەو دەنگەشدا جێبەجێ بکرێ کەبریکارەکە دەیدات.

## لێکۆڵینەوەی دەنگدان و هەڵبژاردنەکان *(دراسة الاقتراع والانتخابات)* Psephology

لێکۆڵینەوەی دەنگدان وهەڵبژاردنەکان بەتایبەتی سەبارەت بەو هۆکارانەی کەدەکرێت بپۆرێن لەگەڵ ئەوەشدا کەزاراوەکە لەبەکارهێنانی فراوانەکەیدا بەسەر لایەنە یاساییو کردەییەکانی هەڵبژاردنیشدا جێبەجێ دەبێ. وەلەپەرەسەندوترین بوارەکانی زانستی ڕامیارییە بەهۆی ئەو سروشتە دیارو سەیرەی هەڵبژادن و ڕاپرسییە گشتییەکان بەهۆی ڕادەی بەرزی بایەخی گشتی ڕۆژنامەکان بەدەنگدان و هەڵبژاردنەکان و هەروەها بەهۆی گونجانی دەنگدان و هەڵبژاردنەکان بۆ شیکردنەوەی بەراوردیی وشیکردنەوەی ئاماریی لەهەمانکاتدا.

دوو سەرچاوەی سەرەکیی زانیاریی هەن بۆ لێکۆڵینەوەکانیدەنگدان و هەڵبژاردنەکان سەرچاوە ڕەسمییە بڵاوکراوەکانیش گرنگن ئەگەر چی ڕادەی وردەکارییەکان تیایاندا جیاوازە لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر. ئەمریکاو ئەڵمانیا زانیارییەکان لەسەر ئاستی گەڕەك پێش کەش دەکەن، دەسەڵاتە ئەڵمانییەکان

لەڕێگەی ئامارە نوێنراوە ڕەسمییەکانەوە،ئامار بەبڕیارەکانی دەنگدان بڵاو دەکاتەوە لەوانەش زانیاریی وەرگرتن لەسەر نیازەکانی دەنگدان کەبەپێی تەمەن و توخم و ئاین پۆلێن کراون. سەرچاوەی سەرەکی تریش زانیارییە تەندروستیەکانە لەوانەش زانیاری وەرگرتنەکانی نیازی دەنگدان و دەرخستنی بڕیاری دەنگدان (زانیاری وەرگرتن لەدەرەوەی مەڵبەندی دەنگدان بەڕاستەوخۆ بۆ وەرگرتنی وەڵامەکان کاتێک کەدەنگدانەکە هێشتا لەیادەوەری وەڵامدەرەوەکاندایە و پێی دەوترێ (زانیاری وەرگرتنی بەجێ هێشتن) .پاشان زۆر شێوەی جیاواز بەکاردێ لەشیکردنەوەی ئاماریی بۆ دەرهێنانی زانیاریی مانادار سەبارەت بەهەڵبژاردنی دەنگدانەکە بۆ نموونە بەڕواڵەتە کۆمەڵایەتی و ئابورییەکانی دەنگدەران و داتاشینی پۆلێنکارییەکان و پەرەپێدانی تیۆرەکان.

See also:Election; panel study :sur-
Vry;votion.

**Public Administration**     **بەڕێوەبردنی گشتی (الادارة العامة)**

بەڕێوەبردنی گشتی ئەو ناوەیە کە بەو بەشەی توێژینەوەی رامیاریی دەوترێ کەسەبارەت بەپرۆسەی ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی بەردەوام لەو دەزگایانەدا کەبڕیارەکان هەر دوو لق یاسادانان و دادوەریی لەحکومەتدا جێبەجێ دەکات لەگەڵ پەیوەندییەکانی نێوان لقە یاسادانانی و دادوەریی و کارگێڕیەکاندا. زاراوەکە بەگشتی وەسفی گۆرەپانی لێکۆڵینەوە دەکات سەرەڕای ئەوەی لەوانەیە بۆ وەسفی چالاکیی بەڕێوەبردنیحکومی خۆیشی بەکاربهێنرێت.

جیاکردنەوەی (رامیاریی) لە (بەڕێوەبردن) گونجانی تیۆرییە ئەوتۆ پتەویی پەیوەندیی کرداریی، چالاکی بەڕێوەبردنی گشتیش تێکەڵ بەڕامیاریی دەبێ لەزۆربەی قۆناغەکانیدلو توند و تۆڵ بەدانانی ڕامیارییەکانەوە پەیوەند دەبێ لەداڕشتنی

یاسادانانیدا سەبارەت بەدەسەلآتە یاسادانانییە رێپێدراوەکان. بەڕێوەبردنی گشتی گەشەی کردووە وەك گۆڕەپانێکی توێژینەوەی دیار لەڕووی ناوەوە، لەدەیەکانی ناوەڕاستی سەدەی بیستمدا. لەبەریتانیادا تەوژمی سەرەکی لەلێکۆڵینەوە رامیارییەکان خۆیانەوە هاتووەو لەبایەخی ورد بوونەوەی درێژ لەکاری دەزگا بیرۆکراتییە حکومییەکانەوە سەرچاوەی گرتووە. ئەم بایەخەش لەئەنجامی زیاد بوونی کایەو ئالۆز بوونی حوکمی نوێوە سەری هەڵداوە، بەڵام بەتایبەتی لەگەشەی بایەخی رێگەی خزمەتی مەدەنیی کارکەر بەکاتێکی تەواوە دروست بووە وەلەپێویستی ئەندێشەکراو بۆ پەرەپێدانی هاندەرەکان و پێوەرەکانی هەڵسەنگاندنی چوستی و بەرپرسیارێتی لەکەرتی گشتیدا.

ئەم هۆکارانە گرنگ دەرکەوتوون بەتایبەتی کاتێك کەدەزگا ئابورییە تایبەتیەکانی لەوەو پێش (وەك پیشەسازییەکانی خەڵوز و کارەبا) خراونەتە ژێر چاودێریی حکومەتی نیشتیمانییەوە. گەشەی لێکۆڵینەوەی بەڕێوەبردنی گشتی لەئەمەریکادا بەشێوەیەکی گەورەتریش پشتی بەستوە بەهەوڵدان بۆ پەرەپێدانێکی زانستی گشتیی بۆ بەڕێوەبردنی گشتی و ئەو بەڕێوەبردنەی کەدەکرێ جێبەجێ بکرێ بەسەر رێکخستنی گشتی و تایبەتدا. بەهاتنی دەیەی شەستەکان چەقی بایەخی شیکردنەوە لەهەر دوو چێوەکەدا رۆڵی بیرۆکراتیەت لەجیهانی گەشەسەندوودا لەخۆ دەگرێ لەپەرەسەندنەکانی ڕووداوەکان و جێبەجێکردنی تیۆری هەڵبژاردنی گشتی و شیکردنەوە مارکسیەکان بۆبەڕێوەبردنی گشتی لەکایەی هێزو کۆتە کۆمەلآیەتییەکاندا دەگرێتەوە. لەو گرفتە سەرەکییانەی کەلیی دەکۆڵرێتەوە: رێکخستنی خزمەتگوزارییە کارگێڕییەکان و دەست بەسەرا گرتنییان. دانانیکارمەندەکان و مەشقپێکردنییان و پلەبەرزکردنەوەیان. دانانی بوودجەو نەخشە رێژکردنی تایبەتکردنی دەرامەتەکان و پەیوەندییە جێبەجێکردنیە – یاسادانانییەکان و گرفتەکانی بیرۆکراتیەت.

See also;Bureaucracy ;delegated leg-
Islation;executive ;nationalization;
Policy ; policy nntwork ;politicalde-
Velopment ; public choice theory.

## Pulblic Choice Theory تیۆری هەڵبژاردنی گشتی (نظرية الاختيار العام)

بریتیە لەجێبەجێکردنی رێگەکانی ئابوریی کلاسیکی نوێ بەسەر بڕیارەکانی نابازاڕدا بەمەبەستی لێکدانەوەی دروست کردن و بەردەوامیی ڕەگەزە بنەڕەتییەکانی دەوڵەت و کۆمەڵگا (شێوە بیرۆکراتییەکان و سیستمەکانی مافەکانی خاوەنداری....هتد) لەڕێگەی شیکردنەوەی هەڵبژاردنی ئەقلانی بۆ بەرژەوەندیی کۆمەڵەکان.

## Public Goods شمەکە گشتییەکان (السلع العامة)

شمەکی گشتی سودێکە کە ئەگەر پێشکەش کرا ناکرێت ڕابکێشرێتەوە لەو تاکانەی کەهاوبەشی ناکەن لەدابینکردنیدا. هێزەکانی بازاڕ ناتوانێ کەئەم جۆرە شمەکانە پێشکەش بکات چونکە بەکار بەرە ئازادەکان هیچ هاندەرێك بۆ بەرهەمهێنەکان پێشکەش ناکەن نموونەی شمەکی گشتی ڕووت بریتیە لە (فەنار) چونکە کەشتییەکە زانیاریی دەریاوانی گرنگی دەست دەکەوێ لە تیشکەکەی جا ئەگەر خاوەنانی کەشتییەکە بەشدارییان کردبێ لەدابین کردنیدایان نا،.بەلأم لەوانەیە کە شمەکی گشتیی ڕووت زۆر نەبێ (یا بەتایبەت ڕووت)، دەکرێت کەهەنگاوی جیاواز بنرێ بۆ کەمکردنەوەی سروشتی گشتیی فەنار.بەلأم ئەم هەنگاوانە لەوانەیە تێچوونی زۆر بێت. ئەگەر نەکرێت کەشمەکێکی گشتی بکشێنرێتەوە ئەوا وەسف دەکرێ کەناتوانرێت وازی لێ بهێنرێت.هەروەك چۆن فەنار وا وەسف دەکرێ کە (قەرەباڵغ

نـاکرێ) چـونکە بەدەسـت هێنـانی سـودەکان لەلایـەن کەشـتیەکەوە نابێتـە هـۆی کەمکردنەوەی ئەو سودانەی کـە کەمینـەکانی تـر هەیانـە.شمـەکی گشتی گرنگیـەکی گەورەی هەیە لەشیکاریی ڕامیاریدا، گرنگترین کارەکـانی حکومـەتیش وەك (بـەرگری نیـشتیمانی) و چـوار چـێوەی ئابوریو،یاسـاو نیـزام و سیـستمی ڕامیـاریی خـۆی) هـەموویان شمـەکی گـشتین. مـشتو مـڕی ڕامیـاریی لـەدەرەوەی ئەمـە سـەبارەت بەسروشتی ئەو شتانەی ترە کە ناتوانرێت لەلایەن چـالاکیی تایبەتـەوە بەشێوەیەکی گونجاو دابین بکرێ. بەو ئاستەی کەپێویستە دابینکردنی حکومەتی تیادا بکرێ.

هەروەك چۆن ئەگەری سود وەرگرتنی بێ کۆت و بەند لەشمەکە گشتییەکان گەلێك پرسیاری بنەڕەتیش دەوروژێنێ سەبارەت بەسروشتی چالاکیی ڕامیاریی.مادەم کاری کۆمـەڵی (لەلایـەن حیـزب و سەندیکاوکۆمەڵەکانیفـشارو. . .هتـد) تێدەکۆشـێت بـۆ کارکردنـە سـەر دابینکردنـی شمەکـە گـشتییەکان ئـەوا سـودە ڕاسـتەوخۆ بەدەسـت هاتووەکان بۆ هەمووان فەراهەم دەبێت.جا ئەوە بەپێشکەش کردنی دەرامەتەکان بێ بۆدەزگاکان یان نەکردنی. لەوانەیە ئەمە نەبوونی کاری کۆمەڵی لێك بداتەوە لەپێناوی بەدیهێنانی هەندێك بەرژەوەندیی دیاریکراودا.بـەلأم تیـشکیش دەخاتـە سـەر زۆر لـەو لێکدانەوە باوانـەی بـۆ بـوونی ئـەو ڕێکخراوانـەی کەهـەوڵ ئـەدەن شمـەکی گـشتییان دەسـت بکـەوێت.وە بـۆ سـەیرکردنی گفتوگۆیـەکی سروشـت ئایندەییانـە دەکرێـت بگەڕێینـەوە بـۆ کتێبـی م.ئۆڵـسۆن بەناونیـشانی (لـۆژیکی کـاری کۆمـەڵی:شمەکـە گـشتییەکان و تیـۆری کۆمەڵـەکانThe Logic of Goods and (Collective Action: public) theTheory of Groups، کەچاپخانەی زانکـۆی هارڤـارد لـە کـامبردج (ماساشوسـتس (دەر کـردووە لەسـاڵی 1965دا.

**See also ;Externality ;game theory ; Public choice theory;rational choice analysis.**

## Public Opinion رای گشتی *(الرای العام)*

ئەو رایانەیە کەهەندێك لەجەماوەر تیایدا هاوبەشن واتە ئەندامانی کۆمەڵێك لەدانیشتوان یاکۆمەڵگایەك یا یەکەیەکی رامیایی تر سەبارەت بەمەسەلەیەك کەجیی مشتومڕو ناکۆکیە. لەهەندێ پێناسەدا زاراوەکە تەنهابەستراوە بەڕاوە لەو مەسەلانەدا کەبایەخێکی رامیارییان هەیە- بۆیە ئەو بایەخی (گشتیی) هەیە. لە هەر بارێکدا لەوانەیە هەر مەسەلەیەك کەرایەکی گشتی لەسەر هەبێ بەبڕێکی پێویست بێتە ناو گۆرەپانی رامیارییەوەو دان بەوەدا دەنێ کەهەندێك بەشی جەماوەر لەوانەیە رای بەرهەڵستکارانەی هەبێ (لەم بارەشدادەکرێکە ئاماژە بە (هاوسەنگیی رای گشتی لەبەرژەوەندیی مەسەلەی (س) دا) بدرێ وە زۆر لەئەندامانی جەماوەر لەوانەیە ئاگایان لەزۆر مەسەلە نەبێ ئەگەر ئاگاشیان لیی بێ ئەوا وەك پێویست گویی پێ نادەن تا رایەك هەڵبگرن. ئەو پرۆسانەی کە رایەکی گشتی پێ پێك دێ کەدەپێورێ و دەگەیەنرێتە دەسەلاتە رامیارییەکان، وەلامدانەوەی دەسەلاتەکانیش بۆ رای گشتی هەموویان مەسەلەی بایەخدارن بۆ زانستی رامیاریی. رۆڵی سەرکردەکانی را و بەکار هێنانی رووپێوەکانی نموونەکان و لێکۆڵینەوەکانی پەیوەندیکردنی رامیاریی نموونەی ئەو بابەتانەن کەسەبارەت بەلێکۆڵینەوەی رای گشتیین.

**See also; Opinion Leader ;politcal Communication ; propganda.**

## Purge پاکژکردن ـ پاکتاوکردن *(التطهیر)*

پرۆسەیەکە تێیدا ئەندامانی کۆمەڵێك دەردەکرێن (جا هیحیزبێکی رامیاریی یا

جولانەوەکی پیلانگێڕیی، یا ئەنجومەنی یاسادانان یالیژنەیەك بێ)، چونکە کارەکانیان یا ڕاکانیان بەنەویستراو یاناپاکانە دانراوە لەلایەن هەمان کۆمەڵەوە یا لەسەر کردەکانیانەوە یا کۆمەڵێکی لقیی گرنگەوە. ئەم دەرکردنەش بەوە پاساو دەدرێتەوە کەپێویستە بۆ پاراستنی بەهاکانی کۆمەڵەکە یا بۆ پتەویی ڕێکخراوەیی. لەوانەیە پاکتاوکردن لەڕێگەی بەکارهێنانی ڕێوشوێنەکانی دادگاکانەوە بێ یابە بەکار هێنانی دەرکردنی حوکمە دادوەرییەکان بەسەر کۆمەڵێکدا یا بە مەرسومێکی سەرۆکایەتی یا لەسێدارەدان یا بەرێگەکانی تر.

لەگەڵ ئەوەشدا کەپاکتاوکردنەکان پەیوەندن بە ڕامیاریی سیستەمە تاکییەکانەوە بەتایبەتی ستەمکارانەکان،بەلأم بەتەنها لەم جۆرە سیستمانەدا نیە پارتی کرێکاران لەبەریتانیا ناو بەناو پاکتاوکردنی پیادەکردووە لەدژی ئەو کۆمەلأنەی کەبەنەگونجاو دانراون لەگەڵ ئامانجەکانیحیزب و بیروباوەڕەکانیدا .نموونەکانی تریش بریتین لەڕێ و شوێنەکانی هیتلەر لەدژی پۆلیسی نهێنی لەساڵی1934 دا ئەو پاکژکردنە جیاوازانەی کە ستالین پیادەیکردوون لەیەکێتی سۆڤیەتداو گۆڕانکارییەکان لەسەکردایەتیی لەهەر دوو حیزبی کۆمۆنیستی هەنگاری و چیکۆسلۆڤاکیدا پاش ئەوەی کە یەکێتی سۆڤیەت هەر دوو وڵاتەکەی داگیر کرد لەساڵی 1956و1968 دا.

## هەوڵی کودەتا (*محاولة الانقلاب*) Putsch

بریتیە لە هەوڵی دەست گرتن بەسەردەسەلأتی ڕامیارییدا بەشێوازی توندوتیژو ناشەرعی. کە زۆر جار ڕەگەزەکانی هێزە چەکدارەکان بەشداریی تێدا دەکەن لەسەربناغەی پیلانێکی نهێنی.

هەوڵدانە سەرنەکەوتووەکان بریتین لەهەوڵی کودەتای کاب لەئەڵمانیا لەساڵی 1920دا و هەوڵی کودەتای هیتلەر- لودیندورف لەباڤاریا لەساڵی1923 دا لەگەڵ چەندین هەوڵی کودەتایی لەفلیپین لەماوەی سەرۆکایەتی خانم ئەکینۆدا. بەلأم

کودەتـــای ئەفـــسەرە میـــسرییەکان لەســـاڵی 1952 دا نموونـــەی کودەتایـــەکی سەرکەوتووە.

**See also : Coup d,etat ; palace revolu-
Tion ; revolution.**

# Q

## Questionnaire ڕاپرسی (الاستطلاع)

زنجیرەیەك پرسیاری وردە بۆ بەكارهێنانی لەرووپێوەكانی نموونەكان و لێكۆڵینەوەكانی دەستەكان و چاوپێكەوتنە درێژەكان و شێوە جیاوازەكانی توێژینەوەی كۆمەڵایەتی. لەوانەیە پرسیارەكان لەڕاپرسییەكەدا (كۆتاییان كراوە بێت) واتە دەرفەتی وەڵامی سەربەستیان تیابێ بەتەواوی یا (كۆتاییان داخراو بێت) كە تەنها ڕێگە بەهەڵبژاردنی وەڵامێك ئەدا لەو وەڵامانەی كە سنوردارن و پێشتر دیاریكراون.

بەگشتی ڕاپرسی ڕێگە دەدات بەتۆماركردنی وەڵامەكان (لەوانەیە تۆماركردنەكە بە بەكارهێنانی ئامێری تۆماركەر یا ئامرازێكی ئۆتۆماتیكی یا بەنووسین بێت) یالەلایەن كەسێكەوە بێت كەچاوپێكەوتنەكە ئەنجام ئەدات یا لەڕێی یاریدەدەرێكەوە یا وەڵام دەرەوەكە خۆی لەكاتی وەڵام دانەوەی ڕاپرسیەكەدا بۆ خۆی.

سەرەڕای تۆماركردنی وەڵامەكانیش ئەوا ڕاپرسی پێویستی بەدەرخستنی هەندێك وردەكاریی هەیە سەبارەت بەوەڵامدەرەوەكە وەك ناو و تەمەن و ناونیشان و ڕەگەزی كەسەكەو پیشە... هتد و باری چاوپێكەوتنەكە وەك كاتەكەی و مێژووەكەی و شوێنەكەی.

دروستكردنی ڕاپرسییەكە هۆكارێكی یەكلاكەرەوەیە چونكە دروستكردنی خراپە لەوانەیە كار بكاتە سەر پشت بەستن بە ئەنجامە بەدەستهاتووەكان. هەروەهادارشتنی پرسیارەكان (پەنهانی و لایەنگیریی) و بەكارهێنانی پرسیارەكانی پشكنینی جێگیریی ناوخۆیی‌و لەبەرچاوگرتنی ئەو پەڕی كاتی پێویست بۆ ماوەی چاوپێكەوتنەكە هەموو ئەمانە گرنگە. پێش پەیرەوكردنی ڕاپرسییەكە هەندێك جار

چاوپێکەوتنەکە هەموو ئەمانە گرنگە. پێش پەیرەوکردنی ڕاپرسییەکە هەندێك جار لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لەوەڵامدەرەوەکاندا تاقیکردنەوە دەکرێت بەم پرۆسەیەش دەوترێ (ڕۆپێوی پێشەنگ) کە بۆ ئەوە دروست کراوە ئەو گرفتانە بدۆزرێتەوە کە چاوەڕوانکراو نین وەك پرسیارە پەنهانەکان یا ڕاپرسییە زۆر درێژەکان.

See also: Survey

## Quorum (*النصاب*) نیساب

ژمارەیەکی دیاریکراوە بەلانی کەمی ئەندامانی دەستەیەکی ڕامیاریی (وەك ئەنجوومەنی یاسادانان) کەبەپێویست دادەنرێ کە ئامادە بن تا کۆبونەوەی ئەو دەستەیە دروست بێت. لەکاتێکدا کەبەرەنگاریەك هەبێ پێویستە کە ژمارەی ئامادەبووان بژمێردرێ تا بزانرێ کە ئایا نیساب بەدەستهاتووە یان نا.

لەهەندێك باردا لەوانەیە کۆبوونەوەکە بەردەوام بێ بەبوونی ژمارەیەکی کەمتر لەئامادەبووان ئەگەر نیسابەکە تووشی بەرەنگارییەك نەبوو یادەستەکە لەمشتومڕی خۆی بەردەوام دەبێ بەڵام بڕیارەکان وەرناگرێو دەنگ نادات لەکاتێکدا کەنیساب بوونی نەبێت. لەئەنجوومەنی نوێنەراندا لەئەمەریکا نیساب بەزۆرینەی سادەی ئەندامەکانە کە ئەویش چل نوێنەرە لەئەنجومەنی گشتی و سێ ئەندام لەئەنجومەنی لۆردەکان.



## Race  ڕەگەز (العرق)

کۆمەڵێکە لەخەڵك وا دادەنرێ کەلەڕەچەڵەکی هاوبەشدا بەشداری دەکەن و بەگشتی بنەچەیەکی جوگرافی تا ڕادەیەك هاوبەشی لێکچوویان لەڕواڵەتی سروشتی و مێژوو کلتورو زمانی هاوبەشدا هەیە. ئەم کۆمەڵە ڕواڵەتانە بواری دیاریکردنی (ڕەگەز) دەڕەخسێنێ لەگەڵ مەودایەکی فراوانی جۆری کۆمەڵەکاندا لەیەك خێزان بۆ هەموو مرۆڤایەتی.

لەبەکارهێنانی باودا مانای مەبەست بەزەحمەت جیا دەکرێتەوە لەباوەڕی (ڕەگەز پەرستی) بەوەی کە جیاوازییە کلتورییەکان زۆر کارتێکراو دەبن بە هۆکارە بۆ ماوەییەکان زاراوەکە هەندێك جار بەکار دێ بۆ شیکردنەوەی ڕامیاریی بۆ جیاکردنەوەی کۆمەڵەکان بە بەکارهێنانی نیشاندەرە گشتییەکانی بنەچە. لەبەریتانیادا فۆرمەکانی سەر ژمێریی دانیشتوان ئەم جۆرانەی بەکار هێناوە: سپی،ئەفریقی،عەرەبی،چینی،هیندی.... بۆ نموونە، زۆرێکیش لەتوێژەرەوەو شیکەرەوەی ڕامیارییەکان خۆیان لا دەدەن لەبەکارهێنانی ووشەی (ڕەگەز) و قسەکردن لەسەر (کۆمەڵە ڕەگەزییەکان) بەباشتردەزانن کەزاراوەیەکی هاو شێوەیە لەمانای بنەڕەتی و جێبەجێکردندا بەڵام بەگشتی ماناکەی بریتیە لەجیاوازیی کلتوریی بەبێ نیشانەی دیاریکردنی بۆماوەیی.

زاراوەکە بەگشتی ئاماژەیە بەو مەسەلە ڕامیاریانەی کە لەئەنجامی بوونی ژمارەیەك کۆمەڵ (ڕەگەزیی) جیاوازەوە سەر هەڵدەدەن لەکۆمەڵگایەکدا دەستەواژەی (ڕامیاریی ڕەگەز) ئەم مەسەلانەش پەیوەندییە ڕەگەزییەکان و جیاکردنەوەی ڕەگەز، پەرستی لەهەر دوو بواری گشتی و تایبەتی و ڕامیاریی کۆچ و دانی مافی هاوولاتێتی بەکۆچبەرەکان و ئاڕاستەکردنی بانگەوازە هەڵبژاردنییەکان بەرەو هەستە

هەڵبژاردنییەکان دەگرێتەوە.

لەهەندێ وولاّتی تردا دەزگای حکومیو رێکخراوی دامەزراون کەلەلایەن حکومەتەوە کۆمەك دەکرێ بۆ پاڵپشتی کردنی پەیوەندییە رەگەزییە گونجاوەکان بۆ لێکۆڵینەوە لەسکالاّکانی جیاکاریی نامەشروع و ....لەبەریتانیادا لیژنەیەك بۆ یەکسانیی رەگەزیی ئەم ئەرکانە لەئەستۆ دەگرێت.

See also; Facism :nationalism ; political
Culutre ; political integration;ra-
Cism.

## Racism رەگەزپەرستی - راسیزم - (العنصرية)

باوەڕ بوون بەوەی کەجیاوازیی نێوان کۆمەڵە (رەگەزییەکان) رێگە بەرەفتاری جیاکەرەوەیی دەدات بۆ ئەو کۆمەلاّنەو ئەندامەکانیان. ئەم جۆرە باوەڕبوونەش زیاترە لەهەڵوێستێکی دوژمنکارانە لەدژی هەر ناناشناییەك و هەمیشە بەهەندێك فراوانکردنی گرنگیی جیاوازیە (رەگەزییەکان) پاڵپشت دەکرێت.

دەکرێت کەئەم کارانە نمایش بکرێن : ئەم جۆرە جیاوازییانە بە بۆماوەیی دیاریکراون، و چەندین ئاستی جۆراوجۆری پەرەسەندن یاخۆگونجاندن لەگەڵ چەندین ژینگەی سروشتی جیاوازدا دەنوێنن، بوونیشیان لەکۆمەڵگایەکدا رێگە لەهەر جووت بوونێکی رامیاریی گونجاو دەگرێت، جیاوازییە رەگەزییەکانیش لەنێوان کۆمەڵگاکاندا رێگە لەپەرەسەندنی هەر تێگەیشتنێکی رامیاریی هاوبەش دەگرێت. هەندێك هەوڵیش لەئارادایە بۆ زیاتر پاڵپشتکردنی ئەم جۆرە رایانە لەبیرە زانستییە ساختەکاندا کەمێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی نۆزدەهەم زاراوەی Racialism ) زۆر جار بەکار دێ وەك هاومانەیەکی زاراوەی (Racism) کاتێکیش کەهەندێك جیاکردنەوە دەبێت لەنێوانیاندا ئەوا زاراوەی یەکەم بەمانای باوەڕ بەجیاوازیی رەگەزیی دێ

لەکاتێکدا زاراوەی دووەم وەسفی ئەو باوەڕە دەکات کە کاری جیاکاریی لەڕووی ڕەگەزییەوە پاساو دراوە. بەڵام زاراوەی (R acialism) هەروەها بەکار دێ بۆ ناونانی ڕەفتاریی جیاکەرەوەیی ڕەگەزیی جا ئەوە لەباوەڕ بوون بە ڕەگەز پەرستیەوە هاتبێ یان نا. لێکدانەوەی ڕواڵەتەکانیش لەنێوان توێژینەوە دەروونییەکانی کەسێتی و شارەزاییەکانی فێربوون بەناو وەسفە مێژووییەکانی کۆلۆنیالیزمدا دەڕوات تا دەگاتە گریمانە فەرمانییەکان لەڕووی پێویستی بەبوونی جۆری دیاریکراوی کۆمەڵە لقییەکان لەشێوە جیاوازەکانی سیستمی کۆمەڵایەتیوئابووریدا. لێکۆڵینەوە ئەزموونییەکان ئاماژە بەوە دەکات کە گرژی ڕەگەزیو چالاکی جیاکاریی لەماوەی قەیران و چوونەیەکی ئابووریدا زیاد دەکەن،بەتایبەتی لەو کۆمەڵانەدا کەبارودۆخیان تووشی مەترسی دەبێت، ڕەگەزپەرستی، وەك ڕواڵەتێکی دیارو ئاشکرا لەڕامیاریدا، بەگشتی پەیوەست دەبێت بەو سیستم و دەزگایانەی وەك ئەوەی ئەڵمانیای فاشیستیو ڕەگەزپەرستیی باشوری ئەفەریقا و ئەمەریکا (تا سەردەمێکی نزیك بەلایەنی کەمەوە). بەڵام ڕەگەزپەرستی ڕواڵەتێکی ئاشکرای زۆر سیستمی ڕامیارییە لەکۆنترۆڵەکانی کۆچی جیاکاریی و بەربەستە دەزگاییەکان لەڕووی یەکسانی لەبەشداریکردنی نێوان کۆمەڵە ڕەگەزییەکان، هەروەها گرنگە لەبەهێزکردنی وەلامدانەوەکاندا نموونەی بەرنامەی پەیوەندییە ڕەگەزییەکان و یاساکانی دژایەتیکردنی جیاکاریی.

**See also; Ethnocentrism ;fascism ; Natinalism ; political ; politcal Integration ; race ; xenophobia.**

## Radicalism ڕادیکاڵیزم (*الراديكالية*)

زاراوەکە لەووشەی (Radix) ی لاتینییەوە داتاشراوە کەمانای ڕەگەو وەسفی هەر بیروباوەڕێك دەکات کەدژایەتیی دابو نەریتە باوەکانی ئێستا دەکاو هەوڵی بەدی هێنانی بەرنامەیەك لەگۆڕینی بنەڕەتی ئەدات و کۆت و بەندەکانی ڕێی ئەو گۆڕینە ڕەت دەکاتەوە. بەم شێوەیە دەکرێت کەڕەگەزپەرستی ڕواڵەتێك بێت بۆئایدۆلۆژیا ڕاستڕەو یا چەپڕەو یاهەتا میانڕەوەکانیش بێت بەپێی سروشتی کۆمەڵگا وسستمی حوکم کەهەوڵەکانی گۆڕان تیایاندا دەدرێت.

See also: Ethnocentrism ;fascism ;
Natinalism ; political culture ;political
Integration;race ;xenophobia.

## شیکردنەوەی هەڵبژاردنی ئەقلانی

## Choice Rational Analysis (*تحليل الاختيار العقلاني*)

بریتیە لەلێکدانەوەی ڕووداوە کۆمەڵایەتی و ڕامیارییەکان وەك ئەنجامەکانی هەڵبژاردنە ئەقلانییەکانی تاکەکان یابەشێوەیەکی مشتومڕو ووردبینەرانە تر، بۆ ئەو کۆمەڵانەی وەك خێزان یا کۆمپانیاکان یا دەوڵەتەکان. کەڕواڵەتەکانی بارێکی یەکەمی کورت دەکاتەوە بەشێوەیەك کەئەمانە لەخۆدەگرێت : ئەو کۆت وبەندە (سروشتی و ئابووریو...هتد) یانەی کەهەن وسەربەخۆن لەو هەڵبژاردنانەی کەئێستا لەبەر دەستدان و بەشێوەیەکی گونجاو بۆ تاکەکان و وێناکردنەکانی سەرجەم پەیوەندیدارەکان وێناکردنەکانی ئەو حاڵەتەو ڕێکخستنی ئەو باشتر دانانەی کە تاکەکان هەڵیدەگرن سەبارەت بەمەودای ئەنجامەکراوەکان. وا دادەنرێ کەتاکەکان هەڵیدەگرن سەبارەت بەمەودای ئەنجامەکراوەکان. وا دادەنرێ کەتاکەکان ئەو کارنەی هەڵبژێرن بەمەبەستی مەزەنەکردنی بەدی هێنانی باشتر دانانەکەیان لەوبارە وێناکراوەدا، و ئەنجامەکەش بەدەرخستنی شێوازی سەرهەڵدانی لەکارلێکی کارە

هەڵبژێراوەکان بەشێوەیەکی ئەقڵانی لەلایەن تاکەکانەوە لێك دەدرێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کەئەنجامی گشتی لەوانەیە چاوەڕوانکراو یا مەبەست یاویستراو نەبێت لەلایەن ئەو تاکانەوە.

لەوانەیە ئەو ڕواڵەتانە، بەگشتی ترین شێوە،لەو وەسفە گێڕانەوەییە ئاساییە زۆرانەی ڕامیاریدا و لەزۆر لەمشتومڕە ڕۆژانەکانیشدا بوونی هەبێت. بەلام ناونانی (شیکردنەوەی هەڵبژاردنی ئەقڵانی) تەنها بەندە بەو شیکردنەوەیە کەبەشێوەیەکی هۆشیارانەو خۆییانە لەو شێوە لێکدانەوەیەدا چڕ دەبێتەوەو بایەخ دەدا بە جێبەجێکردنی شێوازە نیزامییە ڕووتەکان. ئەوانەی کەبەتوندی دژی ئەم ڕێبازەن بونیاتگەرەکانن و هەروەها ئەوانەی وای دادەنێن کەئەقڵانیەتی مرۆڤایەتی بەدەگمەن ڕووبەڕووی دەبینەوەو خەریکە بەهیچ شێوەیەك نابێتە دیاریکەری ڕووداوە ڕامیارییەکان.بەگشتی چەندین خەمی هاوبەش هەیە سەبارەت بەباری لێکدانەوەی هەڵبژاردنی ئەقڵانی. لەزۆر جێبەجێکردنی ئەم ڕێگەیەدا،بۆ نموونە، ڕوون نیە کە ئایا نیازەکە پێوانەییە یا وەسفییە: ئایا ئەوەمان پێ دەوترێ کەپێویستە تاکەکان بیکەن یا لێکدانەوەیەکیان دەخرێتە بەردەم بۆ ئەوەی کەبەڕاستی دەیکەن لەبەر ئەم هۆیەو (چەندین هۆی تر) هەڵسەنگاندنی ڕێگەکە زەحمەت دەبێت لەبەر ڕۆشنایی پێوەرەکانی وەك توانای ساختەکردن. هەندێك نوسەر (هەڵبژاردنی ئەقلانی) و (هەڵبژاردنی گشتی) و (هەڵبژاردنیبەکۆمەڵ) و (تیۆرە ئابورییەکانی ڕامیاریی) بەکار دێنن وەك ناونانی ئاڵوگۆڕکراوی هەمان ڕێبازی گشتی لەشیکردنەوەی ڕامیاریدا. بەلام هەڵبژاردنی ناونانێکی دیاریکراو وەسفیشتێکی ڕوون دەکات لەگرفتە مەڵبەندییەکاندا یا لەئامرازەکانی ڕەفتارکردن لەگەڵیدا.

## گۆڕینی پەیوەندی (تغيير الولاء) Realignment

پرۆســەیەکە  کەتیایــدا کۆمەڵــەکانی دەنگــدەرانی پەیوەنــد بەکۆمەڵگایــەکی کۆمەڵایەتییــەوە (وەك چــینێکی کۆمەڵایــەتی یــا کۆمــەڵێکی ڕەگــەزیی یائــایینی یاپەیوەندیەکی هەرێمی) پشتگیریی هەڵبژاردنی درێژخایەنی لــەحیزبێکی ڕامیارییــەوە دەگوێزرێتەوە بۆ یەکێکی تر لەســەر بنەمایــەکی تــا ڕادەیــەك درێــژ خایــەن، ئەمــەیش لەئەنجامی سەر هەڵدانی لێك ترازانێکی کۆمەڵایەتی تر. نموونەی ئەم کارەش دەبێتــە هۆی پەیوەنییەکی هێزی جیاواز لەنێوان حیزبەکان لەسیستمی حیزبەکاندا (پرۆســەی جێگرتنەوەی پارتی کرێکاران بۆپارتی ئازادیخوازان بــەو پییــەی کەبەرهەڵستکارێکی سەرەکی پارێزگارانە لەهەڵبژاردنەکانی بەریتانیادا پاش شەڕی جیهانی یەکەم) .

**See also :Critical election ;dealign-**
**Ment ; electoral volatility ;party identi-**
**Fication**

**ڕیالیزم (ا) : ڕیالیزمی زانستی (*الواقعية (أ) الواقعية العلمية*)**

**Realism**
**Scientific**
**realism**

بریتیــە لــەو ڕایــەی کــەدەڵێ تیــۆرە زانــستییەکان دەکرێــو دەبــێ کــەوا حــوکمی بەسەردا بدرێت بەوەی کە نواندنی ڕاست یا ساختەی جیهــانن نــەوەك تــەنها ئــامرازی کاریگەربن بۆ دانانی پێشبینییەکان. بەتوندیش دژایــەتیی هەڵوێــستی واقیعیدەکات بۆ نموونە، ئەوانەی کەوای دەبینن هیچ هۆیەك نییــە بــۆ هــەڵێنجانی ڕاســتی سیــستمە تیۆرییــەکان لەوردییــە پێــشبینیکارانەیان یــاگۆڕینی تیــۆرێکی زانــستی پــێش وەخــت پەســەنکراو بــەتیۆرێکی تــر کــەناکرێت بەشــێوەیەکی مــاقوڵ وەســف بکرێــت کەبریتیــە لــەزیادبوونێك لەمەعریفــەی ڕاستەقینەدا. مــشتومڕی نێــوان هــەردوو ڕای ڕیالیــستی و

پراگماتیکی لەبارەی مەعریفەی زانستیدا چڕ دەبێتەوە. ئەمە لەکاتێکدا ئەو ناوەڕۆکی ڕەفتاری توێژینەوەی زانستیشی هەیە. ڕیالیزم بەچڕکردنەوەی توێژینەوە لەدیاردە ڕاستەوخۆ تێبینیکراوەکانەوە دەگۆڕێ بۆئەو میکانیزمە شاراوانەی کەئەم جۆرە دیاردانە بەرهەم دێنن. ووتراوە کەڕای ڕیالیستی گرنگە لەزانستە ڕامیاریی و کۆمەڵایەتییەکاندا. سیستمە ڕامیارییەکان لەکۆمەڵێك میکانیزمی ئاڵۆزی جێی سەرنج پێکدێ بەشێوەیەك کەهیچ گونجانێك لەنێوان دیاردە ڕاستەوخۆ تێبینی کراوەکاندا پیشان نادات. لەبەر ئەمە ئەوا کردنی ووردیی پێشبینیکارانە بەخاڵی سەرەکی لە توێژینەوەی زانستیدا بەپێچەوانەی ویستراوەوە دێت. گرفتی سەرەکی لەم ڕایەدا ئەوەیە کەدەبێت ئامرازێك دابین بکات بۆ دابڕکردنی میکانیزمە شاراوەکان و دیاریکردنیان لەکاتی نائامادەبوونی دەرفەتی تاقیکردنەوەی دەست بەسەرداگیراو.

See also:Behaviouralism ;falcia-
Tionism paradigm (b) : Kuhnian usage ;
Positivism; verification.

**ڕیالیزم (ب) :ڕیالیزمی ڕامیاریی**

**Realism (b)** ***(الواقعية (ب) :الواقعية السياسية)***

**Political**

**Relaism**

بریتیە لەو ڕایەی کەدەڵێ ڕامیاریی هێزو هەوڵ بۆ بەدی هێنانی بەرژەوەندییەکان دەگرێتە خۆی نەك یاساو ماف و ئەرکەکان و شیکردنەوەی ڕامیاریی دەبێ بەپێی ئەم ڕێ نیشاندەرانە ئەنجام بدرێت (ڕیالیزم) بەگشتی لەشیکردنەوەی پەیوەندییە نێو دەوڵەتیەکاناندا ڕوو بەڕوو دەبێتەوە،چونکە لەوانەیە نەبوونی سیستمێکی نێو دەوڵەتی سەربەخۆ ئاماژە بەوە بکات کەهۆکارە یاسایی و ڕەوشتییەکان نابێت تەنها کاتێك نەبێت کەدەمامێکێك بۆ بەرژەوەندییە خۆییەکان دابین بکات.ئەو ووشە

ئەڵمانیەش ( Realpolitik)هەندێك جار هاوشێوەی ڕواڵەتە گشتییەكانی ڕیالیزمی ڕامیاریی دائەنرێت بەڵام بەشێوەیەكی ووردتر بەسەر بایەخی پراگماتیستانەدا دەچەسپێ لەهونەری ڕامیاریی كراوەدا.
See also:pragmatism.

## ( Recall (a: The Institution بەخشین لە پایە (الاعفاء من المنصب)

ڕێگەیەكە بەهۆیەوە دەنگدەران دەتوانن ماوەی كاری فەرمانبەرێك كۆتایی پێ بێنن پێش مێژووی دیاریكراوی كۆتایی هاتنی لەدەستور یا لەیاسادا.لەگەڵ ڕێگەكانی تری وەك ڕاپرسیو دەستپێشخەری یاسادانانی ئەوا بەخشین لەپایە ڕێگەیەكە بۆ چەسپاندنی دیموكراسی نوێنەرایەتی ناڕاستەوخۆ لەڕێگەی نوێنەرە هەڵبژێردراوەكانەوە بەدانی دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی دیاریكراو بەدەنگدەرەكان بەگشتی مەرج وایە كەپێش بەخشین لەپایەیەك داوایەك لەلایەن لە ژمارەیەك خاوەن لانی كەم یا دەستەیەكی دیاریكراو لە دەنگدەرە ئامادەكراوەكان بخرێتە ڕوو كەلەماوەیەكی دیاریكراودا پێشكەش دەكرێت. ئەگەر ئەم مەرجە یەكەمییە بەدی هات ئەوا هەڵبژاردنێك ئەنجام دەدرێت بۆ دیاریكردنی كۆتایی هێنان بەكاری ئەوەی كەپایەكەی هەیەو دیاریكردنی ئەوەی كەجیی دەگرێتەوە. ئەمە ڕێگەیەكە كەلەهەندێك دەستوری ویلایەت و دەسەڵاتە ناوخۆییە زۆرەكانی ئەمریكادا هەیەو لەوەو پێشیش بەشێوەی جیاواز هەبووە لەسیستمە ڕامیارییە لاتینی و ڕۆمانییە كۆنەكانداو لەهەندێك كانتۆنەكانی سویسراداو مەسەلەكانی هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنی یاسادانان بەدەنگدان لەسەر هەڵوەشاندنەوەی.
See also: Direct democracy ;initiative.

## Recall (b) بیركەوتنەوە (التذكر)

## Remembrance

بریتیه لەتوانای بیرکەوتنەوەی ڕووداوو هەڵوێستەکانی ڕابوردو. بەم شێوەیە، لەڕامیاریدا،زاراوەکە بەکاردێ بەتایبەتی بۆ وەسفکردنی توانای وەلام دەرەوەکان بۆ ئەو پرسیارانەی کە لەو ڕوو پێوانەدا بەکار دێ کە سەبارەت بەڕا و هەڵوێست و چالاکییەکانیانە.... هتد لەکاتێکی پێشوودا (چۆن دەنگیان داوە لەهەڵبژاردنێکی گشتیی پێشودا) .

See also:Survey.

## Recruitment خستنە سەر ئەندامێتی (*الضم الى العضوية*)

بریتیە لەپرۆسەی دەست خستنی کۆمەڵە ڕامیارییەکان بۆ ئەندامان وەك خستنە سەرێك بۆ کۆمەڵەکە یابۆ جێگرەوەی ئەندامی تر. ڕەنگە ئەم پرۆسانەی خستنە سەری ئەندامێتی پەیوەندی کردنی کەسی و قایل کردن و مەراسیمەکانیخستنە سەرو تاقیکردنـــەوە نیزامییــــەکان و هەڵبـــژاردن و دانـــان و بەرزکردنـــەوە لــــەخۆ بگرێت.پرۆسەکانی کردنە ئەندام جیی گرنگیە لەزانستی ڕامیاریدا بەتایبەتی لەوەدا کەپەیوەنـدی بەلێکۆڵینـــەوەی دەســـتەبژێرەکان و کۆمەڵـــەکانی ســـەرکردایەتی و ڕێکخـــراوە بیرۆکراتیەیـــــەکان و حیزبـــــە ڕامیارییـــــەکان و کۆمەڵـــــەکانی بەرژەوەندی......هتد وە هەیە.

See also: party participation.
Redistribution See :Apportionment.
Redistrictiong See:Apportionment

## تیۆرەکانی شیکردنەوە بۆ ڕەگەزە ساکارەکان
(*نظريات التحليل الى عناصر بسيطة*)
## Reductionist Theories

ئەو تیۆرانەیە کەهەوڵ ئەدات دیاردە ئاڵۆزەکان بەگەڕانەوە بۆڕەگەز سادەترەکان لێك بداتەوە و پێی وایە کە (زیاتر بنەڕەتین) یا (زیاترڕاستەقینەن) باوترین شێوەکانی شیکردنەوە بۆ ڕەگەز سادەکان لەشیکردنەوەی ڕامیاریدا هەوڵ ئەدات کە (قەوارە کۆمەلایەتییەکانی) وەك دەولەت یا کۆمەڵە کۆمەلایەتییەکان یاکۆمەڵگا خۆی بگۆڕێ بۆ کۆمەڵە زانیارییەك کەوەسفی کۆمەڵێك کاری تاکی دەکات کەلیی پێك دێ. ئەم هەولەش بەوە پشتگیریی لێدەکرێ کەدەوترێ هیچ شتێك وون نابێ بەپرۆسەی گۆڕین چونکە قەوارە کۆمەلایەتیەکان تەنها کۆمەڵێك کاری تاکین یاقەوارە کۆمەلایەتیەکان بەڕاستی بوونیان نیە چونکە ناولێنانێکی گونجاوە بۆ هەندێك لایەنی دیاریکراوی تاکەکان.

بەم شێوەیە ئەوەی کەباوەڕی بەتاکگەرایی پەیڕەوی ( **Methodological indivdualist**) هەیە لەوانەیە ببینیێ کە مەسەلەی لەشکرەکان دەبێت کەبگۆڕێت و بەشێوەیەکی گونجاوبەسەریدا ڕاببورێت لەڕووی ئەو تاکانەوە کەلەشکرەکان دروست دەکەن.

ڕەنگە ئەوەش کەباوەڕی بەو فەلسەفەیە هەبێت کەگشت گەورەترە لەکۆی بەشەکان و ئەو تاکانە سەربازن و بیرۆکەی سەرباز هیچ مانایەکی نیە بەبێ تێگەیشتن لەبیرۆکەی لەشکر هەروەك چۆن پێی وایە کەشیکردنەوەی مارکسی شیکردنەوە بۆ ڕەگەزە سادەکان لەخۆ دەگرێت چونکە ڕووداوو پەیوەندییە ئاڵۆزەکان وێنە دەگرێ لەگۆڕەپانی ڕامیارییداو لەڕووی ململانیی چینایەتیەوە.

**See also ; Behaviourlaism ;deterimnism; Explaanation ; Marxism ;positivism ; social ciass ; theory.**

## Referndum ڕیفراندۆم (*الاستفتاء*)

بریتیە لەدەنگدانی دەنگدەرەکان لەدەوڵەتێکدا یا لەیەکەیەکی رامیاریی تردا لەسەر پێشنیاری رامیارییەکی دیاریکراو یا مۆرکردنی دەستکاریی دەستور، وەك ئەوەی کەدەقی دەستوری رێکخراوە رامیارییەدا هاتووە، سەبارەت بەهەندێك رامیاریش (وەك زیاردکردنی قەرزی حکومی لەرێگەی دەرکردنی سەنەدەکانەوەو دەستکاریکردنەکانی دەستورەوە) لەوانەیە وەرگرتنی بریارەکە لەرپی ئەنجامدانی ریفراندۆمێکی تەزیمییەوە بێ. لەهەندێك باری تریشدا رەنگە ریفراندۆم بەهەڵبژاردنی ئەنجومەنی یاسادانان بەکار بێت یابەداوایەکی ژمارەیەکی دیاریکراو یارێژەیەکی دیاریکراو لەدەنگدەرەکان وەك داخوازییەکان ئاماژەبەوە دەکەن. ریفراندۆم سەبارەت بەمەسەلەیەك کەتایبەتە بە رژێمی حوکم، یا ناسنامە و سنورەکانی کۆمەڵگای رامیاریی کەزاراوەی (P lebiscite) پێ دەوترێت لەگەڵ ئەوەشدا کەهەمیشە بەم جیاکردنەوە لەبەکارهێناندایابەندنابێ. لەوانەشە کەئەنجامی ریفراندۆمەکە سەپێنەر بێ بۆ ئەنجومەنی یاسادانان یا راوێژکاران بەپێی بارودۆخ. هەندێك نموونە هەیە سەبارەت بەریفراندۆمەکان لەدەستورەکانی کۆماری فەرەنسی پێنجەم و نەمساو کۆماری ئێرلەندی و زۆر لە ویلایەتەکانی ئەڵمانیا.

**See also;Direct democracy ;initiative;**
**Plebiscite ;recall (`a) : the institution.**

## Regime (نظام الحكم) رژێمی حوکم

زاراوەیەکە وەسفی شێوەیەکی دیاریکراوی حوکمکردن دەکات لەدەوڵەتێکدا وەك پەرلەمانی یاشایینی یا تاکی یاکۆماریی. بەتایبەتیش وەسفی ئەو رێو شوێنانە دەکات کەسەبارەت بەحکومەت یا پێگەی دەسەڵات یا شێوازی وەرگرتنی بریارەکانن.

زاراوەکە بەکاردێ بۆ جیاکردنەوەی ئەم جۆرانەی حوکمکردن لەو دەسەڵاتانەی

کەحکومەت پێك دێنن لەهەر کاتێکی دیاریکراودا، بەم شێویە لەوانەیە دەسەڵاتەکانبەرێگەی ئاشتیانە بگۆڕدرێن بەبێ گۆڕینی ڕژێمی حوکم (لەرێگەی هەڵبژاردن یا بەجێنشینی یا گۆڕینی دیکتاتۆرێك بەیەکێکی تر)، بەڵام ڕژێمی حوکم ناگۆڕێ تەنها بەشێوەیەك لەکاری شۆڕشگێڕانە یا هەڕەشە یا دەستێوەردانی دەرەکی نەبێت. پۆلێنکردنی ڕژێمەکانی حوکم بەپێی پرەنسیپە جیاوازەکان لەدێر زەمانەوە ئەرکێکی سەرەکی بووە لەشیکردنەوەی ڕامیاریدا. هەر یەکە لەئەفلاتون و ئەرستۆ و ماکیاڤیلی لەفەیلەسوفە کۆنەکان و مارکس و لیبست و کریك لەزانا نوێیەکانی ڕامیاریی لێکۆڵینەوەی وایان پێشکەش کردوە کە پۆلێنکاری لەخۆگرتووە کە پشتی بەپێوەری وەك ژمارەی ئەندامە کاراکان لەحوکمی ڕامیاری، و جێگریی ڕژێمی حوکم و سیستمی ئابوریی ڕژێمی حوکم و هەڵوێستی دەسەڵاتەکان لەیاساو ڕامیاریدا دەبەستێت. لەبەکارهێنانی میللیشدا زاراوەکە بۆ وەسفی ماوەی حوکم بەکاردێ (وەك ماوەی حوکمی تاتشەر**T he Thatcher Regime**) ئەگەر چی لەم بەکار هێنانەشدا مەبەست لەوەیە کەماوەی حوکم جیایە لەحکومەتەکانی پێش خۆی بەبوونی جیاوازییەکی گرنگ لەشێوازی حوکمدا.

**See also ; Constitution ; government**
**(a) :the insitutution.**

## گۆڕینی مەعقول بۆ هەست پێکراو (بەرهەست)
## Reification *(تحويل المعقول الى المحسوس)*

بریتیە لەڕا دەربارەی شتێك یا ڕەفتارکردنی وەك شتێکی هەست پێکراو. بەکارهێنانی زاراوەکەیش زۆر جار ئەوە لەخۆ دەگرێ کە ڕا یارەفتارکردن خەڵەتێنەرە یا هەڵەیە. بەم شێوەیە یەك کەس پێی وایە کە (هێز) بریتیە لە پەیوەندیی نێوان ئەو ڕەگەزانەی کەلەوانەیە کەسێکی تری پێ تاوانبار بکرێ بەوەی کەسەرچاوەیەکە بۆ

گۆڕینی (هێز) بۆ شتێکی بەرهەست. زاراوەکە لەزانستی ڕامیارییدا سەبارەت بەو دیدگایەی مارکس بەکار دێ کەپێی وایە پەیوەندییەکانی بازاڕ بە پەیوەندی لەنێوان شتەکاندا دادەنرێ (شمەکە ئاڵوگۆڕکراوەکان) نەوەك لەنێوان کەسەکاندا.

**See also: Ideology; Marxism**
**Reliability See: validation.**

## Replication لەبەرگرتنەوە *(الأستنساخ)*

دووبارە بوونەوەی کۆمەڵێك ڕێ وشوێن یا لەبەرگرتنەوەیان، لەزانستی کۆمەڵناسیشدا بریتییە لەدووبارە بوونەوەی تاقیکردنەوەیەکی پێشو بەپێی توانا لەهەمان بارودۆخدا و لەهەمان سنوردا وەك ڕێگایەك بۆ پشکنینی ڕادەی پشت بەستن بەڕێو شوێن و ئەنجامەکان یاهەردووکیان.

**See also : Exeriment ; validation.**

## Representation نوێنەرایەتکردن *(التمثیل)*

پرۆسەیەکە بۆ یەك کەس یا کۆمەڵێك کە توانای چەسپیووی نیزامیی هەیە بۆ قسەکردن و ڕەفتارکردن بەناوی ژمارەیەکی زۆری کەسانی تر یا کۆمەڵانی ترەوە لەئەنجومەنی یاسادانان یا کۆنفراسی حیزب یا لەدانوستانی لەگەڵ لیژنەیەکدا. لەوانەیە تاك و کۆمەڵەکانی نوێنەرایەتی بکرێن بەگەڕانەوە بۆ هەر لایەنێك یا ڕواڵەتێکیان: وەك پێگەی جوگرافی، یاتوخمی کەسەکە یا پیشەو پەیوەندی حیزبیی...هتد ڕەنگە لەشێوازی هەڵبژاردنی نوێنەرەکان و پەیوەندیان بەوانەوە کەنوێنەرایەتیان دەکەن جیاوازی گەورە هەبێت. یەکێك لەو ڕێگە باوانانەش بریتییە

لەهەڵبژاردن لەلایەن ئەوانەی کەنوێنەرایەتی دەکرێن وەك لەهەڵبژاردنە یاسادانانییە ڕکابەرییەکاندا یا لەهەڵبژاردنی سەرۆکی ئەنجومەنی گشتیو ئەنجومەنی نوێنەراندا. بەلاَم ڕێگەی هەڵبژاردنەکەش لەوانەیە دەبڕینی هەڵبژاردن لەخۆ نەگرێت لەلایەن نوێنەرایەتی کراوەکانەوە.

ڕەنگە پرۆسەی هەڵبژاردنەکە ڕاستەوخۆ نەبێ. وەك لەباری هەڵبژاردنی سەرۆکی ئەمەریکادا کەلەڕێگەی دەستەیەکی هەڵبژاردنییەوە دەبێ. لەوانەشە کەنوێنەرکان لەلایەن دەسەلاَتێکی بالاَوە دابنرێن (وەك پاشا یاحکومەت) بەهۆی توانای گریمانەکراویان بۆ قسەکردنیان لەبری ئەو نوێنەرانە پالاَوتنی ئەندامانی ئەنجومەنەکانی بەڕێوەبردنی حکومی لەبەریتانیا و ئەمەریکا، سەرباری ئەمەش پرەنسیپی (نوێنەرایەتیکردنی کرداریی) ش ئەوە دەگەیەنێ کەبەشێك لەکۆمەڵگا لەوانەیە نوێنەرایەتی بکرێت مادەم بەرژەوەندییەکانی ڕێی پێ ئەدات جا ئەگەر نوێنەرێکی ناونراوی تایبەتی هەبێت یان نا، ئەم هۆیە بەسەر شارە پیشەسازییە نوییەکاندا جێبەجێکراوە لەئینگلتەرای سەدەی هەژدەدا کە هەندێکیان وەك نوێنەری پەرلەمانی هەڵنەبژێراون لەسەر ئەو بناغەیەی کە هەندێك ناوچەی پیشەسازیی نوێنەرایەتی کراون لەبەر ئەوە بەرژەوەندییە پیشەسازییەکان دەنگیان هەبووە. هەروەها بەسەر ئەو داخوازییانە بە (نەدانی باج بێ نوێنەرایەتی) شدا جێبەجێکراوە کە کۆلۆنییە ئەمەریکیەکان پێشکەشیان کردووە لەو ساڵانەدا کەپێش سەربەخۆییان کەوتووە. هەروەك چۆن زاراوەکە لەو سیمینارانەدا بەکار هاتووە سەبارەت بەڕادەی گونجاوی مافی دەنگدان. بۆ نموونە لەو واپیشانەدا کە ژنان بەڕاستی نوێنەرایەتی کراون بەهۆی سەرۆکی نێرینەی خێزانەکانەوە و ئەندامە تەمەن کەمترەکانیش لەکۆمەڵگادا بەهۆی ئەوانەوە نوێنەرایەتی کراون کەلەوان گەورەترن. لەوانەیە نوێنەر ئازاد بێت لەپیادەکردنی حوکمەکان بەسەر بەرژەوەندییەکانی ئەوانەی کەنوێنەرایەتیان دەکات یا باشترین ڕێگەبێت بۆ چەسپاندنی ئەو بەرژەوەندییانە،بەلاَم حوکمەکە بەپێی قەناعەت لەوانەیە کەپرۆسەی بریکاریی یا دەسەلاَت پێدان دیاری

بكات یا لایبەرێت. نوێنەرەكان كاتێك كە بەتاك یا كۆمەڵ دادەنرێن، ئەوا زۆربەی كات بەشداری ناكەن لەرواڵەتەكانی ئەو خەڵكانەدا كەنوێنەرایەتیان دەكەن، كۆمەڵە نوێنەرایەتییەكانیش وەك ئەنجومەنی گشتی لەبەریتانیا (نمونەیەكی نوێنەرایەتی) دەنگدەران لەخۆ ناگرێ بەتایبەتی ئەوەی كەپەیوەندی بەرەگەزی كەسەكەو پێشینەی رەگەزییەوە هەیە،بەم مانایەش دەتوانرێت بوترێت كەژنان و كەمینە رەگەزییەكان بەشێوەیەكی ناتەواو نوێنەرایەتی كراون لەپەرلەماندا.

**See also; Constituency ;delegation ;
Democracy ;election ;electoral ;college;
Manddate ;proprtionalism rpresentation;
Recall (a) :the institution ;sample ;votiong.**

## Republic (*الجمهورية*) كۆمار

زاراوەكە لەو ووشە لاتینییەوە داتاشراوە (**res-publica**) كە بەمانای كارو باری گشتی دێت. ئێستا بەمانای ئەو شێوە حوكمە دێ كە تیایدا سەرۆكی دەوڵەت لەسەر بناغەی بۆ ماوە هەڵنابژێرێ بەڵكو دادەنرێ یا هەڵدەبژێرێ، لەزۆربەی كاتدا بەشێوەیەكی راستەوخۆ و یا ناراستەوخۆ لەرێگەی هەڵبژاردنەكانی هاووڵاتیانەوە یا نوێنەرەكانیەوە دەبێت (بۆ نموونە، سەرۆكەكانی كۆماری پێنجەم لەفەرەنساو سەرۆكە ئەمەریكیەكان بەم شێوەیە هەڵنابژێررێن) بەڵام مەرج نیە كەشێوەی كۆماریی حوكمی دیموكراتی بێت . تەوژمی كۆماریخوازیی ئایدۆلۆژیایەكە كەپێی باشە رژێمێكی پاشایی دیاریكراو هەڵبوەشێتەوە. ئەگەر چی كەمانایەكی كۆنتر هەیە كە بەسەر هەڵوێستەكانی تەوژمی مرۆڤگەرایی مەدەنیدا دەچەسپێ كەپێ لەسەر بوونی حكومەتێكی هاوسەنگ و بایەخدان بەپەیوەستییە مەدەنییەكان دادەگرێت.

## Reputational Approach شیکردنەوەی پشت بەستو بەناوبانگ
**(التمثيل المستند الى السمعة)**

ڕێگەیەکە بۆ لێکۆڵینەوەی ڕژێمە ڕامیارییەکان کەبەگشتی لەقۆناغە یەکەمییەکانی لێکۆڵینەوەی هێزدابەکار دێ.و هەوڵ دەدرێ کەڕای ئەو بەشدارانە بەدەست بهێنرێ کەوا دادەنرێت ئاگایان لەهەر تاك و کۆمەڵێك هەیە کەهێزێکی گرنگیان هەیە لەناو ڕژێمدا. ئەم پەیڕەوە بەوە ڕەخنەی لێ دەگیرێ کەپشت بەچەمکی نا وردو زانیاریی ناورد دەبەستێ کەلەوانەیە بەشدارەکان لەحوکمەکانیاندا بەکاری بێنن.

**See also :Power**
**Revisionism See: Social democracy**

## Revolution شۆڕش (الثورة)

لەزانستی ڕامیاریدا سێ مانا هەیە کەدەکرێ لەیەکتری جیا بکرێنەوە ئەگەرچی کە بەتوندو تۆڵی بەزاراوەی شۆڕشەوە گرێ دراون.

پێناسەی هەرە دیاریکەری زاراوەکە بەکارهێنانی دەبەستێتەوە بەوەسفی گۆڕانێکی کتوپڕ تاڕادەیەك ڕیشەیی لەسیستمی ڕامیاری و کۆمەڵایەتیو ئابورییەدا کە بەگشتی توندو تیژیی تێدا بەکاردێ یا هەڕەشەی بە بەکارهێنانی دەکرێ کەئەمەش سەرچاوە دەگرێ یا بەتوندی گرێدراوە بەچەندین بەشی فراوانی دانیشتوانەوە. ئەم جۆرە شۆڕشانەش تا ڕادەیەك دەگمەن، وەك شۆڕشی فەرەنسی لەساڵی 1798 و شۆڕشی بەلشەفی لەڕوسیا لەساڵی 1917 دا و شۆڕشی چینی 1949دا.

بەکار هێنانی هەرە باو پارێزگاری لەبیرەکانی گۆڕانی کتوپڕ و ڕیشەییو توند لەسستمی ڕامیارییو بەشداریی بەشی گەورەی دانیشتوان دەکات، بەڵام گۆڕانە ڕیشەییە گرێ دراوەکان لەناو سیستمی ئابوری و کۆمەڵایەتیدا وەك مەرجی گرنگ

دانانێ.بەم شێوەیە ئەم پێناسە فراوانە شۆڕشی ئەمریکی 1775-01781) و شۆڕشەکانی فەرەنسا لەسالانی 1870،1848ن1871وشۆڕشە جیاوازەکانی ئەمریکای لاتین دەگرێتەوە.

هەردوو پێناسەکەی سەرەوە شۆڕش لەشێوەکانی تری گۆڕینی توندو تیژی سیستمی رامیاریی جیا دەکەنەوە . چونکە جیاوازە لەشەڕی ناوخۆ کەبەشێکی گەورەی دانیشتوان لەهەر دوولا بەشداریی تێدا دەکەن ئەگەر چی لەوانەیە شۆڕش هۆی کاریگەریی ئەم شەڕە ناوخۆیە بێت (وەك هەردوو شەڕی ئەمریکی و بەلشەفی)، شۆڕش بەشێوەیەکی فراوانتر لەکودەتای چەکدارانەـ پشت بەشێوە جیاوازەکانی (کودەتاو (**Putsch**) یان شۆڕشی کۆشك دەبەستێ،بۆ نموونە) کەدەکرێ ببێتە هۆی گۆڕینی کارمەندەکانی حکومەت نەك گۆڕان لەسستمی حوکمدا یا لەپەیوەندییە کۆمەلأیەتییەکاندا ئەگەر چی ڕەنگە هەندێك لەدەسەلأتەکان هەر گۆڕانێکی توندو تیژی حوکم بەشۆڕش دابنێ–جا ئەگەر گۆڕینی سیستمی حوکم لەخۆ بگرێ یان نا–بەو پێیەی کەشۆڕشە.

پێناسەی سێیەمی شۆڕش مەجازییە بەلانی کەمەوە.وە لەبەکارهێنانەکانی وەك (شۆڕشی پیشەسازیی) و (شۆڕشی کشتوکالّی) و (شۆڕشی ڕۆشنبیریی) پێ لەسەر گۆڕانی کۆمەلأیەتی و تەکنەلۆژیی یا ئابوریی کتوپڕدا (بەشێوەیەکی ڕێژەیی) دەگیرێ کە تیایدا کەرتێکی فراوانی دانیشتوان بەشداری دەکەن. بەلأم گۆڕانەکە وەکو پێویست و لەخۆیدا مەرج نیە بەرهەم هێنەری گۆڕانی ڕامیاریی هاوەلّی بێت.

**See also : Civil war: counter-Revolution ;coup dmetat ; insurrection; Palace revolution ;putsch.**

## Rhetoric ڕەوانبێژی (*البلاغة*)

ڕوونکردنەوە یا هونەری قایل کردن. لایەنە ڕەوانبێژییەکانی پەیوەندی کردنی

رامیاریی هەست و سۆزەکان دەدوێنێ نەوەك ئەقڵ و خۆی لەمانای گەیەنراودا دەنوێنێ لەشێوازی پەیوەندیکردندا نەوەك لەناوەڕۆکی ڕاستەقینەو تیۆریدا. ڕەگەزە سەرەکیەکانی ڕەوانبێژی بریتین لە: بەکارهێنانی خواستن و هەڵبژاردنی و پێچواندن...هتد و بەکار هێنانی نەرم کردنی قسەو خستنە سەر لەنێوان دوو واتای تەواو جیاوازی ووشە یا دەستەواژەکاندا، خستنە بری گریمانە بنەڕەتییەکان، و بەکار هێنانی ئاماژەکانی دەم و چاو ڕێك کردنی شێوازی قسەکردن. لەرامیاریی نوێدا زۆر جار لەچوار چێوەی یاریکردندا ئامازە بەڕوانبێژی دەکرێ واتە ڕاستیو بەرژەوەندییەکانی جەماوەر بە بەرژەوەندییە گوماناوییەکانی ووتاربێژی لا دەدرێ. ئەمەش ڕوانینێکی سادەکراوە چونکە پەیوەندیکردنی رامیاریی هەمووی بەشێکی ناوەڕۆکی ڕەوانبێژانەیەو لەوانەیە جەماوەر وەرگری بەجۆش خود هۆشیاریی بانگەوازە ڕەوانبێژییەکان بێت لەکۆبوونەوە رامیاریی و کۆنفرانسە حیزبیەکاندا وەك نموونە. لەوانەشە کەبەکارهێنانی ڕەوانبێژی وەك بەشێکی پێویستی پەیوەندیی نێوان ووتار بێژوو گوێگران دابنرێت. لەسەردەمە کۆنەکان و سەرەتاکانی سەدەی نوێ دا ڕەوانبێژی بەشێکی گرنگی لێکۆڵینەوەی رامیاریی پێك هێناوە.ڕەنگە لەزانستی رامیاریی نوێدا فەرامۆش کرابێت ئەمە لەکاتێکدا کەمە لەپەیوەندیدارەکان لەدەروونناسیی رامیارییدا جیبیان هەبووە. لەم دواییەشدا ئەم بابەتە گەشاوەتەوە لەڕێگەی شیکردنەوەی دیالۆگی ئایدۆلۆژییەوەو بەزیادکردنی بایەخدان بەڕۆڵی بانگەشەی رامیاریی و داپۆشینی ڕاگەیاندنی جەماوەر بۆ رامیاریی.

**See also: Hermeneutics ; ideology ;**
**Political commnication ; political pasychology;**
**Propaganda.**

## Role (الدور) ڕۆڵ

شێوەکانی ڕەفتارو کومەڵەکانی هەڵوێستەکانی هەڵوێستی چاوەڕوانکراو لەو

کەسانەی کەپایەیان هەیە لەپەیکەری کۆمەڵایەتیدا. زۆربەی کات (ڕۆڵ) لە (بار) Status جیادەکرێتەوە بەشێوەیەك کەزاراوەی دووەم وەسفی هەڵوێستە کۆمەڵایەتییە ڕێژەییەکان دەکات لەکاتێکدا زاراوەی یەکەم وەسفی جۆرەکانی ئەو کارانە دەکات کە لەهەر هەڵوێستێکدا ئەنجام دەدرێت. تاکەکانیش زانینی ڕۆڵەکان و توانای ئەنجام دانیان لەڕێگەی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتیەوە بەدەست دێنن. بەم شێوەیە ڕۆڵە ڕامیارییەکان بریتین لەو ڕەفتار و هەڵوێستانەی کەپەیوەندن بە هەڵوێستە ڕامیارییەکانەوە، وەك پێشەوای حیزب یاسەرۆکی کۆمارو پیاوی دەوڵەتی بەئەزمون و هاندەری ڕامیاریی و نێوانگیری نێو دەوڵەتی. ئەم جۆرە ڕۆڵانە بەتایبەتی ئەو ڕۆڵانەی کە بەشێوەیەکی بەشی یاسا یا دابە ونەریت....هتد دیارییان دەکات بەڵام وەك ڕۆڵێك بەشێوەیەکی گشتی تر بەپێوەرە ناوەکییەکان دەناسرێت.

See also : Attitudes ;norm ;
political behaviour
;status.

## Roll- call Analysis  شیکردنەوەی بەسەرکردنەوە (*تحليل التفقد*)

بریتیە لەشیکردنەوەی تۆماری دەنگەکانی یاسادانەرەکان و ئەندامەکانی لیژنەکان و قازییەکان...هتد ئەگەر چی بۆ لێکۆڵینەوەی ڕاو هەڵوێستە تۆمارکراوەکانیش بەکار دێ وەك زانیاریی تۆمارکردنی دادگای باڵا لەئەمەریکا. شیکردنەوەی بەسەرکردنەوە وەك زانیاریی تۆمارکراوەکانی دەنگدانی بڕیاردەرەکان بەکار دێ بەمەبەستی چەسپاندن و پێوانی هۆکارە شاراوەکانی تایبەت بەبڕیارەکانی دەنگدان، دەکرێت کەشیکردنەوە بۆ بەراوردکردنی کۆمەڵەکانی وەك بڕیادەرەکان بەکار بهێنرێ (وەك پیاوان و ژنان و کۆمەڵە هەرێمییەکان و کۆمەڵەکانی نەوەکان بەپێی تەمەن یا ساڵی هەڵبژاردنی یەکەم) .

See also :Attitudes

## Rule of law حوكمی یاسا (حکم القانون)

بریتیە لەحوکمکردن لەرێگەی ڕێو شوێنە یاسادانانییەکانەوە بە بەراورد لەگەڵ ویستی هەڕەمەکی فەرمانداەرەکاندا . ئەگەر چی کە هیچ کۆتێکی دەستوری نیە کەناوەرۆکی یاسا دیاری بکات بەلاَم پێویستە کە حوکمەکە لەرێگەی یاساو سزا زانراوەکانەوە بێت کەسەپێنەرە بۆ هاولآتیە ئاساییەکان و کارمەندە حکومییەکانیش وەك یەك.

Srr also : Absolutism ;autocracy ; constitutionalsim ; Due process ; judicial: review law (b) : Stipulative law.

## Ruling Class چینی فەرمانڕەوا (الطبقة الحاكمة)

چینێکە کەپایەی بالآدەستیی هەیە لەپیادەکردنی هێزی ڕامیارییدا جابەڕاستەوخۆیی بێت لەرێگەی وەرگرتنی ئەندامەکانی بۆ پلەو پایەی ڕامیارییەکان یا بەناڕاستەوخۆیی لەرێگەی دەستگرتن بەسەر ئەوانەدا کە لەو پلەو پایانەدان. زاراوەکە زۆر جار لەشیکردنەوەی مارکسی و تیۆری دەستە بژێردا بەکار دێ. لەدەیەی پەنجاکانەوە زۆر لەوانەی کەمارکسی نەبوون خۆیان لەبەکارهێنانی ئەم زاراوەیە لاداوە چونکە ڕایان وابوو کە (چین) پەیوەندییەکی توندوتۆڵی هەیە بە بەرژەوەندیە ئابورییەکانی کۆمەڵێکی دیاریکراوەوە و لەرێگەی کاری ڕامیارییەوە (حوکم) دەکات: بەم شێوەیە لەوانەیە زاراوەکە بەئاسانی گریمانەی پەیوەندییەکی جێگیر بکات لە نێوان دوو دیاردەداو سەربەخۆیی مومکینی ڕامیارییەکان بشارێتەوە. زۆرجاریش مارکسییەکان،ئەوانەی دەرك بە گرفتێکی هاو شێوە دەکەن، جیاوازی دەکەن لەنێوان چینێکی هەژموندرادا یان زاڵ بوودا وە لەنێوان چینێکی حکومی

فـەرمانڕەوادا. لەکاتێکیـشدا کـە هـەمان کۆمەڵەکـە زۆر جـار ئـەو دوو ناوەنـدە داگـیر دەکـەن بـەڵام هەنـدێ جـار ئەمـە ناکـات بەرژەوەندییـەکانی چـینێکی فـەرمانڕەوا خشتەکاری رامیاریی دەبەستێتەوە لەکاتێکدا لەوانەیە کە کارەکانی چینی فەرمانڕەوا وردەکاریەکانی بڕیارە ڕامیارییەکانی ناو ئەو کۆتانە بخاتە ڕوو.

**See also :Class ;elite ; hegemony ;**
**Hegemony ; Marxism ;pluralism ; state.**

# S

## Salience زەقبوونەوە (البروز)

سیمای زەقبوونەوە ئاشکرا ئەوەیە کەدەشێ مەسەلەیەکی زەق لەچوارچێوەی مەسەلەکاندا و کارنامە رامیارییەکاندا ببێتە مەسەلەیەکی دەرکەوتوو تارادەیەکی زۆر کارەنگە بەهۆی هەلومەرجی هەنووکەییەوە بێت. لەتیۆری ململانێکان و سازشدا چارەسەری زەق ئەو چارەسەرە دەبێت کە بەشێوەیەکی روون لەچارەسەرە مومکینەکانی دیکە پەیوەندیدار جیابکرێتەوە سەرەرای ئەوەش کەپێویست ناکات بە یەکسانیەوە پەیوەست بێت (بۆ نموونە دابەشکردن بەرێژەیی50-50و بوونی رووبارێک کەزەوییەیەک دابەش دەکات کەناکۆکی لەسەرەیان بوونی هێڵی پانی بنەمایەک بۆ سازدانی شەر راگرتنێک ((هدنە))).

See also;Bargaining Theory ;conflict Approach.

## Sample نموونە (العینة)

بەشێکە لەکۆمەڵێک کە بەدانیشتوان (**population**) دەناسرێت و بەشێوازێك هەڵبژێراوە بکرێت بەوە دابنرێت کە چەند تایبەتمەندییەکی دیاریکراو دەنوێنێت کەخوازراون لەکۆمەڵەکەدا لەناوپلەیەکی پەسەندی ئەگەرەکاندا. قەبارەی نموونەکە بە بەراورد لەگەڵ ئەو دانیشتوانەی کەمەبەستن کار لەپلەی ئەو ئەگەرە دەکات کە ئەو بەیانانەی دەست دەخرێن سەبارەت بەنموونەکە دەکرێ وا فەرز بکرێت کەراست

و دروسـتە بەنـسبەت دانیـشتوانەوە. بڕیـاردانی لێپێـچینەوەکان (الاجـراءات) ی هەڵبـژاردنی نموونـەکان گرنگیـەکی زۆری هەیـە لـەم بـوارەدا. نموونـە خوازراوەکـان لەتوێژینەوەڕوپێویەکاندا (المسحیة) بەشێوەیەکی فـراوان بـەکار دەهێنـرێن لەبـەر ئەوەی دەکرێت بەم ڕێبازە شیمانەکە بەشێوەیەکی ورد هەڵبسنگێنرێت بـەوەی ئـەو بەیانانەی کەدەستخراون نوێنەری دانیشتوانن، دەشێ وێنەی ئەم نموونانە ڕاستەوخۆ لە (دانیشتوان) ەوە بەگشتی بخوازرێن یـان لەچـەند قۆناغێکدا بخـوازرێن، لەوێنـەی نموونەی تیروپشکەکان لەنموونەیەکی هەڕەمەکیبازنەکانی هەڵبژاردنەوە دەرهێنـراون و گەڕەك و بازنەکانی هەڵبژاردن لەڕووی ئەگەری بـوونی بـەوەی بـەگوێرەی قـەبارەی پاڵێوراوەکـان دەپێـورێن کەئەمـەش بەهەڵبـژاردنی نموونـە فـرە قۆناغـەکان نـاوزەد دەکرێت. وەرگرتنـی نموونـەی پشکەکان ڕێبـازێکی تـرە بـۆ دەستخـستنی نموونـەی پێوان: (دانیشتوان) بەسەر چەند گروپێکدا دابەش دەکرێن کەپێشوەخت دیاریکراون (ڕەگەزی کەسەکە وگرووپی تەمەن) وەڵامدەرەوەکان بۆ ئەم نموونەیە زیاد دەکـرێن بـەپێی ئـەم گروپانـە (بـۆ نموونـە بـە پەیوەنـدیکردن بـە ئەندامانی جـەماوەرەوە لـە مەڵبەندێکی بازاڕیدا) هەتا گروپەکە تەواو دەبێت و دوای ئـەوەش قـسە لەگـەڵ وەڵام دەرەوەکاندا ناکرێـت لـەم گروپـەدا.هـەر گـروپێکش لەنموونەکـەدا (بۆنموونـە پیـاوان لـەگروپی تەمـەنی 40–60) دا قەبارەیـەکی نوێنراویـان لـە (دانیـشتوان) پـێ دەبەخشرێت.

See also; Survey.

**Satisficing**

See:Incrementalism.

## Scientific Method ڕێبازی زانستی (الطریقة العلمیة)

کۆمەڵە لێپێچینەوەو پرەنسیپێکی بڕیار دراوە بۆ ئاسانکردنی مەعریفـەو نەهێشتنی هەڵەکان. چەند لقێکی زۆری مەعریفەش هەیە کەبە (زانستەکان) نـاو زەد دەکـرێن و

ڕێباز گەلێکی زۆریش هەن کەپەیوەستن بەهەموو زانستێکەوەو چەند ناکۆکیەکی زیاتریش هەیە سەبارەت بەڕێبازەکە بەلأم لێپێچینەوە زەقەکان ئەمانە دەگرنەوە : پەرەپێدانی تیۆرەکەو، داتاشینی گریمانەکان، و بڕیاردانی تاقیکردنەوەکان و حێبەجێکردنیان بۆ جەختکردنەوە یان هەڵوەشاندنەوەی گریمانەکان،و پەسەند کردنی تیۆرەکەو پوختەکردنی یا ڕەفزکردنی لەژێر تیشکی ئەم تاقیکردنەوانەدا.

ڕەنگە ئەم دوو زاراوەیەش بەدی بکەین (Scientism) واتە (پراکتیکی ڕێبازی زانستی) و (Scientistic)واتە (زانستی) کە پابەندبوون بە بەکارهێنانی ڕێبازە زانستیە سروشتییەکانەوە دەگەین،لەکۆمەڵناسیدا لەگەڵ تێهەڵکێشی گاڵتە ئامێزدابەوەی پابەندبوونەکە هەڵەیەو،بیرۆکەی تایبەت بەڕێبازی زانستی سروشتییەوە بەجۆرێکی نەگونجاو تەسکە یان ئەو ڕێبازە باسکراوانە بەڕاستی لەڕێبازەکانی زانستە سروشتییەکان ناچن.

**See also;' Experiment: explanation:**
**Falsfication ;hypothesis; law (a) :**
**Scientific law :politicalscience ;**
**Theory ;verification.**

## Secession خۆدابڕین ــ جیابوونەوە ــ *(الانفصال)*

خۆدابڕین لەدەوڵەتێك لەلایەنی بەشێك لەدانیشتوانی ناوچەیەك لەو دەوڵەتە کەئارەزوی بنیادنانی دەوڵەتە سەربەخۆکەیان دەکەن یان بەوەی ببنە بەشێك لە دەوڵەتێکیدراوسێ. خۆدابڕین هەمیشە بەدەوڵەتە یەکگرتووەکانەوە پەیوەستە لەو سۆنگەیەوە پشت بە مافە سەپێنراوەکانی هەرێمی دابڕاو دەبەستێت بەپاشەکشەکردن لەیەکێتیەکە یان ئەو بانگەشانەی کەگوایە سروشتی یەکێتیەکە بووەتە زیانبەخش بۆیان بەجۆرێك لەجۆرەکان. لەیەکێتی سۆڤیەتدا لەسەردەمی

گورباتشۆفدا ماقی ڕەسمی خۆدابڕین کەلەبنەڕەتدا دەستوری ستالینی لەخۆی گرتبوو لەساڵی1936دا بوو بە مەسەلەیەکی دەستوری کەسەبارەت بەدەوڵەتەکانی بەلتیق و ئۆکرانیا...هتد، لەنموونەی هەوڵەکانی جیابوونەوەیش هەوڵی جیابوونەوەی یانزە ویلایەتە باشوریە یەککرتووەکەیە لەویلایەتە یەککرتووەکانی ئەمریکا (1860-1861) وجیابوونەوەی سەنگافورەش لەمالیزیا ساڵی 1965و هەوڵی دابڕینی بیافرا لەنایجیریا ساڵی 1967.

**See also: Federation ; separatism.**

## سستمی دەنگدانی دووەم (*نظام الاقتراع الثاني*)
## System Second Ballot

سیستمێکە بۆ هەڵبژاردنی ئەندامان لەئەنجومەنێکی یاسادانان (یان دامەزراوێکی هاوشێوەدا) کەهەمیشە ئەگەری ئەنجامدانی دوو دەنگدانی سەربەخۆ دەگرێتە خۆی ئەمەیش لەسەر بنەمای بازنە تاك ئەندامیەکانی هەڵبژاردن. سەرەڕای ئەوەش ڕێکخستنە سەربەخۆکان لەنێوان سیستمێك و یەکێکی دیکەدا جیاواز دەبن بەلآم مەرجەکانی لەبنەڕەتەوە ئەوەیە کە دەنگدانی یەکەم ببەسترێت و تێیدا هەڵبژاردنی هەر پاڵێوراوێك کەدەستخستنی زیاتر لە 50٪ی دەنگە ڕاستەکان مسۆگەر بکات ڕابگەیەنرێت. وە ئەگەر هیچ پاڵێوراوێك ئەم دەنگە زۆرانەی دەست نەکەوێت ئەوا دەنگدانێکی دیکە لەکاتێکی دیکەدا ئەنجام دەدرێت کەدەشێ هەڵبژاردنەکە تەنها بەسەر دوو یان سێ پاڵێوراوی سەرکەوتوترینی نێوان پاڵێوراوەکانی دەنگدانی یەکەمدا کورت بکرێتەوە و زۆرینەیەکی سادە بەسە بۆ بردنەوەکە. لەماوەی نێوان دوو دەنگدانەکەدا کاتێك دەدرێت بۆ ڕێکخستنی مامەڵەکانی هەڵبژاردن. هەروەها پێویستە تێکەڵی ڕوونەدات لەنێوان سیستمی دووەمی دەنگدانەکەو سیستمی دوو دەنگەکانی هەڵبژاردنی بەکار هاتوو لەهەڵبژاردنە ناوخۆییەکانداو چەند هەڵبژاردنێکی

ویلایەتەکان لەئەڵمانیادا کەنوێنەر دوو دەنگی هەیە دەیاندات لەهەمان بۆهەڵبژاردنی پاڵێوراوی ویلایەتێك و لیستێکی حیزبی کەبەدوایدا دێت. فەرەنسا ئەم ڕێبازەی لەکۆماری پێنجەمدا بەکار هێنا بۆهەڵبژاردنی سەرۆکەکەی هەروەها (جگە لەماوەی ساڵی 1986) لەهەڵبژاردنی کۆمەڵەی نیشتیمانیدا. هەروەك بۆهەڵبژاردنی سەرۆك کۆماری فایماری ئەڵمانیش بەکار هێنراوە.

See also: Electoral system; exhaustive Ballot.

## Sedition هاندان بۆ ئەنجامدانی ئاژاوە (*التحريض على الفتنة*)

چەند کردەوەیەکن ناچنە ناو پێناسە یاساییەکانی خیانەتەوە بەلام لەڕوانگەی دەستور یان یاساکان یاخود دەسەلاتە قەزاییەکانی دەوڵەتەوە بەوە دەژمێردرێت کەدەشێ هاندەری تورەییەکی میللی بێت یاخود هاندەری یاخیبوون دژیدەوڵەت و کاربەدەستەکانی بێت.

See also: Treason.

## Separation of Powers جیاکردنەوەی دەسەلاتەکان (*الفصل بين السلطات*)

ئەو پرەنسیپی پێوانەییە کەپێی وایە ئەرکە جیاوازەکانی دەوڵەت پێویستە کەنەدرێنە وەسیەت بۆ کەسەکە خۆی. یاخود دامەزراوەکە خۆی. کۆپیە نوێیەکەی پرەنسیپەکە لەنوسینەکانی جۆن لۆك و بارون و دومونتسکیۆ وەرگیراوە. دەسەلاتە مەبەستەکانیش هەمیشە ئەمانەن: دەسەلاتی یاسادانان بۆ دانانی ڕێساکان، دەسەلاتی جێبەجێکردن بۆ جێبەجێکردنی ئەم ڕێسایانەو بەڕێوەبردنیان، دەسەلاتی قەزاییش بۆ دڵنیاکردنی تەفسیرە ڕەسمیەکانی ڕێساکان لەحاڵەتەکانی ناکۆکیداو

هــەروەها بەمەبەسـتی دادگـاییکردنی ئەوانــەی بەخراپــەکار نــاو زەددەکــرێن.
جیاکردنــەوەی نێـوان ئــەم دەســەڵاتانە ئامــانجی گرەنتــی پارێزگاریــە لــەئازادی و حوکمییاسا بەقەدەغەکردنی جەختنەکردنە سەری دەسەڵات و هاوسەنگی دەسەڵاتێك لەبەرامبــەر یــەکێکی دیکــەدا و دڵنیــاکردنی هۆکــارە دامەزراوییــەکان بــۆ وەســتاندنی بــەکارهێنانی هێـزو خراپــی بەکارهێناکــەی.. نــاکرێ جیاکــاری نێـوان دەســەڵاتەکاندا بەتەواوی بن. خۆ ئەگەر تەواو بوایە ئەوا نیازە پەنهانەکە بەتاڵ دەبێوە چونکە بوار نەدرا بەهیچ یەکێك لە لقەکانی حکومەت بـۆ ڕاستکردنەوەی خراپــەی لقێکـی دیکــەی دەســـەڵات. ئــەوەی کەجیادەکرێتــەوە تــەنیا (دەســـەڵات) نییــە بــەڵکو شــێوە جیاوازەکانیەتی لەڕۆتینەکەی و مومارەسە دروستەکەی لەڕووی دەسـتوریەوە. وڵاتــە یــەکگرتووەکان خــاوەنی پلەیەکیباڵایــە لــەم جیاکردنــەوە ڕێکخــراوە کەنوســراوە لەدەســتورەکەیدا. لەمەملەکــەتی یەکگرتووشــدا دابڕینــی نێــوان دەســەڵاتەکان تاڕادەیــەکیزۆر ناڕۆشنە: دەسەڵاتیجێبەجێکردن لەئەنـدامانی کـۆنگرەی یاسـادانان پێکدێن و،ئەنجومەنی لۆردەکان و وەزیری داد چەند مەڵبەندێکی قەزایی داگیر دەکەن سەرەڕای بوونی چەند ڕۆلێکی یاسادانانی و کارگێڕیش.

**See also: Authoritarianism ;dictator-**
**Ship ; executive ;jegislaturr ;rulo of law;**
**Sovereigenty.**

## ***separatism*** (الانفصالية) _ جوداخوازی _ خۆ دابڕین

بانگەشــەی ئــەوەی ناوچــەیەکی سروشــتی لــەناو دەوڵــەتێکی دیــاریکرودا بەشێوەیەکی گشتی دانیشتوانێك نیشتەجێی دەبن کـە لـەڕوی ڕەگەزییـەوە جـودان و زۆریەی جاریش لەهەرێمە پەرگیرەکاندا (جەمسەرەکاندا) دەبن و پێویـستە ڕێگایـان پێ بدرێت ببنە بەشێك لەو کۆمەڵگەی سیاسیی ئینتیمایان بۆی هەیە تاحوکمی خۆی

بکات یان بچێتە ناو کۆمەڵگەیەکی سیاسی دیکەوە کەپەیوەندی گرنگی لەگەڵیدا هەیە، ڕەگەزی یان نارەگەزی. مەیلی جیاخوازیانە پەیوەستە بەچەمکی لێکدانێکی سیاسی و نوێنەری ئەو بیرۆکەیە کە کۆمەڵگە سیاسیەکان بەلێکدراوی نامێننەوە ئەگەر ئاتاجیەك بۆ هاوڕایی لەناڕادابێت سەبارەت بە ناسنامەی گونجاو پێکهاتنی گونجاوی کۆمەڵگە. بانگەشەی جودا خوازیانە بەزۆری و ئارادەیەك بەشێوەیەکی ڕوونیش،پشت بەو بیرۆکەیە دەبەستێت کەبریتیە لەوەی دابڕین و جیاکاری ((الانفصال)) لەم حاڵەتەدا یاریدەدەری خولقاندنی چەند کۆمەڵگەیەکی سیاسیە کەخاوەنی بەیەکداچوونێکی باشترن بۆدەوڵەتی بنەڕەتی و ناوچە دابڕاوەکە. بزاڤە جیاکاریەکان لەسەدەی بیستەمدا تەوژمێکی لەبیرۆکەکانی مافی چارەی خۆ نووسینیان بەدەست هێنا (بۆ نموونە چواردە خاڵەکەی ودرو ولسن) و لەناوبردنی کۆلۆنیالیستی.

بزاڤە جیاکارییەکان هەمیشە بۆ بەکار هێنانی هەر ستراتیژێك ئامادە دەکرێن کە بشێ پاڵپشتی مەسەلەکەی بکات و لەوانە بەشداریکردن لەهەڵمەتەکانی هەڵبژاردنداو وتاردان و خۆپیشاندانەکان و توندوتیژی (لەوانەش تیرۆر) و جەنگی ناوخۆو جیابوونەوە. لەنموونەی بزاڤە جیاکاریەکانی سەدەی بیستەم: بزاڤیباسکیەت (ئیسپانیا) ونەزعەی کۆماری ئیرلەندی (ئیرلەندایباکور) و بزاڤی جیاکاری بیافرا (نایجیریا) و بزاڤی جیاکاری کیبیك (کندا) و بزاڤی تامیل (سیریلانکا) .

**See also: Autonomy :nationalism ;**
**political integration ;secession**

## Side Payments (*المدفوعات الجانبية*) دراوە لاوەکییەکان

لەتیۆری یارییەکاندا دراوەکان (المدفوعات) دا بریتین لەو پارەیەی کەیاریزانێك دەیداتە یاریزانێکی ترجگەلە (پەیکەری جەوهەریی) قازانجەکان. سادەترین یاریش ڕێگە بەهیچ سازشێك یان گواستنەوەی قازانجەکان نادات: قازانجەکان بەمەرجەکانی

يارييەكەوە دەچەسپێنرێن وناكرێت جۆراو جۆر بكرێن بەبەخشینی سودەكان لەبەرامبەر هاوكاریو بەگوزارشێكی دیكە ڕێگە نادات بەهیچ بەخشینێكی لاوەكی. ئەم گریمانەیە لەگەڵ بارودۆخە سیاسیەكاندا دژ دەوەستێت كەئەگەری پركتیزە–كردنی تیۆری یارییەكانیبەسەردا دەبێت. خەریكە سیاسەت هەمیشە سازش لەخۆی بگرێت و بەدەگمەن مەسەلەی وەرگرتنی پاداشتەكان بێت لەكارێكی تاك لایەنەوە.دەشێ حیزبێكی گەورەش، بۆنموونە، تووشی ئەوە ببێت برگەیەك بۆ بەرنامە تەشریعیەكەی زیاد بكات لەبەرامبەر وونبونی حیزبێكی بچوكتر سەبارەت بەكێبەركیی هەڵبژاردن لەهەندێك لەو بازنانەی هەڵبژاردندا كەلەڕووی ستراتیژییەوە هەڵبژێردراون. بۆ نمایشی نموونەی ئەم توانایانە پێویستە هەلی دەستخستنی بەخششە لاوەكیەكان بخرێتە ناو تیۆری پێشبڕكێیەكانەوە.

See also : Bargaining Theory ;
game theory ;model

## Simulation (لاسایكردنەوە) (المحاكاة)

هەر پرۆسەیەك بخولقێنرێت یاخود بنوێنرێت بەشێوەیەكی دەستكرد تێیدا هەندێك لە لایەنە سەرەكیەكان بۆ بارودۆخێكی ڕامیاریی گریمانەیی یان فیعلی كە تێیاندا لە كارلێكەكانی ئەم لایەنانە دەكۆڵنەوە بەدەستپێكردنی مەسەلەكە لەسەر بنەمای سیناریۆیەكی ئامادەكراوی پێشوەخت. شێوازی (یاریەكان) شێوەیەكە لەلاساییكردنەوەكە چەندەها جار دووبارە دەبێتەوە لەلێكۆڵینەوەی سیاسەتی نێو دەوڵەتی و ستراتیژی سەربازی، لەكاتێكدا لاسایی قەیرانێكی نێو دەوڵەتی دەكاتەوەو بەشدارانیش چەند ڕۆڵێكی پەیوەندیدار بەماوەی لاساییكردنەوەكەوە دەگرنە ئەستۆ. دەكرێت بەكارهێنانی شێوازەكە وەك هۆكارێك بۆ فێر بوونی پرۆسەكان و دەرئەنجامە مومكینەكان یان هۆكارێك بۆ توێژینەوە لە بەهای یاریزانەكان و كارەكانیان یان هەر

دووکـان. ئـەو ڕاهێنانـەش لەتەلەفزیۆنـدا پـەخش دەکـرێن وایـان لێهـاتووە بـەناوی (گریمانەکان: Hypotheticals)وە دەناسرێن .

لەپێـشبڕکێیەکدا هـەموو یاریزانێـك لەهـەوڵی بەمەزەنـەکردنی دەسـکەوتەکاندایە لەڕووی بەهاکانەوە لەبەر ئـەوە پێویـست نییـە لەسـەر حیـسابی یاریزانـەکانی دیکـە. دەشێ هەندێك شێوەی دیکەی لاسـاییکردنەوە نەگرێتـەوە نیگارگـەکان، لەسـەر ئـەم ڕەگەزە هاندەرە. هەروەها لاساییکردنەوەی نموونە ئەبـستراکتەکان بـە بـەکارهێنانی کۆمپیوتەر بەهاوبەشـیەکی کارلێکانـە لەیاریزانـە مرۆییـەکان یـان بـەبێ بەشـدارییان. دەکـرێ ئـەم پەیوەندییـە ئاڵۆزانـە و شـوێنەواری گۆڕانکاریـەکان لەگۆڕدراوەکانـدا بەشێوەیەکی ئاسانتر حساب بکرێت. دەکرێ لـەدوای ئـەوەش بەئاسـانی بـەراوردی پۆسـە لاسـاییکراوە بەدیلـەکان بکرێـت. نموونـەکانی سـازش و ڕەفتـاری دەنگـدان لەنموونە ئاشکرا زۆر دووبارە بوەکانن.

**See also: Model ; prediction ; Variables.**
**Single party system**
**See: One- party system**

## Single Transferable Vote System ((SVT سیستمی تاك دەنگی (کە دەکرێ بگوازرێتەوە)

***نظام الصوت الواحد ( الممکن الانتقال )***

سیستمێکی هەڵبژاردنە لەهەڵبژاردنە تەشریعیەکانی کۆماری ئێرلەندی و ماڵتا (و لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی ئەورووپی و هەڵبژاردنـە ناوخۆییـەکانی ئێرلەنـدای سـەروودا) بەکار دەهێنرێت وهەروەها دەنگدانی فەزڵدان (التفضيلی) لەبازنەکانی هەڵبژاردنی

فره ئەندامدا بەکار دەهێنرێت. بۆ هەر کاندیدێك یەك دەنگ هەیە بەڵام ئەو دەنگە ئاماژە دەدات بەدانانی ناوی کاندیدەکان بەپێی ڕیزبەندی (1، 2، 3، ... هتد) نەك بە هەڵبژاردنی یەك کاندید و جیاکردنەوەی سەرجەم کاندیدەکانی تر. لەکۆماری ئێرلەندادا بازنەی هەڵبژاردنی سێ ئەندامی و چوار و پێنج ئەندامی هەیە. ئەو بازنانەی هەڵبژاردن کەزیاتر لەپێنج ئەندامیان تێدایە بەشێوەیەکی گونجاو فراوان دەبن و پرۆسەی حسابکردنی ئەنجامی هەڵبژاردنەکە کاتێکی دورو درێژی دەوێت. لەسیستمی یەك دەنگیدا کەئەگەری گواستنەوەی هەیە پشکی هەموو بازنەیەکی هەڵبژاردن دیاری بکرێت. ئەمەش هەمیشە پشکی ڕێگاکان (دروب) ە (واتە کۆی ژمارەی دەنگەکان دابەش دەبن بەسەر زیاتر لەیەکێك لەژمارەی کاندیدە هەڵبژێردراوەکان بەزیادکردنی یەك دەنگ) .

ئەزەلیەتە یەکەمینەکان (**الأفضليات الاولى**) حساب دەکرێن و، هەر پاڵێوراوێك کەپشکەکەی دەست بکەوێت هەڵدەبژێردرێت. وە ئەگەر ژمارەیەکی ناتەواو لەپرۆسەی یەکەمی حسابدا هەڵدەبژێردرێن ئەوا هەر دەنگێکی زیادەی پشکی پاڵێوراوان دووبارە دابەشدەکرێتەوە کاندید لەدوای کاندید بەپێی ڕێژەی دووەمی فەزڵدانەکان (**التفضيلات**) ی دەنگەکان بەگشتی کەئەو هەڵبژێردراوانە دەستی دەخەن. ئەم پرۆسەی دووبارەییەی دابەشکردنەوە بە بەکارهێنانی بەباشزانینەکانی سێیەم و ئەوەی لەدوایەوەیە دووبارە دەکرێتەوە بەگوێرەی پێویستی هەتا ئەو کورسیانە بەتەواوی پڕ دەبن کەلەبازنەکانی هەڵبژاردندا هەن.

سیستمی یەك دەنگی خاوەن ئەگەری گواستنەوە بەشێوەیەکی دیاریکراو داڕێژراوە بۆ هێنانەدی نواندنی ڕێژەیی حیزبەکان (سەرەڕای ئەوەی لەکۆماری ئێرلەندەدا هەمیشە دابەشکردنێکی کورسیەکان بەسەر حیزبەکاندا ئەنجام دەدرێت کە گونجاوترە لەحاڵەتی بەکارهێنانی سیستمی زۆرینەی سادەی بەریتانی) . هەروەك ئەم سیستمە بە زەروورەت سود بەخش نییە بۆ حیزبە بچوکەکان: وە ئەگەر دەنگدەران بەشێوەیەکی گونجاو لەگەڵ یەکتریدا لەهەر بازنەیەکی هەڵبژاردندا ئەوا

هــەر حیزبێــك، پێویــستی بــەپتر لــە ٪20 ی فەرزلدانــەکانی یەکــەم (هەیــە بــۆ مسۆگەرکردنی دەستخستنی هەر کورسیەك لەبازنە چوار ئەندامیەکان. سیستەمەکە گرەنتی ئەوە ناکات کەپالێوراوە هەلبژێردراوەکان دەنگەکان فەزل دەدرێن بەزۆرینەی دەنگ بەسەر پالێوراوە ناهەلبژێراوەکەدا، رێگا بەحیزبەکان یان هاوپەیمانیەکان لەرێگەی حیزبەکانەوە دەدرێت بەوەی دوو پالێوراو یان زیاتر بپالێورێت لەبازنەکانی هەلبژاردنــدا بــەبێ (پــەرتکردنی دەنگــەکان) و پاشــانیش زیــان گەیانــدن بــە هەلومەرجــەکانیان لەبەدەستهێنانی هەلبــژاردنی هــەر کاندیدێکدا. ئــەم سیــستەمە دەســەلاتی دەنگدەر لەبەرامبــەر حیزبــدا زیــاد دەکــات لــەدیاریکردنی ئــەو کەســەی هەلبژاردنەکەی بەئاکام دەگات.

See also Droop quota ; electoral quota:
Electoral system ; preferential voting.

## Social Choice Theory تیۆری هەلبژاردنی کۆمەلایەتی

## (نظرية الاختيار الاجتماعي)

بوارێکە بۆ شیکاریی هەلبــژاردنی ئــەقلانی و جــەخت دەکاتــە ســەر گرفتــی (ئــەرکی چاودێری کۆمەلایەتی) کە بەهۆیەوە دەکرێ بەباشزانینەکانی تاکەکان کۆبکرێتەوە بۆ بەرهەمهێنانی فەزلدانێکی هاوبەش (بۆ نموونە بەسستمە جیاوازەکانی دەنگدان) .
**کنیث ئارۆ** تیۆرێکی بیرکاریانەی پەرەپێدا کە بەناوی (تیۆری ئەگەری گشتی) یان (تیــۆری مــەحالبوون: **نظريــة الاســتحالة**) یــان (تیــۆری ئــارۆ) دەناسرێت و دەریــدەخات کــە بــەبوونی چــەند گریمانەیــەکی پەســەندنکراو بەگــشتی لەمــەڕ (بەباشــزانینەکان) تاکــەکان هــیچ رێگایــەکی تــر نییــە کــەبکرێت بەهۆیــەوە ئــەم بەباشزانینانە کۆکرێنەوە بەبێ پێشێلکردنی ئەو هەلومەرجانەی کەدەوترێت ئەوانە

مەرجە ماقوولەکان بۆ نەبوونی هەرەمەکی و دادگەری بەرجەستە دەکەن. بەشێوەیەکی سیستمانە ئەوە دەردەکەوێت کەبڕیارە تازەکان لەو کۆمەڵانەدا دروست دەبن لە تایبەتمەندیەکانی هەڵبژاردنە تاکیەکاندا هاوبەشی ناکەن کە لێیان پێکدێت، هەروەها گریمانەو شێوازەکان بۆ خۆیان دەشێ بەشێوەیەکی گونجاو هاوڕێك نەبن لەسەر هەردوو دیاردەکە. وە بە شێوەیەکی کرداری پێشنیار دەکرێت کە تەنانەت لەو سیستمە سیاسیانەشدا کەبەباشزانینەکان هاوڵاتیان بەهەند دەگیرێن، ڕەنگە گەیشتن بە هەر بڕیارێك مەحاڵ بێت کە مامەڵەیەکی ناجێگیر یادادوەرانە بەرجەستە نەکات. لەڕاستیشدا (هەڵبژاردنە کۆمەڵایەتیەکان) دادەنرێن و زۆر جاریش بە پەسەندکراو دەردەکەون بەپێی چەند مەرجێك. لەپاشاندا گرنگی بەو هۆکارانە دەدرێت کەخواستە یەکلاکەرەوەکانی تیۆرە سیستماتیکیەکەیان بێ سووك دەکرێت تا سیاسەتێکی پەسەند بهێنێتە دی.

See also : public choice theory ;
Rational choice analysis.

## چینی کۆمەڵایەتی (*الطبقة الاجتماعية*)
## Social Class

بەشێکە لەکۆمەڵگە کەخاوەنی چەند تەرزێکی ڕۆشنبیری هاو شێوەیە و پشت بە بارودۆخی کۆمەڵایەتی و پایەی پەیوەست پێیەوە و هەروەها ئاستەکانی داهات و بەها کۆمەڵایەتیەکان دەبەستێت، لەهەندێك بەکار هێنانیشدا، پشت بە هەستێکی هاوبەش بە ئارەزوومەندی (الهوايه) یان بەرژەوەندی چینایەتی دەبەستێت و، تیۆر گەلێکی جیاواز و چەند پلانێکی پۆلێنکاریانە و پێوەر گەلێکی جیاواز تەبەنی دەکات بۆ دیاریکردنی چینەکان و ئەندامێتی چینەکان. یەکێك لەجیاوازیە سەرەکییەکانیش لەنێوان دیاریکردنی بابەتیانەدایە لەسەر بنەمای سیماکان لەوێنەی بارودۆخی

پیشەیی و داهات و فێرکردن... هتد،و دیاریکردنی خودی لەرێگەی پەیوەستی خودیەوە بە ئەندامی چینەکەوە.

تیۆری مارکسیزم چینەکان لەرووی پەیوەندیە موڵکدارێتی و ناموڵکدارێتیەکانی هۆکارەکانی بەرهەمهێنانەوە پێناسە دەکات هەروەها لەرووی دیاریکردن یاخود دیاری نەکردنی هێزی کاری ئەوانی دی و لەرووی ئەو جۆرە چالاکییە ئابورییەوە کەبەشداری تێدا دەکات. بەم شێوەیە کۆمەڵگەی سەرمایەداری دوو چینی سەرەکی دەگرێتەوە: بۆرژوازی خاوەن سەرمایە یاخود هۆکارەکانی بەرهەمهێنان و کارگەران واتە ئەوانەی سەرمایەیان نییە و بەتەواوی لەسەر کرێی کارەکانیان دەژین. بۆرژوازییەت لەدوای ئەوە بۆ سێ بەشی دابەش دەکرێت: سەرمایەدارە پیشەسازەکان و سەرمایەدارە پارەدارەکان و خاوەن زەویە فراوانەکان. هەندێك جار بەشێوەیەکی تەسك مامەڵە لەگەڵ کارگەرەکاندا دەکرێت بەو پێیەی چینی کرێکاری دەستی پیشەسازی بەرهەمهێن بەلآم بەزۆری بەشێوەیەکی فراوانتر مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت بەو وەسفەی چینی پەیداکردنی کرێ و موچەکانن.

کۆمەڵەی چینەکانی تریش دەگرێتەوە: بۆرژوازیەتی بچکۆلە واتە خاوەن کارە بازرگانیە بچکۆلەکان و خاوەنانی فرۆشگەکان ... هتد و هەژارەکانیش لەوێنەی بێکارەکان و کرێکارە کاتی و پەراگەندەکان، چین یان چینەکانی ناوەندیش کە دەکەونە نێوان چینی نانەزگەکان و بۆرژوازیەتەوە کە کرێکارە یاخە سپیەکان و پیشەییەکان و کارمەندو کرێکارە ناپیشەسازیەکان و ...هتد دەگرێتەوە، هەروەها جوتیارەکان و، ئەرستۆکراتە خاوەن زەویەکان. دیاریکردنی ئەم کۆمەلآنە بەو پێیەی چەند چینێکی سەربەخۆ و دابراون مایەی جەدەلەو زۆرێکیان وا مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت بەو پێیەی چەند چین و توێژێك یان گرۆپێکن لەچەند چینێکی یان گروپێکن لەچەند چینێکی بۆرژوازی و پرۆلیتاری ناسراو بەشێوەیەکی فراوان. نوسەرە نامارکسیستەکان مەیلیان بەلای بەکارهێنانی ئەم کۆمەلآنەو ئاماژە بۆکردنیان بەوەی (چینی کرێکار) و (چینی ناوەند) ن دەچێت.

خاڵی ئاسایی ئەم جۆرە لەشیکردنەوەی چینەکان جا ئیتر مارکسی بن یان نامارکسی بەشێوەیەکی ڕوون بریتیە لەبیناکرنی تیۆرێکی ڕاڤەیی‌کە ئەو دەستە چینایەتیانە بەکار دەهێنێت کە پەیوەندییەکان دەگونجێنێت لە نێوانیاندا لەگەڵ ململانێ سەرەکیە ئامادەکان کە لەکۆمەڵگادا هەن. کەواتە پێویستە چینێکی دیاریکراو لەسەر ئەم ئاراستەیە هێزێکی کۆمەڵایەتی گرنگ لەخۆ بگرێت لەکۆمەڵگە دیاریکراوەکەی خۆیدا، ئایا لەڕێگەی دەستخستنی ئەندامان و هۆشیاری چینایەتی بێت: چەند وێنایەکی هاوبەشی سەنتەرە چیناتیەکەیان (واتە لەزاراوە مارکسیەکاندا، چین و توێژ چین و توێژێکە بۆ خۆی) نەك تەنیا (چینێك بێت لەخودی خۆیدا) یان کاتێك ئەم هۆشیاریە ئامادەیی نەبێت، چونکە هێزە بابەتیەکان لەکۆمەڵگەدا لەڕێگەی پەیوەندیە چینایەتیەکانەوە دەردەکەون. ئەم شیکردنەوە چینایەتیە ڕەخنەی لێگیراوە بەهۆی جەختکردنەوەیەوە، لەکۆمەڵگە پیشەسازیەکاندا بەتایبەتی، لەسەر ئەو فاکتەرنەی کە لەگەڵ بەرژەوەندییە شاراوەکانی ئەو دیو چالاکی ڕامیاریدا هاوڕێك نابن لەبەر ئەوە ناکرێت ببێتە بنەمای کاری هاوبەش، کە ئەمە ڕەخنەیەکە ئاراستەی ئەو ڕایە دەکرێت کە پێی وایە چین فاکتەرێکە خاوەنی هۆشیاریەکی خودیە و نەك چینێك کەهێزێکی بابەتی بێت.

هەر وەك ناونانە چینایەتیەکان لەشیکردنەوەی ڕەفتاری سیاسی و سیما پەیوەستەکانیدا بەکار دەهێنرێن. ئەم ناونانە چینایەتیانەش لەنێوان دابەشکردنێکی سیانی سادەو چینی باڵاو ناوەندو نزمەوە بۆ گرووپە ئەبجەدیە هەرە ئاڵۆزەکان دێن و دەچن کە لەتوێژینەوەکانی بازاڕ و توێژینەوەکانی ڕادا بەکار دەبرێن لەنموونەی (أ) (کارگێڕی باڵاو خاوەن موڵکەکان و خاوەن داهاتە باڵاکان) و (ب 1) (کارگێڕی ناوەندو خاوەن داهاتی ناوەند) و (ب2) (نوسەروکارگێڕەکان و خاوەن داهاتە ناوەندەکان) و (ج) (کرێکارە کارامەکان و خاوەن یەخە سپیەکان وخاوەن نزمەکان) و (د1) (کرێکارە کارامەو خاوەن یەخە شینەکان و داهاتی ناوەند) و (د2) (کرێکارە ناکارامە و یەخە شینەکان و خاوەن داهاتە نزمەکان) و (ه)

(خانەنشینە حکومیەکان و ئەوانەی داوای یارمەتیە کۆمەلایەتیەکان دەکەن.... هتە و خاوەن داهاتە زۆر نزمەکان) .

See also :Aristocracy ;capitalism ; Caste ; elite ; embourgeoisement ; feu-Dalism ; interesest ; Marxism ; plural-Ism; proletarianization ; rulign class;
Contract See : Contract Theory.

## دیموکراسەتی کۆمەلایەتی *(الدیمقراطیة الاجتماعیة)*
## Social Democracy

زاراوەکە لەبنەڕەتدا مانای ئامانجە گشتییەکانی حیزبە سۆسیالیستەکانی بەگشتی دەگەیانـد بەتایبـەتیش ئامـانجی حیزبـە سۆسیالیـستە مارکـسیزمەکانی ئـەوروپا لەکۆتاییـەکانی سـەدەی نـۆزەدەیم و سـەدەی بیـستەمدا. وە لـەدوای دەرکـەوتنی بەلشەفیزم و شۆڕشی 1917 لەڕوسیادا زاراوەکە ئیـدی بـۆ وەسـفکردنی جۆرێك لـە سۆسـیالیزمی چاکـسازیانە و نامارکـسیزمیانە بـەکار هێنـرا کەپالپـشتی دەکـراو بەشێوەیەکی فراوان لەئەوروپای خۆرئاوادا بلاو دەبۆوەو لە پابەند بـوون بەسیـسەتی دیموکراسیەت و بـەڕێوەبردنی ئـابوری سـەرمایەداریی لەبنەڕەتـەوە و مـسۆگەرکردنی یارمەتیـەکانی چـاودێریە فراوانـەکان بەشـێوەیەکی ڕێـژەیی پێکـدەهات. بەمـشێوەیە دیموکراسیەتی کۆمەلایەتی بیروباوەڕە گشتیەکانی زۆرینەی حیزبـە سۆسیالیـستەکان و پرۆلیتاریەکانی دەگرتە خۆی لەنیوەی گۆی خۆرئاواییـدا بـەلام زاراوەکـە بەتایبـەت گرێ درابوو بـە ئامانجـەکانی حیزبـە دیموکراسـیە کۆمەلایەتیـە ئەسکەندەنافیەکان و مومارەسە کردنیان و بە بەرنامەی (گودسبیرگ) کەحیزبی دیموکراسی کۆمەلایـەتی ئەلمانی خۆرئاوایی لەسالی 1959 دا دایمەزراندووە.

دیموکراسـیەتی کۆمەلایـەتی هەنـدێ جـار بـەوە وەسـف دەکرێـت، بەتایبـەتیش لەڕەفزکردنیـدا بـۆ بەلـشەفیزم و دووبـارە تەفـسیرکردنەوەی بـۆ مارکـسیزم لەدەیـە

کەمەکانی سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا، بەوەی (لادەرانەیە:Revisionism) .
(بێگومان زاراوەکە بەشێوەیەکی فراوانتر بۆ هەر ڕاستکردنەوە یاخود تێکدانێکی بیروباوەڕێکی تەقلیدی بەکاردێت) . (سۆسیالیزمی دیموکراسی) هەندێك جار بۆ جیاکردنەوەی ئەو بیروباوەڕە پابەندانە بە ڕێبازو دامەزراوە دیموکراسەکانەوە بەکار دەهێنرێت بەڵام پارێزگاری لەگرنگیدان بەسۆسیالیزم دەکات لەئایدیا دیموکراسیە کۆمەڵایەتیەکانی ئێستادا وەنە.

See also: Bolshevism ; communism ;
Demodracy ; Marxism ; socialism.

## Socialism سۆسیالیزم *(الاشتراکیة)*

عەقیدەیەکە یان مومارەسەیەکی پشت ئەستورە بەو باوەڕەی کەهۆکاری بەرهەمهێنان پێویستە کۆمەڵگە خاوەنی بن و کۆنترۆڵی بکەن، و دەبێ بەرهەمهێنان ئاراستەکراو بێت، لانی کەم بەشێویەکی هەندەکی بۆ پڕکردنەوەی پێداویستیە کۆمەڵایەتیەکان نەك تەنیا بۆ ئارەزووە کەسیەکان دیاریبکرێت و، هەروەها دابەشکردنی پاداشتەکان پێویستە یەکسان بێت یان بەپێی پێوەرێکی کارکردن بێت لەنموونەی کاتی کارکردن یاخود بەپێی پێویستی نەوەك ڕەنگدانەوەی هێزێکی تایبەت و هێزەکانی بازاڕ بێت و، دەسکەوتەی تاکە- کەسی دەستەبەر ناکرێت لەدوای هێنانەدی پێداویستە کۆمەڵایەتیەکانەوە نەبێت. وە هەتا کاتێکی نزیك بەشێوەیەکی ڕێژەیی پابەند بوونی ئەخلاقی هاوڕێی زۆربەی فیکرە سۆسیالیستیەکان بوو لەو ڕایەیدا کەدەڵێت سیستەمە سەرمایەداریەکان و سیستەمەکانی بازاڕ بەس نین و داهاتە سروشتی و مرۆییەکان پەرتەوازە دەکات.
ئەگەر مەسەلەکەش ئاوا بێت ئەوا سۆسیالیزم تێچوونەکانی لەڕووی خۆشگوزەرانی

ماددیەوە بەسەر کۆمەڵگەدا بەگشتی ناسەپێنێت. ئەزموونی ئابووری پلانڕێژکراوش وایکردووە هەر چەندە لەڕووی سۆسیالیستیەوە ناتەوایش بێت، کە ئەم رایە پاڵپشتیکردنی قورس بێت . سەرەڕای دوژمنکاری ڕیشەداری نێوان سۆسیالیزم و سیستمە ئاڵوگۆڕیەکانی بازاڕ وەك دەردەکەوێت چەند هەوڵێك دراوە بۆ پەرەپێدانی شێوازێك لەسۆسیالیزم کە کۆکەرەوەی نێوان موڵکایەتی هاوبەشی هۆکارەکانی بەرهەمهێنانە لەگەڵ دیاریکردنی داهاتەکان و دابەشکردنی بەرهەمەکاندا لەڕێگەی میکانیزمەکانی بازارەوە. نموونەکانی لەمجۆرە بەزۆری بەناوی (سۆسیالیزمی بازاڕ) ەوە دەناسریچت. سۆسیالیزم بووە مایەی دەرکەوتنی چەند شێوە و بزاڤێکی زۆری کێبەرکێکەر کە لەگرنگترینیان سۆسیالیستی تۆباوی و سەندیکایی ئانارشیزمی و سۆسیالیزمی سەندیکایی و مارکسیزمی وبەلشەفی و ترۆتسکی و چاکسازی و (فابییزم) و دیموکراسیەتی کۆمەڵایەتین. (نەتەوەییە سۆسیالیستەکان) چەند هەوڵێکن بۆ خولقاندنی ڕێکخراوێکی چوار چێوە جیهانی بۆ ڕێکخستنی نێوان کارەکانی کۆمەڵە سۆسیالیستییە سەربەخۆکان وبەخشینی زانیاری پێیان. جیاوزیەکانی نێوان مارکسیستەکان و ئانارشیستەکان نەتەوەییە ئەوەڵیەکان یاخود کۆمەڵەی پرۆلیتاری نەتەوەییانەیان هەڵوەشاند ( 1864-1867) , لەدوای گواستنەوەی کۆنگرەکەی بۆ نیویۆرك ڕووخا. ئینتەرناسیۆنالی دووەم لەساڵی 1889 دا دامەزرا و یەکیان پێگرت لەگەڵ ڕەوتی پرۆلیتاریای نەتەوەگەرایی حیزبە سۆسیالیستەکان لەساڵی 1923 دا بۆ پێکهێنانی دەوڵەتگەرایی پرۆلیتاری و سۆسیالیستی کە لەدوای جەنگی دووەمی جیهانی بوو بە نەتەوەگەرایی سۆسیالیستی ئێستاکە. لینینیش نەتەوەگەرایی سێیەمی دامەزراند (کمنتێرن) لەساڵی 1919 دا بۆ پاڵپشتی شۆرشی جیهانی و بەخێرایی حیزبی شیوعی سۆڤیەتی دەستی بەسەردا گرت.. ترۆتسکیش نەتەوەگەرایی چوارەمی دامەزراند لەساڵی 1938 دا لەهەوڵێکیدا بۆ بەرنگاری فاشیزم و ستالییزم.

See also: Anurchism; anarcho Syndicalism : bolshevism ; collecti-Vism ; communism ; exploitation ; Fabianism ; marxism ; social democracy; Utopianism.

## Social structure پەیکەری کۆمەلأیەتی (الهیکل الاجتماعي)

زاراوەی (پەیکەرە کۆمەلأیەتیەکان) هەمیشە ئاماژە بەشیکردنەوەی سیستمە کۆمەلأیەتیەکان لەجۆری وەسفکراو لە دەروزە (stucture) (پەیکەر: بونیاد) دەکەن و باسکردنی (بونیادی کۆمەلأیەتی) بەزۆری ئاماژە بە پۆلێنکردنی تاکەکان دەکات بەگوێرەی بارودۆخە جیاوازەکان لەوێنەی ئەندامێتی چینەکە و باری خێزانی و ئەرکە پیشەییەکان .. هتد.

See also : Classification ; social class; status ; structure.

## Society کۆمەلگە (المجتمع)

زاراوەکە بەشێوەیەکی ئەبستراکت ئەو کۆمەلە بونیادو دامەزراوانە دەگەیەنێت کە پەیوەندی نێوان تاکەکان ڕێکدەخەن بەشێوە ماددیەکەشی ئەو هاوڕێیەتیە بەردەوامەی ئەو تاکانە دەگەیەنێت کەڕۆشنبیریەکی ئاشکراو بونیادێکی دامەزراوەییانە تەحەکوم بە کارلێکەکانیانەوە دەکات. ئاماژەکردن بۆ (کۆمەلگە) لەشیکردنەوەی ڕامیاریدا بەزۆری بۆ دانیشتوانی دەولەتی نوممەتێکە کە لەچەند زاراوەیەکی فراوانتردا لەزاراوەکانی پەیوەندیە سیاسیەکان دەژمێردرێن کە دەولەتەکە بۆ خۆی دەبێت. بەلأم (کۆمەلگە) سەرەڕای ئەوەی کۆمەلێکی فراوانتر لە

پەیوەندییەکان دەگەیەنێت هێشتا بەزەرورەت لەگەڵ سنووری دەوڵەتدا هاوڕێک نابێت.

دەشێ کۆمەڵگەیەک نیشتەجێ ببێت بەبێ ئەوەی خۆی پیشانی هێزی دەوڵەتە بدات (بۆ نموونە هەندێک لەکۆمەڵگە تیرە گەریەکان) هەروەها دەشێ چەند ڕەگەزێکی کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو لەچەند دەوڵەتێکدا نیشتەجێ بن. لەدواهەمین حاڵەتدا کارێکی سروشتیە بەشێوەیەکی گەورەتر بێت، کە پێناسەی کۆمەڵێکی لەم شێوەیە وەکو0ئومەت) یان وەکو (کلتور) ێك بکرێت. ئەوە دەگەیەنێت پەیوەندییە ڕامیارییە هاوبەشەکان لەهەرێمێکی دیاریکراودا، بەشێکە لەدەلالەتێکی ئاسایی زاراوەی (کۆمەڵگە)

زاراوەی (کومەڵگەی مەدەنی) بۆ وەسفکردنی ئەو پەیوەندیانە بەکار دەهێنرێت کە بەشێکن نەك لەبازنەی تایبەتی خێزان بەتەنیا و نە لەبازنەی تایبەتی دەوڵەتیش بەتایبەتیش پەیوەندییەکانی ناو کۆمەڵە خۆبەخشەکان و لەوانەش پەوپوەندییەکانی دامەزراوە ئابورییە ئازادەکان . گۆڕەپانی کۆمەڵگەی مەدەنی بوارێکە کەسەربەخۆیی تاك و کۆمەڵگە تێیدا گەشە دەکات لەناو ماوەیەکی فراوان لەپەیوەندیەکاندا. زاراوەکە بەم مانایە بەکار هاتووە لەوەدا کەپەیوەستە بەسووککردنی کۆنترۆڵی دەوڵەت و ئازادکردنی ئابوریی لەزۆر وڵاتدا لە خۆرئاوای ئەوروپادا . تا ئەم نزیکانەش مانای نوێی زۆر بلاّوی زاراوەکە (کە لەنووسینەکانی هیگڵ و مارکس و گرامشیەوە وەرگیرا بوو) ڕەخنەگرانە بوو و پاڵپشتی دامەزراوە ئابورییە سەرمایەدارەکان و دەوڵەتە دیموکراسیە ئازادەکان نەبوو. ئەم بەکار هێنانە ڕەخنەییەش ئامازە بەوە دەکات کە کۆمەڵگەی مەدەنی کۆمەڵگەی ئەو هۆکارانەیە کەبەهۆیانەوە کۆمەڵگەی سەرمایەداری ئازاد شەرعیەتی دەست دەکەوێت مەیدانێك پێشکەش دەکا کەوا دەردەکەوێت ئازادە لەکۆنترۆڵی دەوڵەت بەلاّم لەواقیعدا بەشێوەیەکی پتەو بەستراوە بە پەیوەندییەکانی بازاڕو هێزە ئابوریەکانەوە و دەیوڵەت پاڵپشتی هەمان کۆت و پێوەندەکان دەکات.

See alo :Capitalism ; community;
Hegemony ; legitimacy ; liberalism ; naton ; state.

## Socio – هەلومەرجی کۆمەلایەتی ئابوری (الوضع الأجتماعي الأقتصادي) economic Status (SES)

ناونانی هەلومەرجی ڕێژەیی کەسێکی دیاریکراوە لەناو بونیادی کۆمەلایەتیدا کە بەتایبەتی پشت دەبەستێت بە تایبەتمەندیەکانی داهات و پیشەوە. بەو پێیە بەکار دەهێنرێت کەرەهەندێکی گرووپی مەبەستەکانی توێژینەوەکانی داهات و پیشەوە. بەو پێیەی بەکار دەهێنرێت کە ڕەهەندێکی گرووپی مەبەستەکانی توێژینەوەکانی ڕووپێیەکان بۆ نموونە. جیاوازیشە لەچینی کۆمەلایەتی چونکە بنەمایەکەی تەسکترە لەڕووی ئەو فاکتەرانەوە کە لەخۆیان دەگرێت هەروەکو ئەو فاکتەرانە بابەتین لەکاتێکدا چینی کۆمەلایەتی بەهۆی فاکتەرە خودییەکانەوە لەنموونەی هەستکردن بە پەیوەست بوون بە چینێکی دیاریکراوەوە – پەیوەندیدار دەبێت.وە پرۆژەیەکی نموونەیی بۆ گروپەکانی هەلومەرجی کۆمەلایەتی – ئابوری بەکار دەهێنرێت کە کۆمەڵەی توێژینەوەکانی بازاڕ لەبەریتانیادا پەیڕەوی دەکات و ئەم گروپانە بەکار دەهێنێت:–

(أ) ئەرکەکانی هەلومەرج و بەرپرسیارێتی بالا لەنموونەی قازی و ئەندامی پەرلەمان یا بەڕێوەبەری بانق (و (ب) (پیشە کارگێڕیەکان و پیشەکانی دیکە لەوێنەی مامۆستا و چاودێری ڕەفتار و بەرپرسیاری نەخۆشەوانی (التمريض) و ج أ) (پیشەکانی نووسین و پیشەکانی سکرتاریەت و لەوانەش پیاوانی پۆلیس و فەرمانبەری بەدالەو سستەرەکان) و (ج 2) (کرێکارە کارامە دەستیەکان لەنموونەی شۆفێری پاس و پیاوی ئاگر کوژانەوەو سەرتاش) و (د) (کرێکارە دەستیەکانی دیکە وەك جابی پاس یاخود شۆفێری ئۆتۆمبیل) و (هـ) (تۆمارکراوانی

See also: Socil class: status.

## Sovereignty سەروەریی (السيادة)

ئـەم زاراوەیـە دوو بـەکارهێنانی جیـاوازی هەیـە بـەڵام بەیەکـەوە گرێـدراون. (سەرەوەری) مەرجە بۆ ئەو سەربەخۆییە ڕامیارییەی کەدەوڵەت دەیبێت لەکاتێکدا دەوڵەتەکانی دیکە دانی پێدا دەنێن بەو پێیەی تاکە سەرچاوەی مومارەسەی شەرعی دەسەڵاتە لەناو زەویەکانیدا.

هەردوو زاراوەی (سەروەری نیشتیمانی) و (دەوڵەتی خاوەن سـەروەری) ئـەم مانایـە لـەخۆ دەگـرن وەك گوزارشـتی (ئـەو سـەروەرییەی نـاکۆکی لەسـەرە Disputed sovereignty) کاتێك ئاماژە بەبانگەشـەکانی نێـوان دوو دەوڵـەت یـان زیـاتر دەکـات سـەبارەت بـەمافی بـاڵا دەسـتی بەسـەر هـەرێمێکی دیـاریکراودا. هەروەها زاراوەکە بەکار دێ بۆ وەسفی دەسەڵاتی ڕەهای کەسێك یا دەزگایـەك لـەناو کۆمەڵگایەکی ڕامیاریدا لەدانانی یاسا سەپێنراوەکان بەسـەر هـەموو ئەندامانی ئـەو کۆمەڵگایەداو لێکدانەوەو جێبـەجێکردنیان. هـەردوو بەکارهێنانەکـەش لـەو چـەمکەی سەروەریەوە وەرگیراوە کەلەسەدەی شانزەو هەفـدەدا پـەرەی پێدراوە وەك بەشـێك لەئایدۆلۆژیای دەوڵەتی نـوێ و ئـەم چـەمکە بەتایبـەتی پەیوەسـتە بـەجان و دودان و تۆماس هۆبزیش بیرەکانی دەوڵەتی پاشایی و کۆماریی سەربەخۆ لەلایـەك و لەلایـەکی ترەوەپێویستی بۆ چڕکردنەوەیەکی تاقانەی مل کەچی لەپێناوی پێکهێنانی بیرۆکـەی سەرچـاوەی بـاڵای یاسـا لـەناو هـەر حیزبێکـدا یـەکانگیر دەکـات، بیرۆکەکـە لـەمانای دووەمیـدا گـەلێك گرفتـی ئاشـکرا دەوروژێنـێ چـونکە سـەروەری وەك هێـزی ڕەهـا ڕەهایە،چـونکە ناکرێـت لـەڕووی یاسـاییەوە دیـاری بکرێـت لەلایـەن کەسـێك یـان دەزگایەکی ترەوە.

ئەوانەیش کەحەز دەکەن خۆیان لەم خۆگرتنە لادەن هەوڵیان داوە کەسەروەری بدەنە پاڵ ڕێسا دەستورییە بنەڕەتیەکان یادەوڵەت و ڕێگە بەهەر یەکێك لەو ڕێسایانە دەدەن کە کۆت و بەند لەخۆ بگرێت لەشێوەی ڕیساکەو ناوەڕۆکەکەیدا.

سەختی لەڕەفتارکردنی تیۆری لەگەڵ باڵا دەستیداو بەشێوەیەکی گونجاو لەگەڵ حوکمی سنورداردا لەڕواڵەتە ڕاستەقینەکانی دەوڵەتەکاندا خۆی نمایش دەکات. لەدەوڵەتەکانی وەك ئەمەریك و ئەڵمانیادا دەسەلاتی رامیاریی یەکە فیدراڵی و هەرێمییەکان سنوردارە، ناکرێت وادابنرێت کە دەستور یا دادگا ڕاسپێراوەکان بۆ ڕێکخستنی پەیوەندیی فیدراڵی و لێکدانەوەیان تەواو باڵا دەستن، چونکە دەستور لەوانەیە ڕاست بکرێتەوە یا لەوانەیە دەستور و دادگاکان هێزی سەربەخۆیان نەبێت بۆ سەپاندنی بڕیارەکان، لەبەریتانیادا باڵا دەستی ی یاسایی دەدرێتە پاڵ (شاژن لەپەرلەماندا) کەئەمەش دەستەواژەیەکە پێگەی باڵا دەستی دیاری ناکات بەلأم ئاماژ دەکات بەنەبوونی کۆت وبەندی چەسپێنراو بەشێوەیەکی ئاشکرا بۆ حوکمی پەرلەمانی. جیٚ بەجیٚکردنی چەمکی باڵا دەستیی نیشتیمانی ڕووبەڕوی گرفتی هاوشێوە دەبێتەوە لەو کاتەدا کە دەوڵەت پەیوەستە بە پەیماننامەیەك بۆ پەیڕەوکردنی ئەو بڕیارانەی کەلەدەرەوەی سیستمی ڕامیاریی نیشتیمانیدا وەردەگرێت وەکو وڵاتانەکانی کۆمەڵەی ئەورووپی.

**See als: Absolutism;**
**Authority ; autonpmy ; constitytion; law (b) :**
**Stipulative law;power ; rule of law ; separeaty**
**Of powers ; stute; treaty.**

## Special majority (*الأغلبية*) زۆرینە

لەوانەیە سستمە هەمیشەییەکان لەنێوان مەسەلەکانی تردا ئەو بارودۆخانەی کەدەکرێت لەسایەیاندا تاوتویٚکانی دەزگاکە بەشێویەکی دروست ئەنجام بدرێت و

هەروەها قەبارەی نیسابی پێویست و ڕێگە کردارییەکانی چارەسەری ناکۆکییەکان و مەرجەکانی پایەکە و ڕێگەکانی هەڵبژاردنی ئەوانەی کەپایەکان وەردەگرن و شێوازەکانی ڕاستکردنەوەی سستمە هەمیشییەکان دیاری بکات.

See also: Constitution
Stalinism See :Bolshevism

## State (الدولة) دەوڵەت

زاراوەکە هەمان ڕیشەی (status) ی هەیە کەبەمانای بار یان پایە دێ و (Estate) واتە چینی کۆمەڵایەتی و لە سەدەی دوانزەوە بەکار دێ بۆ وەسفی پلەو پایەی بەرزی فەرمانڕەواکان و بەهاتنی سەدەی چواردە بۆ وەسفی باری شاژن بەکار هاتووە و لەم ماوەیەدا زاراوەکە پەرەی بەوە داوە کە ئێستا بووەتە مانای هەرە نوێ و بەتایبەتی لەڕێگەی دەربڕینی (status civitatum) واتە ئەو دۆخەی سەربەخۆیی ڕامیارییەی کەزۆر لەشارە ئیتالیەکان هەیان بووە یا ئاواتەخوازی بوون. پەرەسەندنی دواتری زاراوەکەش هاوشانی سەر هەڵدانی شێوەی نوێ ی ڕیز بەندیی ڕامیاریی بووە کەئەویش (دەوڵەتی نوییە) لەئەورووپای ڕۆژئاوادا. دەکرێت کەدەوڵەتی نوێ وا پێناسە بکرێت کەبریتییە لەکۆمەڵێك دەزگای سەربەخۆ لەدەزگاکانی کۆمەڵگەی مەدەنی کە لەڕییانەوە.

ڕامیاریی و یاسای گشتی دیاری دەکرێت و جێبەجێدەکرێن: دەوڵەت دەسەڵاتی خاوەن باڵا دەستی لەسەر زەوییەکان پیادە دەکاو وای پیشان ئەدا کەسەرکەوتووە لەوەدا کەخەڵکی ناو ئەو سەر زەوییانە گوێڕایەڵی یاساکانی دەکەن ئەو گوێڕایەڵیەش لەڕێگەی دەسەڵاتی قۆرخکارانەیەوە بۆ هێزی شەرعی زامنی دەکات. لەگەڵ ئەوەشدا کەڕێکخستنە ڕامیارییەکانی هەموو دەوڵەتەکان وەك (دەوڵەت) ئاماژەیان پێ دەرێت بەڵام زۆر لەو ڕێکخستانە بەشێوەیەکی ناتەواو ئەو مەرجانە بەدی دێنن، تا ئەو

رادەیەی لەوانەیە بتوانرێت کە هیچ دەوڵەتێك نیە کەهەموو داخوازییەکان بەدی بێنێ هەمیشەش دان بەشەرعیەت دانانرێ و دەستخستنی گوێڕایەڵیش ناتەواوە، لەوانەشە کۆتەکانی رامیاریی نێو دەوڵەتی و یاسای دەست بەسەراگرتنی هێزە شەرعیەکان کۆت و بەند بکرێت، ڕەنگە زەحمەت بێت کەسنوری نێوان هەر دوو بواری گشتی و تایبەتی دیاری بکرێت یا باشی بایەخی پێ ناردێت، لەدەوڵەتی فیدراڵیشدا لەوانەیە دووکۆمەڵ لە دەسەڵاتی رامیاریی هەبن کەهەریەکەیان وای پیشان ئەدەن کەپەیڕەوییان لێ دەکرێ لەبواری تایبەتمەندییاندا.

ئەو مەرجە پێناسەییانەی کەلەوە و پێش خراونەتە روو تێکەڵێکە لەمەرجە دەزگایی و فەرمانی پێوانەییەکان. ئەو پێناسەش کە لەسەر یەکێك یازیاتر لەم رەگەزانەدا چڕ نابنەوە، ئەوا بێگومان شێوەی جیاواز لەبیرۆکەی دەوڵەت پێشکەش دەکەن و ناوەرۆکی جیاوازیان هەیە لە شیکردنەوەی چالاکیی دەوڵەتدا.

پێناسە فەرمانییەکان بۆ نموونە، بەزمانی ئەو ئەرکانەوە دادەڕێژرێن کەدەوڵەت ئەنجامی ئەدا. لەوانەشە کە دەوڵەت لەرێگەی لایەنەکانی سەرجەم ئەو دەزگایانەوە دیاری بکرێت کە ئەو ئەرکانە جێبەجێ دەکەن، ڕەنگە ئەمەش هەندێك لەو جیاوازییانە بشارێتەوە کە لەسەرەوە خراوەتە روو لەنێوان هەر دوو گۆرەپانی گشتی و تایبەتیدا و لەنێوان دەوڵەتی نوێ و شێوە پێشترەکانی رێکخستنە رامیارییەکان.

رێبازە جیاوازەکان لەشیکردنەوەی رامیارییدا بەشێوەیەکی دیاریکەر، پەیوەند بووە بەو رایە ئاشکرایانەوە کەدەربارەی دەوڵەتن، بەتایبەتی دەوڵەتی دیموکراتی ئازادی نوێ. بارودۆخە راستەقینەکان ئاڵۆزن و بەشێوەیەکی گشتی بریتین لەمانە: فرەیی خوازەکان وا رەفتار لەگەڵ دەوڵەتدا دەکەن وەك بوارێك کەتیایدا ململانێکانی نێوان بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵە رکابەرەکان یەکلایی دەکرێتەوە یا وەك حوکمێکی بێ لایەن لەیەکلایکردنەوەی ئەم جۆرە ململانییانەدا (کۆمەڵە رایەکە کەزۆربەی کات رەخنە دەگرێت بەهۆی ئەوەوە کە ناتوانێت هیچ شتێکی دیاریکراو بڵێت دەربارەی ئەوەی کەدەوڵەت چییەو چی دەکات) . مارکسیەتی تەقلیدییش دەوڵەت وەك ئامرازی

هێزی چینایەتی مامەڵە دەکات کەچینی باڵا دەست لەکۆمەڵگادا پیادەی دەکات یابەناویەوە پیادە دەکرێت. (ڕایەکی پتەوە سەبارەت بەفەرمانی دەوڵەت بەڵام کەمتر دیاریکەری وردەکارییە دەزگاییەکانە بۆ بەئەنجام گەیاندنی) نوسینە مارکسەکان لەو دەیە کەمانەی ڕابوورد بەلای ڕیژەی سەربەخۆییدا زیاتردا بۆ دەوڵەت وایان شکاندوەتەوە بۆ لەچوار چێوەی ئەو کۆت و بەندانەدا کەوا سیستمی ئابوری و کۆمەڵایەتی دەیان سەپێنێ، لەشێوازێکی تا ڕادەیەك هاوشێوە نوسەرە نامارکسییەکان کەهەندێك جار پێیان دەوترێت. (دەوڵەتییەکان یا ئەوانەی کەبانگەوازی دەوڵەت دەکەن) (New statists) یا (دەزگاییە نوێکان) (New institutionalists) دەوڵەت وەك ڕێکخراوێکی دیاریکراوی خاوەن بەرژەوەندی تایبەت بەخۆی لەهەوڵێکی خود هۆشیاریدایە بۆ پڕکردنەوەی ئەوا کەلێنە کە لەشیکردنەوەی ژمارەییدا هەیە.

See also:Anarchism ;contrct theory;
Federcation; government (a) :
The institition ; Marxism ;nation ;
pluralism; policy ; sovereignty.

## State Capitalism (راسمالية الدولية) سەرمایەداریی دەوڵەت

زاراوەیەکە کەهەندێك جار بەو سستمە ئابورییانە دەوترێت کە زۆر لەڕواڵەتەکانی سەرمایەداریی پیشان ئەدات، بەڵام دەوڵەت پاڵپشتی خاوەنداریی تایبەتی دەکا بەتەواوی و بەشێوەیەکی بنەڕەتی. زاراوەکە بۆ وەسفی ئابورییە سەرمایەدارییەکان بەکار دێ کەدەستێوەردانی دەوڵەت تیایاندا دەگاتە خاوەندارییان و دەست بەسەراگرتنیان بەسەر کەرتە پیشەسازییەکان یا ئابورییە بەناو سۆسیالیستییەکان کەتیایدا دەوڵەت بەرهەم هێنان ئاراستە دەکات و ئامانجی سەرەکیی بەرهەم هێنان

بریتیــە لەدروســتکردنی زێــدەبایی و کەڵەکــە کردنــی، بیرۆکراتیــەتیش یــاحیزبی دەسەلاتدار جێگەی چینی چەوسێنەر دەگرێتەوە. ووتراوە کەئابورییە سەرمایەدارییە پێشکەوتووەکان دەگاتە قۆناغی سەرمایەداریی قۆرخکردنی دەوڵەت (کەهەندێك جار پێی دەوترێت:Stamocap) کەتیایدا دەوڵەت و کۆمپانیا گەورەکان یەك بارستەن وکۆمەڵگا بەسەریدا زاڵە.

**See also :Anrcho- syndicalism ;**
**cpitalism ; corporatism (b) :**
**ideal type; interventionism :**
**liberalism ; Marxism; political economy ; socialism.**

## State Socialism سۆشیالیزمی دەوڵەت (*اشتراکیة الدولة*)

زاراوەکە لەبنەچەدا بۆ وەسفی ئەو ماوە گواستنەوەییە بەکار هاتووە کەتیایدا دەست بەسەراگرتنی مەڵبەندی پێویستە بۆ گۆڕینی ئابووریی و هەڵوەشاندنی پەیکەرە سەرمایەدارییەکان. ئێستا زراوەکە بەجۆرێکی ئاسایی تر بەسەر ئەو کۆمەڵگایانەدا جێبەجێ دەکرێت. کەتیایدا دەزگایەکی حکومی بەهێز دەست بەسەر بەرهەم هێنان و دابەشکردندا دەگرێت و باوەڕی بەئایدۆلۆژیای سۆشیالیستی هەیە.

**See also:Marism : socilism.**
**Statism See :Interentionism.**

## Status ڕەوش (*الوضع*)

بریتیــە لــەو بــارەی کەئەنــدامی کۆمــەڵێکی کۆمەلایــەتی هەیــەتی وەك خێــزان یــا کۆمــەڵگا یــا ڕێکخــراوی لقیــی ســەربەحیزبێکی ڕامیــاریی، بــەپێی ئــەو بارانــەی کەئەندامــەکانی تــری کۆمەڵەکــە هەیانــە دەناســرێت و هــەروەك چۆن کــەپێوەرەکانی

کۆمەڵەکەو ڕێساو بەهاکانی دیاریی دەکەن بەم شێوەیە بار پێك دێت لە پەیوەندییەکانی هێزێکی نیزامی و پەیوەندیەکانی ئیمتیازەکان یا پەیوەندییەکانی بەرپرسیارێتی و پابەندبوون. لێك جیاکردنەوەیەکیش هەیە بۆ هەندێك مەبەستی شیکردنەوەیی لەنێوان باری بەدی هاتوو لەئەنجامی جۆرێك لەڕکابەریی (وەك پاڵێوراوی حیزبێکی ڕامیاریی بۆ هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی یا سکرتێری گشتی سەندیکایەکی کرێکاریی)و لەنێوان باری وەرگیراو- بەشێوەیەکی ئەگەریی بەلانی کەمەوە بەلەدایك بوونەوە (وەك بارێك لەخێزانێك یا خێڵێك و ئەندامێتی چینێك یا ڕەچەڵەکێکی فەرمانڕەوا) . لەوانەشە کەبارە جیاوازەکان لەناو کۆمەڵێکدا پۆلێن بکرێن بەپێی ڕادەی ئەو ناو و ناوبانگەی کە ئەندامەکانی کۆمەڵەکە پێوەیان دەبەستێ زۆر لەزانایانی کۆمەڵناسی ڕامیاریی بار بەهۆکارێکی گرنگ دادەنێن کە کار لەزۆر شێوەی ڕەفتاری ڕامیاری دەکات بەدەنگدان و بەشداریکردنی ڕامیاری و هەڵوێستەکان لەبەرامبەر دەسەلات و...هتد.

See also : Hierachy ;socio- economic status.

## شیکردنەوەی بونیادی -فەرمانی

## Stuctural- functional Analysis (*التحليل البنيوي - الوظيفي*)

ڕێگەیەکی شیکردنەوەیە کەسیستمێك دەپشکنێ لەڕووی ئەو بونیادانەوە کەلیی پێك دێ و ئەو فەرمانانەی کە ئەو بونیادانە بەجێی دێنێ، شێوەیەك لەم شیکردنەوەیە جێیەکی کاریگەری وەرگرتووە لەزانستی ڕامیاریی ئەمریکی و بەریتانیدا لەهەردوو دەیەی پەنجاکان و شەستەکان و سەرەتاکانی دەیەی حەفتاکاندا لەسەدەی بیستەمدا. ڕێبازەکە وای دائەنێ کەبۆ هەر سیستمێکی ڕامیاریی کۆمەڵە فەرمانێکی دیاریکراو هەیە کەدەبێت بەجێ بهێنرێت ئەگەر بویستریَ سستمەکە بەردەوام بێ.

پاشان ئەو بونیادانە نویّ دەکرێنەوە کە ئەو فەرمانانە بەجیّ دێنن و شێوازی بەجیّ گەیاندنی دەپشکنری. ئەنجا پەیوەندی لەنێوان شێوازی ئەنجامدانی ئەو فەرمانە بنەڕەتییانەدا و جۆری رۆشنبیریی رامیاریی کۆمەڵگدا دروست دەکریّ.

گرنگترین چاکییەکانی ئەم رێبازە ئەوەیە کەلەلایەنە زیندووەکانی سستمەکەدا چڕ دەبێتەوەو وا دەکات کەبتوانرێت بەراووردی رێك وپێك لەنێوان سیتمەکاندا ئەنجام بدرێت لەرێگەی دیاریکردنی بۆ ئەو فەرمانانەی کەپێویستن بۆ هەموو سستمە رامیارییەکان. بەڵام چەندین گرفتی ئاشکرا هەیە لەرێبازەکەدا، بەتایبەتی ئەو گرفتانەی کەلەداڕشتنی هەر پێناسەیەکدا، بۆ زاراوەکانی (فەرمانە بنەڕەتیەکان Reyuisite function) و (بەردەوام بوونی سیستم system persistence) و (مانەوە survival) دا هەن. شیکردنەوەی بونیادی فەرمانی بەپێویستی هەوڵ نادات کەلێکدانەوەیەکی فەرمانی پێشکەش بکات. دیاریکردنی پەیکەرەو دەزگا سەرەکییەکان لەرێگەی کار ئەنجامدانیەوە توێژەر پابەند ناکات بۆ نموونە، بەوەسفکردنی رووداني بەتەنها لەرووی بەجیّ گەیاندنی فەرمانەکانیەوە بیّ بەڵام ئەو گریمانانەی کەبابەتەکە دیاری دەکاو رێکی دەخات پێویستە کەهەندێك لێکدانەوەی فەرمانی لەخۆبگرێت بۆ سستمە رامیارییەکان لەسەر ئاستی بنەڕەت. لەبەر ئەوە شیکردنەوەی بونیادیی– فەرمانی بە بوونیچەند لایەنێکی لاوازی تێیدا و لایەنگیری تاوانبار کراوە وەك لێکدانەوەی فەرمانی، ئەم گریمانانەش پەیوەند دەبن بەو گرفتە پێناسەییە دیاریکراوانەی کەلەسەرەوە ئاماژەی پێکراوە.

شیکردنەوەی بونیادیی– فەرمانی. بەپێویست جۆرێکی تر نیە لەبونیادگەرایی (mstructuralis) و زۆر لەوانەی کەلەم رێبازەدا کاریان کردووە توند بوون لە پەیوەست بوونیان بە رەفتاری تاکییەوە وەك ئەو رێسایەی کە سەبارەت بەتێبینی و لێکدانەوەییە بۆ شیکردنەوەی سیستمە رامیارییەکان. هەندێك شیکردنەوەی مارکسیش (لەمی هەمان ماوە) وا وەسف دەکریّ کەئەمیش بونیادیی – فەرمانییە.

لێرەدا ئەو بارە تیۆرییەی کەدراوە بەبوناد ئەبێت بونیادیی بێت بەشێوەیەك کە قابیلی جیاکردنەوەو لێکدانەوە پێشکەشکراوەکان بێت کەلەزۆربەی کاتدا فەرمانییە.

## بونیادگەرایی (البنیویة) Structuralism

بریتیە لەو رایەی کەدەڵێ جیهانی کۆمەلآیەتی و رامیاریی دەبێ لەرووی هێزو پەیوەندییە شاراوەکانی پشت کارەو زمانەوە لیی تێبگەین لەدەرەوەی ئەزموونی راستەوخۆوە لەبەر ئەوە ناکرێت کە راستەوخۆ تێبینی بکرێت. هەروەك چۆن پایەی رۆڵی بریکاری مرۆڤایەتی نزم دەکرێتەوە بەو رایەی کەدەڵێت کە ئەم (بونیادە قولآنە) کار دیاری دەکەن و دەیبەستنەوە و لێکدانەوەیەکی رێکخراو پێشکەش دەکەن بۆ رواڵەتی دەرەکیی نارێککراو بۆ چالاکیی کۆمەلآیەتی. بونیادگەرایی دژ بەفەردیەتی بنەمایی‌و ئەزموونی دەوەستێتەوە. چەندین هەوڵیش دراوە بۆ نمایشکردنی بونیادگەرایی وەکو رێگەیەکی یەکخراو و گونجاو بۆ شیکردنەوەی هەموو دیاردە کۆمەلآیەتییەکان بخرێتە روو. لەراستیدا زۆر شێوەی گرنگی هەیە لە کارەکانی ناو بوارە جیاوازەکانی توێژینەوەدا. بۆ نموونە شیکردنەوەی بونیادگەرانەی زمان لەشیکردنەوەی بونیاتگەرانەی دیاردە نا زمانییەکانی رامیاری ناچێت. لەشیکردنەوەی رامیاریدا شێوە بونیاگەرایی کە زۆربەی کات رێکەوتی مارکسیەتێك دەکات کەریشەی رێبازەکەی لەو هێزو پەیوەندیانەدا داکوتاوە کەشێوەی بەرهەم هێنان پێك دێنن.

**See also: Structual – functionl analysis; Structuration ; structure**

## Structuration    بونیاد/ ڕێکخستن (التنسيق)

شـیکردنەوەی ڕامیـاریی بونیادگەرانـە بونیـاد وەك هۆکـارێکی دیاریکـەر و بەستەرەوەی پێچەوانەی بریکـاریی مرۆڤایـەتی مامەڵـە دەکـات. فەرمانگـەرایی – بونیادگەرانەش بونیـاد وەك هـاو واتـای سـستمی کۆمەڵایـەتی یـا جـۆری پەیوەندییـە کۆمەڵایەتیـەکان مامەڵـە دەکـات. ئـە و شـیکەرەوانەش کەحـەز دەکـەن خۆیـان لـەو ئاماژانە بەدور بگرن و ئەوانەشـی کەحەزدەکـەن زاراوەی (بونیـاد) بـەکار بهێـنن بـۆ وەسفی ئەو بنکـەو سەرچاوە کۆمەڵیانـەی کەڕێگـە بـەوەرگرتنی کـاری تـاکی دەدات هەنـدێك جـار ئامـاژە بـە (پرۆسـەی بونیـاد ڕێکخسـتن The process of stucturation) ئەکەن. ئەم پرۆسەیەش بەرهەمهێنانیسستمە کۆمەڵایـەتیـەکان و دووبارە بەرهەم هێنانەوەین لەڕێگەی ڕاڤەکردنی تاکەکانەوەو بـەکار هێنـانی بنکـەو سەرچاوەکان بـۆ پەیوەنـدیکردن و کـارەوە لـەخۆ دەگرێـت. زاراوەکـەش بەتایبـەتی پەیوەندە بە توێژینەوەکانی ئەنتۆنی (گیدینز) ەوە.

See :also : hermeneutics; hermeneutics ;
Structural – functionalism ; structuralism;
Structure.

## Stucture    بونیاد – پەیکەر (البنية، الهيكل)

بریتیـە لەڕەگـەزەکان و پەیوەندیـە ئاڵوگۆڕکراوەکـان کەپێکـەوە سیـستمێك یـا دەزگایەك یا پیادەکردنێك پێك دێنن. ڕەنگـە پەیەکـەری سیستمی ڕامیـاریی لـەڕووی دەزگاکانیـەوە وەسـف بکرێـت (ئەنجومـەنی یاسـادانان و حیزبـە ڕامیارییـەکان و کۆمەڵـەکانی بەرژەوەنـدی... هتـد) و لایەنـە پەیوەندیـدارەکانی ئـەو تاکانـەی کەڕەگەزەکانی پەیکەرەکەیان (وەرگرتووە) (یاسادانەرەکان و ئەندامانی حیزبەکان و هاووڵاتییـان و بەرهەمهێنـەرە بەکاربـەرەکان... هتـد) و ئـەو پیادەکردنانـەی کـە

لایەنە پەیوەندیدارەکانی دەزگاکان و تاکەکان دیاری دەکات ورێکی دەخات (یاساو دەسەڵات و پەیوەستی و هێز ... هتد) هەروەها دەکرێت کەهەر ڕەگەزێك لەپەیکەرەکەدا لێك بدرێتەوە لەڕووی ڕەگەزە پەیکەرییەکانیەوە هەروەك چۆن دەکرێت پەیکەرەکە خۆیشی ببێتە ڕەگەزی پەیکەرەکانی تر.

لەبەر ئەوەی کە هەندێك لەپێناسەی پەیکەر زیاد دەکرێت لەهەموو شێوەکانی توێژینەوەدا ئەوا ئاماژە بۆ (پەیکەر) یەکەم جار ئەوە ناگەیەنێ کەوەسفەکە بەشێوەیەکی گونجاو (بونیادیی) یە، زۆر لەنوسەری فرەیخوازی، (پەیکەر **Structure**) وەك هاومانایەکی زاراوەی (دەزگا **Institution**) چارەسەر دەکەن و زاراوەکەی پێشوش بەکار هاتووە بۆ گەیاندنی بایەخدان بە ڕەفتاری راستەقینەی تاکە بەشدار بووەکان لەپرۆسە دەزگایەکاندا نەوەك جێگە یان پایەی ڕەسمییان. لێرەدا پەیکەرەکە بریتی دەبێت لەکۆکردنەوەی کاری تاکی و ناکرێت کەهەر ئاماژەیەك بۆ میکانیزمە لاوەکییەکان دەرەوەی ئاستی کاری تاکیی تێبینی کراو یا لەژێریدا مەبەست بێت.

**See also : pluralism ; social structure ; Structural – functionl analysis: structu-Ration ; structuralism.**

## Sub- community کۆمەڵگەی لقی (المجتمع الفرعي)

کۆمەڵێکی کۆمەڵایەتییە کەلەهەندێك ڕواڵەتی دیاریکراودا بەشداران زیاتر لەو ڕواڵەتانەی کەکۆمەڵگە بەتەواوی هەیەتی. بۆیە لەوانەیە کۆمەڵگایەك کۆمەڵگای لقی جیاواز و زۆر لەخۆ بگرێت و لەوانەشە کەتاکێك سەر بەچەندین کۆمەڵگای لقی بێت، لەکۆمەڵگایەکی دیاریکراو لەڕووی زەمینییەوە وەك شار ڕەنگە چەندین کۆمەڵگای لقی یا ئایینی هەبێت. ڕەنگە ئەم جۆرە کۆمەڵگا لقییانە قەوارەی رامیاریی پەیوەندیداریان هەبێت لەسستمێکی رامیاریدا بەهۆی بەرژەوەندییە هاوبەشەکانیانەوە

و دەرفەتەکانەوە لەپێناوی کاری ڕامیاریی هاوبەشدا.

See also : community ; olitical cultre.

## Sub-government حکومەتی لقی (*الحکومة الفرعیة*)

زاراوەیەکە لەشیکردنەوەی ڕامیارییدا بەکار دێ بۆ وەسفی ئەو کۆمەلانە لەڕەگەزە ڕامیارییەکان تێشیاندا یاسا دانەرەکان و نوێنەرانی ڕێکخراوەپەیوەندیدارەکان کەزیاتر لەوانی تر سودمەند دەبێت لەبڕیارە ڕۆتینییەکان لەناو ناوچەیەکی تاڕادەیەك تایبەتکراو لەڕامیاریدا.. زاراوەکە کەبەگشتی بەکار دێ بۆ دیاریکردنی ئەوانەی بەشێوەیەکی کارا بەشداری دەکەن لەبڕیارەکان لەپەیوەندیکردنی هاوکارانەی ڕێکخراو لەنێوان خۆیاندا نەوەك لەگەڵ کۆمەڵێکی فراوانتر لەتاکەکان کەهەندێك بایەخیان هەیە لەبوارەکەداو زۆر لەوانیش دور خراوەن لەبەشداریکردنی ڕۆتینی (حکومەتە لقییەکان) زاراوەیەکی باوە لەئەدەبیاتی ئەمریکیدا، شیکردنەوەی ڕامیارییەکانی بەریتانیش حەز دەکات کەزاراوەی ( work net) بەکار بهێنێ بۆ وەسفکردنی چەمکێکی هاوشێوە.

See also :decision- making analysis;
Incrementalism ; policy analysis;
policy network

## Survey ڕووپێوان (*المسح*)

توێژینەوەیەکی درێژە لەلایەنە هەڵبژاردەکانی هەندێك لە (دانیشتوان) (بەمانای کۆمەڵە کەسێك یاگروپێك یا بڕگە ناکەسییەکان وەك ڕووداوە دووبارە بووەکان) .

لەبەر ئەوەی کەهۆکارەکانی تێچوون و کات و سەرچاوەکانی تر یا ئەستەمی سروشتی بـۆ مامەڵـە کـردن لەگـەڵ هــەر برگەیــەك لــەناو کۆمــەڵێك دانیــشتواندا لــەزۆر لەڕوپێوانەکاندا، توێژینەوە گشتگیرەکان وە لادەنرێن ئەوا ڕووپێوی نموونەکان زیـاتر بەکار دێت، شـیکردنەوە ڕووپێوییـەکانیش ئـەنجامی ڕوو پێوییـەکان بـەکار دێنـێ بـۆ پــشکنینی گریمانــەکان یــا داڕشــتنیان و پــۆلێنکردنی بارەکــان و خولقانــدنی نموونەکان....هتد.

See also: panel study; smaple.

## Swing گۆڕان – وەرچەرخان (التحول)

زاراوەکـە بـەکار دێ بـۆ وەسـفکردنی گواسـتنەوەیەکی ڕێـژەیی بـۆ پـشتگیریی لەحیزبێکی ڕامیارییەوە بۆ یەکێکی تر لەناو دەنگدەرەکانی یەك بازنەی هەڵبژاردندا یا کۆمـەڵێك بازنـەی هەڵبـژاردن یـا هـەموو وولآت، بەڕێژەیـەکی سـەدی. بـەزمانی (وەرچـەرخان) لەحیزبێکـەوە بـۆ یـەکێکی تـر گوزارشـتی لێ دەکرێـت بـەوەرگرتنی ڕێژەیـەکی سـەدی لـەو دەنگدانـەی کـەحیزب دۆڕاندویـەتی حـساب دەکرێـت بەبـەراووردکردن بەهەڵبـژاردنی پێـشوو وەخستنە سـەری بـۆ ئـەو پـشکەی ڕێـژەی سەدییەی کەحیزبەکەی تر دەستی کـەوتووە لـەو هەڵبژاردنـەوە پاشـان دابەشـکردنی ئەنجامەکە بەسەر دوودا بۆ ڕێگرتن لە (وەرچـەرخان) بـۆ حیزبـی دووەم. بـۆ نموونـە لەوانەیە حیزبی أ لەبازنەی هەڵبـژاردنی (س) دا زیـاد بوونێـك لەپـشکی دەنگەکانیـدا بەخۆوە ببینێ لەدوا هەڵبژاردنەوە لە 25٪ بۆ 30٪ و حیزبی ب پشکەکەی دادەبەزێ لە 45٪ بۆ 38٪ لەبەر ئەوە (گۆڕان) لەحیزب (ب) بـۆ حیزبـی (ئـەلف) دەکاتـە 5 +7−12 دابەشکراوە بەسـەر دوو دا واتـە 6٪ ئەگـەر هـەردوو حیزبەکـەش پـشکی دەنگەکانیان لەدەستدا (بەهۆی بـوونی حیزبـی تـرەوە لـە یـەك هەڵبژاردنـدا یـا هـەر دووکیان) ئـەوا ڕێـژەی سـەدی ئـەوەی کـە حیزبـی یەکـەم لەدەسـتی داوە لەڕێـژەی

سەدیی ئەوەی کەحیزبی دووەم لەدەستی داوە دادەشکێنرێت و ئەو ئەنجامەدا بەسەر دوودا دابەش دەکرێت بۆ دۆزینەوەی (وەرچەرخان) ە. توانای بەراووردێکی تەواو بۆ ئەنجامەکان کاریگەر دەبێت بەبوونی حیزبە سییەکەمەکان و جیاوازییەکان لەرێژەی سەدی سەرجەم دەنگدەرەکان لەهەر دوو پرۆسەی ئەو هەڵبژاردنانەی کەبابەتی بەراوردەکەیە.

See also :psephology.
**Syndicalism**
See: Anarcho-syndicalism.

## Systems Analysis شیکردنەوەی سیستمەکان (*تحليل النظم*)

رێبازێکە لەشیکردنەوەی پەیکەرو دەزگاو پرۆسە رامیارییە پەیوەندەکان بەتوێژینەوەکانی دیڤید ئەیستنەوە بەتایبەتی. شیکردنەوەی ئیستن بۆ سستەمە رامیارییەکان (کە بۆ نموونە لەکتێبی دایڤید ئیستن بەناونیشانی (شیکردنەوەی سیستەمەکان لەژیانی رامیاریدا روونکراوەتەوە) کەخانەی (وایلی) دەریکردووە لەنیۆیورک لەساڵی1965) لەخستنە ناوەکانی داواکارییەکان و پاڵپشتیکردن وئەو پرۆسانەی گۆڕین کەمامەڵە دەکەن لەدەسەڵاتەکاندا چڕ دەبێتەوە (کە لەسستەمی دەوڵەتی نویدا حکومەت و ئەنجومەنی یاسادانان..) لەگەڵ ئەو خستنە ناوانەدا،و دەرچووە بەرهەم هاتووەکان...هتد لەخۆ دەگرێت و میکانیزمی گەڕاندنەوە کەدەرچووەکان ڕاست دەکاتەوە بەپێی خستنە ناوەکان ۆ رێگەی بەردەوام بوونی سستەمەکە لەبەرامبەر فشاری دروست بوو لەناو سستەمەکەدا یا لەژینگەکەیدا . ئەگەر فشارەکە گەیشتە رادە شلۆقەکان و لەو ئاستانەدا ماوەیەك بەردەوام بوو ئەوا رەنگە گۆرانکاریی لە دەسەڵاتەکاندا روو بدات (گۆڕانی حکومەت لەهەڵبژاردنەکاندا بۆ نموونە) لەسستەمی حوکمیشدا (رووودانی شۆڕش بۆ نموونە) یا لەکۆمەڵگای رامیاریدا

(ڕوودانی جیابوونەوە بۆ نموونە) لەوانەشە کەفشار لەکۆتاییدا ببێتە هۆی تێکدانی سستەمەکە خۆیشی. فرە بوونی داواکارییەکانی دانیشتوان لەکۆمەڵگادا لەپێشنیارانە ڕامیارییەکاندا کۆدەبێتەوە (مەسەلەکان) کە حیزبە ڕامیارییەکان یا ئامرازەکانی ڕاگەیاندنی جەماوەریی یا کۆمەڵەکانی بەرژەوەندی دەیخەنە ڕوو و سیستم چارەسەریان دەکات. (پاسەوانانی دەروازەکانیش) لەجۆرە جیاوازەکانی لێشاوی داواکارییە جیاوازەکانەوە ڕێك دەخرێن بۆ خۆبەدوور گرتن لەزیادەڕوی لەشیکردنەوەی ئەو کەناڵانەدا کەداواکارییەکان لەڕێگەیانەوە سەرنجی دەسەڵاتەکان ڕادەکێشن. پشتگیریکردنی دەسەڵاتەکان و سستم و کۆمەڵگا خۆی دەروازەیەکی گرنگە ئەگەر ئەم پشتگیرییە هاو دژ بوو (لەڕێگەی تێکدان یانەتوانایی شەرعیەت یاخراپیی هەماهەنگی لەنێوان دەرچووەکان و خستنە ناوەکاندا) ئەوا ئەمە فشار لەسەر سیستم دروست دەکات. چەندین کۆتیش هەیە لەسەر کارپێکردنی سستەمەکە جا ئەگەر سستمێك ناوەکی بێت (نەبوونی سەرچاوە ڕامیارییەکان، یاسەرنەکەوتنی پەیوەندیکردنی ڕامیاریی) یا دەرەکی بێت (وەك دەستێوەردانی‌نێو دەوڵەتی‌و کۆتە ئابوری یا یاساییەکان) وە لەفەرمانگە گرنگەکانی دەسەڵاتەکان بریتیە لەدەرکردن بەو گۆڕانانە و پاشان خۆگونجاندن لەگەڵیان.

شیکردنەوەی فەرمانیی گابریبل ئەلمۆندو هاوەڵەکانی، لەگەڵ ئەوەشدا وەك شیکردنەوەی سستەمەکان پۆلێن ناکرێت. واش دادەنرێت کەسیتمێکی ڕامیاریی هەیە کەپەیکەرەکانی فەرمانە بنەڕەتییەکانی تێدا جێبەجێ دەکرێت و هاوبەشی دەکات لە ئاڵوگۆڕەکان لەگەڵ ژینگەدا. کارل دۆیچیش لەڕێبازەکانیدا بۆ لێکۆڵینەوەی پەیوەندیکردنی ڕامیاریی (بۆ نموونە لەکتێبی (دەمارەکانی حکومەتدا) کە لەفری پرێس لەنیۆیۆرك لەو کەناڵانەی کەپێیەوە پەیوەندیکردن ڕوو دەدات لەسستەمەکەداو پرۆسەکانی خۆراکپێدانی گەڕاوە وبارە ناساغییەکانی پەیکەرەکان و پرۆسەکانی پەیوەندکردن لەڕووی شوێنەوارەکانیەوە لەسستمی ڕامیاریدا لەخۆ دەگرێت.ئەو خەسڵەتانەی کە ڕێبازەی سستەمەکە پێشکەشیان دەکات بۆ شیکارکردنی ڕمیاریی

ئەمانـەن: ڕێبازەکـە ڕێگـە ئـەدات بەتوێژینـەوەو بـەراوردکردنی سـستەمە ڕامیارییـە ناحکومییەکان وەك سستەمی ڕامیاریی نێو دەوڵەتی یا شار یا ڕێکخـراوی لقـی حیزبـی ڕامیاریی یاپرۆژەی بازرگانی فرە ڕەگەزەکان لەڕۆڵیـدا وەکـو ڕێکخراوێکـی ڕامیـاریی، کەبەشـێوەیەکی گـشتگیر لـەجۆرەکانی پـۆلێنکردن کـە شـیاوی جێبـەجێکردن بـن پێشکەش دەکات لەپێناوی شیکردنەوەی بـەراوردکاریی یەکـە ڕامیارییـە جیاوازەکـان (یەکـە نـوێ و پەرەسـەندووەکان و دیکاتۆریەتـەکان و دیموکراتیـەکان یـا دەوڵەتـە یـەکگرتووەکان و دەوڵەتـە فیدراڵییـەکان بـۆ نموونـە) ، سـەرنج ڕادەکێـشێ بـۆ پرۆسـەکانی گـۆڕینی داواکارییـەکان و خۆراکـدانی گـەڕاوە و ئاڵوگۆڕەکـانی نێـوان سستەمی ڕامیاریی و ژینگەکەی، و ڕێگەکانی چەسپاویی سستەمە ڕامیارییەکان بـەڕووی فشاری ناوخۆیی و دەرەکیدا. بەڵام ڕێبازی سـستەمەکان ڕەخنـەی لێ دەگـیرێ بـەهۆی ئەو سەختییانەی پەیوەندن بـەکارپێکردنی هەنـدێك لەچەمکە سـەرەکییەکانی (وەك بەردەوامبوونی سستەمی ڕامیاریی و ((فشار)) وە بەدیاریکردنی سنورێك کەلەحاڵـەتی سـستەمێکی ڕامیاریدایە،کەسـستەمێکی دیـاری کـەرە بەشـێوەیەکی یارمەتیـدەر بـۆ دۆزینەوەی ئەوەك سستەمێکی سروشتی.

**See also : Feedback ;getekeepers; Overload (b) : Communications over-Load;political system ; structural-functioal analysis.**

## Tactical Voting (*التصويت التكتيكي*) دەنگدانی تەکیکی

دەنگدانی تەکتیکی پێك دێ لە وەرگرتنـی بڕیـاری هەڵبـژاردنی پاڵێوراوێك یاحیزبێك لەهەڵبژاردنەکاندا بەمەبەستی زامنکردنی ئەنجامێك بەم شـێوەیە ئەمـە پەیوەندیـدارە بۆ نموونە بەسستەمی هەڵبـژاردنی زۆرینـەی سـاکاری بەریتانییـەوە بـەڵام دەکـرێ کـە لەسستەمەکانی یەك دەنگی قابیلی گواستنەوە لەهەڵبژاردنەکاندا بـەکار بێـت (لـەڕووی

ڕێکخستنی بەباشتر زانینەکانەوە) و لەسیستەمەکانی نواندنی ڕێژەیی داکەپشت بەلیستەکان دەبەستێت کە مەرجی کەمترین ڕادەی هەیە لەڕێژەی سەدیدا بۆ دابینکردنی کورسیەکان (وەك لەئەڵمانیادا) نموونەی ئەمانەش وەك: دەنگدەرانی پارتی کرێکاران و پارتی دیموکراتی ئازاد لەبازنەیەکی هەڵبژاردنی بەریتانیادا بڕیار ئەدەن (بەشێوەیەکی سەربەخۆ و لەڕێگەی ڕێکخستنێکی پێشتر) کەدەنگ دان بەپاڵێوراوی یەکێك لەدوو حزبەکە ئەگەری بەزاندنی پاڵێوراوی پارێزکار زیاد دەبێت لەبری (پەرتکردنی) دەنگدانەکە دژ بەپارێزگارەکان یابەکار هێنانی دەنگدەرانی پارتی دیموکراتی ئازاد لەئەڵمانیا دەنگی بازنەی هەڵبژاردنیان بۆ ئەو حیزبە گەورەیەی کەدیموکراتی لیبراڵەکان ئیئتیلافی لەگەڵ دەکەن بەلام دەنگەکانی لیستەکە دەدەنە دیموکرات لیبراڵەکان.

See also:Election: list system: single transferable vote ; system ;voting

## حکومەتی تەکنیکارەکان (*حكومة الفنيين*) (تەکنۆکراسی) Technocracy

بریتیە لەو سستەمە ڕامیارییەی کەلەئەنجامی گۆڕینی ڕامیارەکان بەشارەزا هونەرییەکان دێتە کایەوە. حکومەتی تەکنیکارەکان وەك شێوەیەکی حوکم بیرۆکەیەکی یۆتۆپیاییە کە لەئەمەریکادا بەباش زاراوە لەماوەی بێ بازاڕیی ئابوریدا پێش شەڕی جیهانی دووەم ڕەنگە بەئاراستەیەکیش دابنرێ کەمەترسی هەیە لەدەوڵەتە پیشەسازییەکانی ئەمڕۆدا،و پشت بەو گریمانانە دەبەستێ کەپێی وایە خۆشگوزەرانیی مرۆڤایەتی زیاد دەکات بەچاکبوونی توانای حکومەت و ئەمەیش لەئەنجامی بەرزکردنەوەی پلەی ڕۆڵی ڕامیاریی شارەزاکان لەڕۆڵی ڕاوێژکارییەوە بۆ ڕۆڵی وەرگری بڕیارەکان دێتە کایەوە لەگەڵ گۆڕینی کارگێڕی یا ڕامیاری ناشارەزا، لەبەر ئەوەی پێوەرە هونەرییەکان شوێنی بەرژەوەندی و ئایدۆلۆژیاکان دەگرێتەوە

لـەوەرگرتنی بڕیـارە ڕامیارییەکانـدا ئـەوا زۆربـەی ناکۆکییـەکان مـۆرکی ڕامیارییـان نامێنێ.

ئەوانەی کەڕەخنە لەم گریمانانە دەگرن و بەڕاستی نازانن لەسەر ئەم بناغەیەیە (بۆ نموونە زۆر ناکۆکی ڕامیاریی بنەڕەتی ناکۆکین لەسـەر ئامانجـەکان نـەك ئامرازەکـان، شارەزایی هونەریش بەروە ئەوە دەچێ کەدابـەش بێـت بـۆ چـەندین بەشـی جیـاواز و بەشـێوەیەك کەپێویـست بـەوە دەکـات کەزانیارییـەکان ڕێـك بخـرێن و (حـوکمێکی گـشتگیر هـــەبێ) ئـــەوەش ڕەت دەکەنـــەوە کـــەئامانجی ئەوانـــەی کەحکومـــەتی تـــەکنیکارەکانیان دەوێ خـــوازراوە چـــونکە ئەگـــەر ڕامیـــاریی بایـــەخ بەچـــاکردنی ناکۆکییەکان بدات ئەوا نابێت ڕێگە بـەبڕیارە هونەرییـەکان بـدرێت پـێش پرۆسـەکانی مشتومڕ و وەرگرتنی بڕیارەکان بکەوێتە سەبارەت بەبەهاکان لەکۆمەڵگەدا.

**See also: Aristocracy ;**
**utopianism.**

## Teleological Explanation (*التفسير الغائي*) لێکدانەوەی ئامانجی

هەر لێکدانەوەیەك کەلەهێزی لێکدانەوەی دا پشت بەئامانجێك یـا بـەباری کۆتـایی ئەو دیاردەیە ببەستێ کەلێك دەدرێتەوە. بۆ نموونە حیزبە ڕامیارییـەکان بەمەبەسـتی دەست خـستنی دەسـەڵاتی ڕامیـاریی دادەمـەزرێن. بـەم شـێوەیە ئـەو کاریگەرییـەی کەمەبەسـتە لـەداهاتوودا مەسـەلەیەکی پێـشوو ئـەوە کەلێکدانـەوەی حیزبـەکان پێـشکەش دەکـات وەك دەردەکـەوێت. لەڕاسـتیدا وەسـف کردنـی میکانیزمـەکانی خۆراکپێدانی گەڕاوە دەریدەخات کەلێکدانەوەی ئامـانجی بەشـێکە لەلێکدانەوەیـەکی سـەرپێیی . وادیـارە کەلێکدانـەوە ئامانجییـەکان پێویـستیان بەتوێژینەوەیـەکی ورد هەیـە. ڕەنگـە هەنـدێك شـێوەی دیـاریکراوی ڕێکخـستن و بەشـێوەیەکی خـولی کاریگەرییەکی دیاریکراوی هەبێ بەڵام ئـەوە لەوانەیـە بەشـێك بێـت لەمەبەسـتی هـەر

تاکێکی پەیوەندیدار. لەوانەیە شوێنەوارەکان ئەنجامی نەویستراوی کار بن و لەوانەیە کە دەستەواژەی وەك (بۆمەبەستی) ساختەو خەڵەتێنەر بن. ئەو لێکدانەوانەی کەئامانجی دیارن لەشێوەدا بەلاّم پشت نابەستن بەمەبەستێکی مرۆڤانە یا ئاسمانی، وا بەباش دەزانرێت کە بەشێوەیەکی سەربەخۆ پۆلێن بکرێت وەك کۆمەڵە لێکدانەوەیەك لەگەڵ ئەوەشدا کەهەندێك لەنوسەران وا مامەڵە لەگەڵ لێکدانەوەی فەرمانی دەکەن کەجۆرێك بێت لەلێکدانەوەی ئامانجی.

**See also :explanation : feedback ;**
**Functional explanation ; hermeneutics.**

## Tendency Statement دەربڕینی مەیل (بیان المیل)

دەربڕینێکە لەیاسا دەچێ کەدەکرێت جێبەجێبکرێت،وەك دەردەکەوێت، بەسەر جیهانی ڕاستەقینەدا بەلاّم بەبێ هیچ ئاماژەیەکی دیاریکراو بۆ ئەو مەرجو میکانیزمانەی کەلەوانەیە بێتە ڕێی ئەو هۆیانەی کەیاسا دەیانگرێتەوە. بەم شێوەیە ئەو قسەیەی کەدەڵێ نواندنی ڕێژەیی سستمی فرە حیزب بەرهەم دێنێ دەربڕینی مەیلە نەوەك یاسایەك چونکە هیچ ئاماژەیەکی تیا نیە بەو هۆکارانەی تر کەلەوانەیە لەسستمە رامیاریی ڕاستەقینەکاندا هەبێت کە کار دەکاتە سەر ژمارەی حیزبە ڕکابەرەکان بە شێوەیەکی جددی: وا دیارەکە ئەم جۆرە دەربڕینانە بەشێوەیەکی تیۆریی دەربڕی ئەو میکانیزم و هێزە ڕاستەقینانەیە بەلاّم خۆی لەخۆشیدا قابیلی تاقیکردنەوەی ئەزموونی نیە. زاراوەی (مەیل) هاو واتای زاراوەی (ئاراستە Trend) بەکار دێت، ئەم بەکار هێنانەش پەشۆکێنەرە چونکە وەك ئاماژەمان پێدا مەیلەکان دیار نین لەو بزوتنەوە ڕێکخراوانەدا کە ئاراستەکان لەخۆ دەگرێت. دەستە ئایدۆلۆژییەکانی ناو حیزبەکان و بزوتنەوەکانیش وەك مەیل وەسف دەکرێن وەك

ئاراستەی توندڕەو لەناو پارتی کرێکارانی بەریتانیدا لەدەیەی حەفتاکان و هەشتاکاندا.

See also: Law (a) :scentific law;
Trend.

## *Theocracy* حکومەتی ئایینی (تیۆکراسی) *الحكومة الدينية*

شێوەیەکە لەحوکم کەتیایدا فەرمانڕەوا یا فەرمانڕەواکان (کەلەوانەیە شێوەیەك لەکەهەنەتەتیش بن) وای دەردەخەن کەئەوان ڕۆڵی ڕامیاریی و ئایینییان وەك بریکاری ڕاستەوخۆی پەرستراوێك ئەنجام ئەدەن و شەریعەتە ئایینییەکان تێدا سەرچاوەی سەرەکیی پەیوەستییە ڕامیارییەکانە.
حکومەتی ئایینی شێوەیەکە لەحوکمی زۆرە ملییانەی حکومەت بەهۆی بنەماکانی شەریعەتە ئایینییەکانەوە کەحکومەت پشتی پێ دەبەستێ.
حکومەتە ئایینییەکان وەك دەوڵەتی عیبری لەکۆنداو حوکمی کالڤن لەجنێڤ لەسەردەمی چاکسازیی ئایینی و تەبت لەکاتی دالای‌لامادا پێش داگیرکاری چینی و ئێران پاش لابردنی شا.

See also: Absolutism.

## Theory (*النظرية*) تیۆر

کۆمەڵێك یاساو حوکمی گشتییە کەیەکانگیرکراون و دەتوانێت لێکدانەوەیەکی نیزامی بۆ بوارێکی مەعریفی دابین بکات یا کۆمەڵێك تێبینی یا ئەوەی کەلەوانەیە بۆ پێشبینی کردن بەڕووداوەکان بەکار بێت یا ئەوەی کەڕەفتارێك دەسەپێنێ پێویستە پەیڕەوی

لێبکرێت. ئەم جۆرەی دوایی جۆرێکە لەتیۆری (پێوانەیی) شیکردنەوەی رامیاریش بەشێوەیەکی زۆر ناوەندیی بایەخ دەدات بەتیۆرە (زانستی) یا (ئەزموونیەکان) کەئامانجیان لێکدانەوەی رووداوە رامیارییەکان یا پێشبینی کردنیانە. وادادەنرێت کەئەو تیۆرانە بەگشتی ئاماژەیان تیایە بۆ ئەو قەوارە و پەیوەندییانەی کەقابیلی چاودێری نین بەشێوەیەکی راستەوخۆ بەلاَم لەوانەیە کەبەشێوەیەکی ناراستەوخۆ تاقیبکرێتەوە لەرێگەی تێبینیەوە. بۆ نموونە لەوانەیە تیۆرێک تاقیبکرێتەوە کەئاماژەی تیایە بۆ سەرچاوەکانی هێزو پەیوەندییەکان لەناو سیستمێکی رامیاریدا مادەم گریمانە پێشکەش دەکات دەربارەی ئەنجامی راستەقینەی ململاَنێکانی نێوان رەگەزە رامیارییەکانە.

روانینێك هەیە کەتارادەیەك سادەکراوە، بۆ تیۆرێك کەپێی دەوترێت وەسفی (چینی_ کێك) . چینی یەکەم بریتیە لەکۆمەڵێك راستی ئەزموونی کەبەتێبینی کۆیان دەکەینەوە، پاشان حوکمە گشتییەکان دادەنێین سەبارەت بەم راستیانە، دوای ئەمەش هەوڵ ئەدەین کەئەم حوکمە گشتییانە لێك بدەینەوە بەجووت کردنیان لەگەڵ ئەو گریمانانەدا کەئاماژەن بەو قەوارانەی کەتێبینی ناکرێن واتە ئێمە تیۆرێك بینا دەکەین لەوانەیە کەپرۆسەی جیاکردنەوە بەردەوام بێ بۆ چەند چینێك و تیۆرەکانی چینی یەکەمی سەرەوە بینا دەکرێت بۆ لێکدانەوەی خوارەوە، زۆربەی کات چینەکانی ئەم تیۆرە بەپێی مەودای ئاستی گشتێتی ناو دەبرێت: تیۆرە (تەسك مەوداکان) یا (هەندەکیەکان) (کەسەبارەت بە رەفتاری یاسادانین لەرامیاریی پەرلەمانی بەریتانیدا پاش شەڕ بۆ نموونە) و تیۆری (مەودای ناوەنجی) (کەتیۆرێکە لەکاری رامیاریی یا لەسیستمی رامیارییدا) .پاش بیناکردنی تیۆرەکە لەوانەیە بەکاری بێنین بۆ دروستکردنی کردنی گریمانەی تر کەلەوانەیە تاقیکردنەوەی بەرەو ئەوەمان ببات کەتیۆرەکە راست بکەینەوە یا رەتی بکەینەوە. رەنگە ئەوەی سەرەوە ئاماژە بەوە بکات کەتوێژینەوەی رامیاریی بەشێوەیەکی ئاشکرا دابەش دەبێ بۆ چەند قۆناغێك لەتێبینی و پێك هێنانی چەمکەکان و بیناکردنی تیۆرەکان و ئامادەکردنی و

تاقیکردنــەوەی و جێبەجێکردنی،بەدەگمــەن ئەمــە بارەکــە دەبێــت و ئــەم پلانــە چارەســەرکەرە بەشــێوەیەکی نموونــەیی تارادەیــەك جیاکردنــەوەی زەحمەتــە لــە نمایشکردنی توێژینەوەکەدا،یەکێك لەو هۆیانە ئەوەیە کەوەسفی چینی – کێك بریتیــە لەهەڵەیەکی مەترسیدارەوە. ناکرێـت کـەتێبینیکردنیش ڕوو بـدات لەحاڵـەتی نـەبوونی پێوەرەکـانی هەڵبژاردنـدا. لەبـەر ئـەوە دەبێـت کـەپێش کۆمـەڵێك تیـۆر و گریمانـەی کۆکردنەوەی زانیارییەکان بکەوێت. زاراوەی (تیۆر) لەزانستی ڕامیاریشدا بـەکار دێ بۆ وەسفی هەر کۆمەڵێك لەو گریمانەو چـەمکانەی کەپـەیوەنـدیان بەیەکـەوە هەیـە بـە شێوەیەکی گشتی و بەکار دێت لەشیکردنەوەی ڕامیاریدا.

زۆر جار دەوترێت کە (تیۆرەکـانی) لـەم جـۆرە بەهایـەکی یارمەتیـدەریان هەیـە لەدۆزینەوەدا مەبەست لەمەش ئەوەیە کە کۆمەڵی گریمانە و چـەمکەکان خۆیـان هـیچ گریمانەیەکی بنەڕەتی پێشکەش ناکەن دەربارەی جیهـان بـەڵکو لەوانەیـە کـەهێڵێکی دیاریکراو هان بدات لە توێژینەوەدا و پێشنیاری ڕێبازێکی دیاریکراو دەکات سەبارەت بەبابەتەکەو یا بەپێچەوانەی ئەوەوە، یارمەتی ئەدات لەگەڕان بەدوای مەعریفەدا.

**See also :Concept ; explanation;**
**hypothesis ; law (a) :**
**scientific law; normative theory ;**
**operationalization ; poliitical theory ;**
**realism (a) : scientificrealism.**

## Third World جیهانی سێیەم (*العالم الثالث*)

زاراوەیەکە بەکار دێ بۆ وەسفی ئەو وولاتانەی ئاسیاو ئەفریقیاو ئەمریکای لاتینـی کە سەربە (جیهانی یەکـەم) نـین (دەوڵەتـە پیـشەسازییەکان) یـا (جیهـانی دووەم) (واتە یەکێتی سۆڤیەت و دەوڵەتە شوعیەکان کەپێشتر سەر بەو بوون ئەو دەوڵەتانەی پێـوەی پـەیوەسـتن لەڕۆژهـەلاتی ئـەورووپادا. وولاتــەکانی جیهـانی سـییەم لـەڕووی

ئابوورییــەوە داوکــەوتوون و کۆلــۆنی پێــشوون یــا دەوڵــەتی پاشــکۆی دەوڵەتــە ڕۆژئاواییەکانن لەزۆربەی کاتدا لەژێر حوکمی تۆتالیتاریدان. بەڵام (جیهانی سێیەم) جۆرێکی فراوانەو ئاڕادەیەك وردنیە چونکە هەندێك لەو دەوڵەتانەی کەوا دادەنرێن کەسەر بەم کۆمەڵەن دەوڵەمەندن (وەك دەوڵەتەکانی بەرهەم هێنەری نەوت) و هەندێکیان دیموکراسیین و هەندێکییان ئێستا لەڕووی پیشەسازییەوە پێشکەوتوون بەشێوەیەك کەبەڕاستی بەدەوڵەتی جیهانی سێ دانانرێن. زاراوەکە لەدەیەی پەنجاکانی سەدەی بیستەمدا دەلالەتی نالایەنگرانەی هەبووە بۆ هەر دوو هاوپەیمانێتیی ڕۆژئاوایی و کۆمۆنیستی بەڵام ئەم مانایە لەو کاتەوە وون بووە.

See also : political development.

## Toltaliarianism (الاستبدادیة) تۆتالیتاریزم

زاراوەکە لەبنەچەدا مۆسۆلۆنیی بەکاری هێناوە بۆ چەسپاندنی باڵا دەستیی دەوڵەتی فاشیستی بەسەر تاکداو ئێستا زاراوەیەکە بەسەر دەوڵەتێکدا جێبەجێ دەکرێت کەهەوڵی پیادەکردنی دەست بەسەراگرتنی تەواو ئەدات بەسەر هەموو لایەنەکانی بوونی کۆمەڵایەتیدا لەناو زەویەکانیداو هانی هیچ جیاکارییەك نادات لەنێوان گشتی و تایبەتیدا، و لەنێوان ڕامیاریی و ناڕامیاریدا. چەمکەکە هەمیشە بەسەر دەوڵەتە نوێکاندا جێبەجێ دەکرێت چونکە پەیوەندییان هەیە بەبەکارهێنانی ئامرازە پێشکەوتووەکان لەڕووی تەکنۆلۆژییەوە بۆ پەیوەندیکردنی جەماوەری و ڕێکخستن و سازدان و دەست بەسەراگرتن. وا باوە کەتۆتالیتاریزم بینیەوە لەگەڵ هەوڵی ڕێکخراو بۆ بەدی هێنانی ئامانجی دیاریکراو کەزۆربەی کات (ئایدۆلۆژین)، لەوانەیش هێزی ڕامیاریی پیادە بکرێت بەتایبەتی لەڕێگەی یەك حیزبەوە لەپەیوەندییەکی هاوژیایدا لەگەڵ دەوڵەتدا کەوەك ڕەمزێك بۆ ئایدۆلۆژیاو پێشەنگی ئایدۆلۆژیای دەوڵەت کار دەکات. مادەم ئەو ڕێکخراوانەی کەدەوڵەت نین پشتگیریی

لەبەهاو ئامانجێك دەكات كە بەپێویست لەگەڵ ئەو بەهاو ئامانجانەدا رێك ناكەوێ كەئایدۆلۆژیای دەوڵەت پێویستیەتی ئەوا دەبێت دەوڵەت یا حیزب وەك باڵا دەست یا سەرپەرشتیاری هەموو رێكخراوە رێ پێدراوەكان رەفتار بكات و ئەو دەوڵەتانەش وا دادەنرێن كەنزیك دەبنەوە لەجۆری نموونەیی وەك ئەڵمانیای نازی و یەكێتی سۆڤیەت لەسەردەمی ستالیندا و چین لەسەردەمی ماوتس تۆنگدا.

See also: Absolutism ; autocracy;
Corporatism (a) : Ideogy; fascism;
Ideal type; ideology ; mobilization;
society

## Treaty (الخيانة) ناپاكی

تاوانێكە كەهەوڵی ڕوخاندنی ڕژێمی خوكمی دەوڵەتێك لەخۆ دەگرێ بە ئامرازە ناشەرعییەكان و هاولاتییەك ئەنجامی ئەدا كەملكەچی ئەو دەولچەتەیە لەهەندێك لەپێناسە یاسایەكاندا وا دادەنرێ كەهەوڵی كوشتنی پاشا یا یارمەتیدانی دوژمنی دەوڵەت لەكاتی شەڕداش بگرێتەوە و بەتاوانێكی هەرە گەورە دادەنرێ كەسزاكەی لەسێدارەدانە لەو دەوڵەتانەدا كەسزای لەسێدارەدانیان هێشتا هەیە.

See also: Seditio

## Teaty (المعاهدة) پەیماننامە

ڕێكەوتنێكە یا تۆمارێكی نیزامیی ڕێكەوتنێكە، لەنێوان دوو دەوڵەت یا زیاتردا یا لەنێوان كۆبوونەوەی دەوڵەتان (وەك فیدراڵی) و دەوڵەتانی تردا. لەوانەیە كە ئەم پەیماننامە لەنێوان هەرێمەكان دەوڵەتێكی فیدراڵیش دابەستری (پەیماننامەی

ویلایەتەکان) یا لەنێوان دەوڵەت و کڵێسادا (وەك ڕێکەوتنی نێوان دەوڵەت و کڵێسای کاسۆلیکی)، ڕێکەوتنی پەیماننامەکە گفتوگۆ لەسەر ئەو پەیوەندییە ئایندەییە دەکا لەنێوان ئەو لایەنانەی کە ئیمزایان کردوە لەنێوان یەکێك و ئەوی تردا یا لەهەندێك باردا وەك پەیماننامەی بڵاو بونەوە. لەساڵی 1970 دا (سەبارەت بەتەکنۆلۆژیای ناوکی و پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەو دەوڵەتانەی کە لایەن نین لەپەیماننامەکەدا. هەندێك جاریش ناوی تر ئەدرێت بە پەیماننامەکان وەك ڕێکەوتنەکان یا هاو پەیمانێتییەکان و سەرچاوەی سەرەکین لە یاسای نێو دەوڵەتیدا و ئامانجەکانی ئەمانە بوون: کۆنکردنەوەی ناکۆکیەکانی سنور، و دان نانی ڕەسمی بەهاو پەیمانێتی،و دروست کردنی ڕێکخراوە فرە ڕەگەزەکان و مەرجەکانی چارەسەرکردنی ئاشتییانە، لەنموونەکان وەك ڕێکەوتنامەی جنێڤ سەبارەت بەخاچی سور لە ساڵی 1864 داو پەیماننامەی ڤێرسای لەساڵی 1919 داو پەیماننامەی ڕۆما سەبارەت بە دامەزراندنی بازاڕی ئەورویی هاوبەش ساڵی 1957 و پەیماننامە بەستراوەکانی ساڵی 1990 لەنێوان کۆماری ئەڵمانیای فیدراڵ و کۆماری ئەڵمانیای دیموکراتی کەڕیی خۆشکرد بۆ سەر لەنوێ یەکگرتنەوەی ئەڵمانیا.

**See also :Internationalk relations ; pact; Protocol (b) : treaty.**

## Trend ئاراستە (الاتجاه)

بزووتنەوەیەکی ڕێکخراوە تارادەیەك (لەگۆڕاوێکدا یا لەپەیوەندی لەنێوان دوو گۆڕاودا بەدرێژایی ماوەیەکی زەمەنی لەبارێکی دیاریکراودا.
دەربڕینەکان جیاوازن لەئاراستەو یاساکان چونکە ئەمان ئاماژەن بەبارە دەگمەنەکان نەك بارە گشتگرەکان و لەوەی پێشوتر زیاتر پێویستیان بەلێکدانەوە هەیە.

**See also :Explanation; law (a) :scien-**

Tific tendency ; statement
.Trotskism
See also : Bolshevism.

## Two-party System سستمی دوو حیزبی (نظام الحزبین)

بریتیە لەو سیستمە حیزبییەی کە دوو حیزب تیایدا پێشبڕکێ دەکەن کە پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە (لەزاراوەکانی ساتۆریدا) بۆ بەدەست هێنانی دەسەلآت. ئەمریکا وەك بارێکی نموونەیی دادەنرێت لەژیانی حیزبایەتیی دوو حیزبیدا. بەلآم ئەگەر نیشاندەری سیستمی دوو حیزبی وا دانرا کەبریتیە لەو بەرپرسیارییەی کەزیاتر نیە لەدوو حیزب بەتۆرە کەحکومەتەکان پێك دێنن و ئەوە ئەنجام ئەدەن بە بێ ئەوەی پێویستیان بەئیئتیلاف بێت ئەوا بەریتانیا (هەندێك جار دەوڵەتە ئەنگلۆ- ساکسۆنییەکانی تر لە کۆمۆنۆێلثی بەریتانیدا) زۆربەی کات پەیڕەوی سیستمی دوو حیزب دەکات لەئەنجامی بەکار هێنانی سستمێکی هەلبژاردنی واوە کەزیان بەحیزبە سییەمەکان دەگەیەنێ.

See als :Multi-party system ;
party system.

## Typology لێکۆڵینەوەی پۆلێنی (الدراسة التصنيفية)

بریتیە لەلێکۆڵینەوەی هەندێك لەو دیاردە گشتییانەی (وەك حکومەت و ڕۆشنبیریی ڕامیاریی) لەڕێگەی دابەشکردنیان بۆ کۆمەلێك چین یا جۆر، یا خستنە ڕوویەکی نیزامی بەو پێوەرە بنەڕەتییانەی کەدیاردەکانی پێ پۆلێن دەکرێت. ئەم زاراوەیە تارادەیەك نوییە لەجێبەجێکردنیدا بەسەر توێژینەوەی ڕامیاریی و کۆمەلآیەتیدا بەلآم

پرۆسە وەسفکراوەکە کۆنە هەروەك ڕامیاریی خۆی. نموونەکان بریتین لەپۆلێنکردنی شێوەکانی حوکم کەئەفلاتون و ئەرستۆ بەکاریان هێناوە (پاشایەتی و زۆرداریی و ئەرستۆکراسی و حکومەتی کەمینە...) پۆلێنی ویبەر بۆ دەسەلاتی تەشریعی) پۆلێنی (موند) بۆ ڕۆشنبیریی ڕامیاریی (تەسکبینی و پاشکۆو بەشداریکەر) .

See also: Classification ; ideal type.

# U

## Underdog Effect کاریگەری دۆڕاو (تأثير الخاسر)

زیادبوونی پشتگیریکردنی پاڵێوراوێك یا حیزبێك لەهەڵبژاردندا وا دادەنرێت کەبەهۆی ئەو زانیارییانەوەیە کەپێشبینییەك لەخۆ دەگرێت بەئەنجامی چاوەڕوانکراوی ئەو هەڵبژاردنانە (بەبڵاوکردنەوەی ئەنجامی ڕاپرسییەکان بۆنموونە) کەئاماژە بەوە دەکات کە ئەو پاڵێوراوە یا ئەو حیزبە لەوانەیە هەڵبژاردنەکە بدۆڕێنێ بەتایبەتی ئەگەر دۆڕانەکە چاوەڕوانکراو نەبێت و ئەم زیاد بوونە ڕوونادات یا کەمتر دەبێت ئەگەر ڕاگەیاندنی ئەو پێشبینیە نەبوایە.

See also:Bandwagon effect.

## Unicameral ئەنجومەنی یاسادانانی تاکی (المجلس التشريعي الأحادي)

زاراوەیەکە بۆ وەسفکردنی یەك ئەنجومەنی یاسادانان بەکار دێت وەك پەرلەمانی هەنگاری یا ئەنجومەنی نوێنەرانی نیوزلەندی و ئەنجومەنی نوێنەرانی نیوزلەندی و ئەنجومەنی یاسادانانی ویلایەتی نبراسکای ئەمریکی و ئەنجومەنەکانی یاسادانان لەویلایەتە ئەڵمانیانەکاندا تەنها ژمارەیەکی کەمی دەوڵەتانەی دیموکراتیش ئەم ئەنجومەنە یاسادانانە تاکییەیان هەیە .

## Unitary State دەوڵەتی یەکی (الدولة الوحدية)

دەوڵەتێکە کەباڵا دەستی و دەسەڵاتی حکومەت لەدەسەڵاتێکی ناوەندی چڕ

دەبێتەوە و داەبەش نابێ لەنێوان یەکە جوگرافییە بچوکترەکاندا وەك لەدەوڵەتی فیدراڵیدا. دەوڵەتی یەکی سیستمەکانی حوکمی خۆجێیی هەیە و لەوانەشە کەرێکخستنەکانی دەسەلآت پێدانی هەرێمیش هەبێت بەلآم ئەمانە بەخشینی دەسەلآتن لەو دەوڵەتەوە کەلەوانەیە راستبکاتەوە یا پوچەڵیکاتەوە،بەریتانیاو فەرەنسا و سوید نموونەی ئەم جۆرە دەوڵەتە یەکی یەن.

**See also :Confedration; devolution ; Federation ;sovereignty.**

## Utilitarianism رێبازی سوودگەرایی (*مذهب المنفعة*)

ئایدۆلۆژیایەکی رەوشتییە لەبنەڕەتدا و (جیریمی بێنتام) پەرەی پێدراوە و (جۆن ستیوارت مل) دەستکاریی کردووە و تا ئێستا پێگەیەکی ناوەندی هەیە لە بیری رۆژئاوای نویدا. ئەم ئایدۆلۆژیایە پیی وایە کەکامەرانی تەنها شتێکی باشە لەجەوهەردا و هەموو کارەکان بەتایبەتی ئەو یاسایانەی کەپێویستە هەوڵ بدات کە پشتگیری کامەرانی هەرە گەورە بکات بۆ گەورەترین ژمارە. لەو شتە گرنگانەی کەلە سەرنج راکێشیی ئەم ئایدۆلۆژیایەدایە بریتیە لەوەی کەدەکرێت بگەینە رێکەوتنێکی گشتی سەبارەت بەدیاریکردنی کامەرانی و هەڵسەنگاندنی ئاستە مومکین و جیاوازەکانی لەناو دانیشتواندا. رێبازی سوودگەرایی هەوڵ ئەدات کەپێوەرە تەقلیدیەکانی یاساو جیاوازیی (لاهوت و یاسای سروشتی بۆ نموونە) بگۆرێت بەیەك پێوەر بۆ کامەرانی یاخۆشگوزەرانی و وای دادەنێت کەدەکرێت بپێورێت. ئەم پێوەرەش ئازادە لەچڕبوونەوەی لەحوکم و هەستە راستەقینەکانی تاکەکان و نمایشکردنی بارێکی بەڵگە نەویست بۆ دەست تێوەرنەدانی دەوڵەت لەهەوڵی تاکەکان بۆ دەستخستنی چێژ، ئەم مەزهەبە یەکسانیخوازە لەخستنە ناوی هەموو کارتنکراوەکان لەحساباتی خۆیداو دژی تەوژمی پارێزکارانەیە لەرەتکردنەوەیدا بۆ

بەهای بنەڕەتیی داب و نەریتەکان. لەوانەیە ئەم جۆرە ئاراستانە ڕووبەڕوو ببنەوە بەخستنە سەر بۆ ئایدۆلۆژیاکەو ڕاستکردنەوەی وەك سوربوونی (مل) لەسەر بەهای جیاوازی چێژ (بەرزتر) و (نزمتر) و پێداگرتنی پنتام لەسەر ئەنجامە بەئازارەکانی نائارامی وبەردەوام نەبوون و دان نانە بەو بارانەی کە ڕەنگە گەڕانی ئازاد تیایدا بەدوای چێژدا لەلایەن تاکەکانەوە ببێتە مایەی شکستی خۆیی. هەروەك چۆن زاراوەی (سود گەرایی نێگەتیڤ)، بەکار دێ کەڕایەکە پێ وایە لەڕووی ڕەوشتییەوە دەبێت کەم کردنەوەی ئازار بایەخی سەرەکیمان بێت چونکە هەر زیاد بوونێك لەچێژدا دەبێت بە بەردەوامی بەگرنگ دانەنرێت بەبەراوورد لەگەڵ ئازارەکاندا. لەلایەنی ڕامیاریشەوە پێویستە لەسەرمان گەڕان بەدوای کامەرانیدا بەجێ بێڵین بۆ بڕیارە تایبەتیەکان لەگەڵ هەوڵدان بۆ گونجاندنی ڕامیاریی بۆ گواستنەوەی بەدبەختی.

**See also: public goods: liberalism:**
**Law (c):natural law; parcto optimum;**
**Rational choise analysis; utility.**

## Utitlity سود (*المنفعة*)

بریتیە لەو سودەی کەلەئەنجامی بەکاربردنی شمەکێکەوە بەدەست دێ (شمەك و خزمەتگوزاریی...هتد) کە بەئاماژە بە پەیژەی بەها دەنرخێنێت یا بەباش زانینی بۆ بەکاربەری تاکیو سودی سنووریی بریتیە لەزیاد بوون لەو سودەی کە وەرگیراوە لە دواین یەکەی کڕاوو لەشتێك. لەوانەیە سودەکان بەشێوەیەکی ڕیزکراو وەسف بکرێن یا بەهای ڕەسەن بدەن (cardinal values) ئابوری ناسە نوێکان ئەوە دەسەلمێنن کەپێوەرێکی ڕەها نییە بۆ سوود بۆیە خۆیان لەبەکارهێنانی سودی ڕەسەن لادەدەن و لەباتی ئەوە لەپلە ڕیزکراوەکانی سودە پەراوێزیەکانی شمەکەکاندا چڕ دەبنەوە . مادەم ئەمەش تەنها وەسفێکی بەباش زانینەکانی کەسێکە لەنێوان

جێگرەوەکاندا ئەوا زۆر کەس بەباشیان زانیوە یان بەلانی کەمەوە قسەکردنیان لەسەر (سستمی بەباش زانین) هەڵبژاردووە لەباتی (سود) .

## Utopianism (الطوبائیة) یۆتۆپیاگەرایی

فەلسەفەیەکی کۆمەڵایەتی یا تیۆرێکی رامیارییە کەپشت دەبەستێ بەنوقڵانە لێدان سەبارەت بەرێکخستنە کۆمەڵایەتی ورامیارییەکانی کۆمەڵگای تەواو .لەوانەیە ئەم جۆرە نوقڵانەیە رێسایەکی راشکاو بێت، بەومانایە کە هەوڵ ئەدات بۆ جێبەجێ کردنی تەواوی نمونەی هەرە بالاّ یا لەوانەیە ئامانجی بریتی بێت لە پێشکەشکردنی پێوەرێکی نمونەی کەحوکمی پێ دەدات بەسەر ئەو دەزگایانە کەهەن. کتێبەکانی هەندێك لەنوسەرە یۆتۆپیا گەرەکان پلانی درێژی دیاری کراوی تیایە بۆ ئەندێشەی رامیاری و کۆمەڵایەتی وەك یاسای ئازادی (Law freedom) جیرادۆنستانلی (1652) کتێبی (oceana) جێمز هارنگتن (1656) کتێبی (دیدگایەکی نوێ لەکۆمەڵگادا (3) (1814–1818) . هەندێکی تر پێکهاتەی ئەندێشەیی بەکار دێنن بۆ دۆزینەوەی پرەنسیپە کۆمەڵایەتیەکان بەشێوەیەکی گشتی تر لەدانراوە فەلسەفیە ئاشکراکاندا بۆ دۆزینەوەی پرەنسیپە کۆمەڵایەتیەکان بەشێوەیەکی گشتر تر لەدانراوە فەلسەفییە ئاشکراکان و لەچەندین رۆماندا: کتێبی (کۆمار) ی ئەفلاتون وەك کۆنترین نموونە باس دەکات کتێبی (یۆتۆپیا) ی تۆماس مۆر وەك ناونیشانی رێبازەکە پێشکەش دەکات. هەندێك جار پیی دەوترێت وێناکردنە ئەندێشەییەکانی کۆمەڵگا ناتەواو و نەویستراوەکان. لەنمونە دیارەکانیش رۆمانی (جیهانی نویی ئازا) ی ئەندۆس هیکسلییە (1932) و رۆمانی (1984) ی جۆرج ئۆروێل) .

مارکسیش بیری سۆسیالیستی سەرەتا بەتایبەتی نوسینەکانی ئەوین و فۆریەری بە یۆتۆپیایی و نازانستی داناوە و ووتویەتی کەئەم جۆرە پلانانە تەنها بایەخی بەنەخشەکانی ئایندە داوە بەبێ گویدان بەو هێزانەی کەرێ لەبەدی هێنانیان دەگرێت.

**See also: Socialism**

# V

Valence issue See :issues

## Validation سەلماندنی یاسایی (الأثبات القانوني)

بریتیە لەهەڵسەنگاندنی پێناسە زانستییەکان و نیشاندەرەکان و شێوازە ئامارییەکان و پێوانەکان بەشێوەیەکی گونجاو بۆ نوێنەرایەتیکردنی قەوارەکان و پەیوەندییە تیۆرییەکان.

دەکرێت بوتریت کە (هێز) بۆ نموونە، پیادە دەکرێت کاتێک کە (أ وا لە ب دەکات شتێك بکات کە ب نەیدەکرد بەپێچەوانەی ئەمەوە) . ریژەیی هێز بۆ أ یەکەیەکە لەسەر بناغەی بەڵگەی نمایشی رامیاریی سەرکەوتوو لەلای أ پوچەڵ دیارە چونکە هیچ هۆیەك نییە وا دابنرێت کەپێشنیارکەری رامیاریی بەتەنها خۆی رەفتاری ئەوانی تر دەگۆرێت. دەستکردن بەرامیاریش نیشاندەرێکی دروست نییە بۆ ئەم چەمکەی هێز دەکرێت کە (validity) چاك بکرێت بەخستنە سەری هەوڵدانێك بۆ دیاریکردنی ئەوەی کە کێ پاڵپشتکردنی پێویستە و چەسپاندنی ئەوەی کەهەندێك گۆران لەرەفتاردا لەئەنجامی رامیارییەوە بووە. دەبێت مەشروعیەت و پشت پێ بەستن تێکەڵاو نەکرێن و لەوانەیە کەنیشاندەرەکە یا شێوازی پێوانەکە راست بێت بەڵام پشتی پێنابەسترێت ئەگەر ئەو زانیارییانەی کەئامارەی پێ دەکات ورد نەبێت و بتوانرێت کەبە شێوەیەکی جیاواز جێبەجێ بکرێت لەلایەن چەندین تاکی جیاوازەوە. بەنەبوونی تۆمارە نوسراوەکان بۆ گفتوگۆکردن لەسەر رامیارییەکان ئەوا پشت بەستن بەبیرکەوتنەوەی بەشدارەکان رەنگە ئامرازێك بێت کەپشتی پێ نابەسترێت لە رێژەی (هێز) دا.

**See also: Concept: operationalization**
**Theory.**

## Value Judgement حوكمی هەرمەكی (الحکم الأعتباطي)

زاراوەیەكە كەلەدوو مانای پەیوەندیدار بەیەكدا بەكار دێ كەهەندێك جار بەوە جیا دەكرێنەوە كەحوكمی هەرمەكی و خەملێنراوە حوكمی هەرمەكیی دیارن مانای یەكەمیش مەبەستە بەشێوەیەكی زیاتر دووبارە. حوكمە هەرمەكییە خەملێنراوەكان زانیاری گەلێكن كەدەربڕی بەهای شتێكن بەپێی كۆمەڵێك بەهایان بەباش زانین.

وونەی وەك (دیموكراسیەت شێوەیەكی باشە بۆ حكومەت) لەوانەیە ئاماژە بكات بە پێوەری تری بەها كەپێی وایە دیموكراسیەت بەسودە لەبەدی هێنانیدا (دادپەروەریی و ئازادیی بۆ نموونە) یا رەنگە دەربڕی رایەك بێت بەوەی كەدیموكراسیەت لەبنەڕەتدا ویستراوە و خۆی لەخۆیدا باشە.دانانی حوكمە هەرمەكییەكان شتێكە كەجیاوازیی هەیە دەربارەی بەڵام بەگشتی یا بەراپۆرت دادەنرێت دەربارەی هەست و سۆزە تایبەتیەكان (هەست بەخۆشی دەكەم لەبەرامبەر دیموكراسیەتدا) یا فەرمان (پشتگریی لە دیموكراسیەت بكەن) . هەڵوێستەكان لەشێوەیە پەیوەستییەك دەچەسپێنێ لەبەرامبەر (بەهای ئازادی) دا و ئەو رایەی كەپێیە وایە دەبێ حوكمە هەرمەكیەیەكان رێگە بدرێن تا كار لەپرۆسەی توێژینەوە بكەن. زانستی رامیاریی ئامانجی ئەوەیە كەوەسفی واقیعی بابەتی زانستی رامیاریی بكات و لێكی بداتەوە و هیچ پەیوەندییەكی نیە بەوەی كەتوێژەر حەزی لێیەتی یا لیی نیە. بەڵام زۆر كەس وای دادەنێن كەبەهای ئازادی ئەستەمە چونكە ئەو زمانەی كەبەكاری دێنین بۆ وەسفی جیهانی رامیاریی و لێكدانەوەی بەتوێژینەوەی بەها

دادەڕێژرێ لەبەر ئەوە (هێنەری بەهایە) . زۆربەی توێژەرەکانیش لەسەر ئەوە کۆکن کەلانی کەم دەبێت هەڵبژاردنی گرفتێك یا بوارێکی توێژینەوە حوکمێك بێت. لەسەر بەهادا بۆیە دەبێت کە (پەیوەندبێت بەبەهاوە). حوکمی هەرەمەکی دیار بڕیارێکی وەسفکردنە یاپۆلێن کردنەکە لەجێبەجێکردنی پێوەرە جێگرەوەکان بەشێوەیەکی ئاشکرا دورتر دەڕوات. زۆر لەچەمك و جۆرە بەکار هاتووەکان لە شیکردنەوەی ڕامیارییدا جێبەجێکردنی ژمارەیەك پێوەری جیاواز لەخۆ دەگرێت . بۆ نموونە ئەستەمە لەڕاپۆرتێکدا کەسیستمێکی ڕامیاریی بەدیموکراتی داناوە، هەموو پێوەرەکان بەشێوەیەکی بەس بۆ دیارکردنی پۆلێنێکی ئاشکرا کەقابیلی ناکۆکی نەبێت بۆ هەموو برە ڕاستەقینەکان دەست نیشان دەکات. وردیی ڕێکخستنی پرۆسەکان (o perationalization) هەر چۆنێك بێت چەند حاڵەتێکن ناکرێت کەپرۆسەکانی تیایدا بەتەنها بریتی دەبن لەڕێنمایی و لەبەرچاوگرتنێك کەدەکرێت تاکە جیاوەزەکان بەرێگەی جیاوازەکان بەکاری بێنن و ڕێژەی رشواڵەت بەشێوەیەکی بەشی بریتیە لەمەسەلەی حوکم.

ئەوەی کەدیارە کە ئەم دوو بەکار هێنانە یەك دەخا لەگەڵ ناوەڕۆکە جێگرەوە جیاوازەکانــدا لەهەر دوکیانــدا ئەوەیە کەناکرێت سەلماندنی ڕاستی حوکمێکی هەرەمەکی دەربکرێت چونکە ڕێساکەی دیاری نەکراوە یا لەدیاریکردنێکی گونجاودا نەتوانایە یا هەرەمەکییە یا نیە. لەوانەیە ئەم شوێنە ئاماژە بەوە بکات کە هەموو حوکمە هەرەمەکییەکان لەکۆتاییدا پەنهانن و ناتوانرێت کەبەدرێژایی لییان بتوێژرێتەوە یا بەرەخنە بپشکنرێن. ئەم جۆرە دەرەنجامە دەبێ خۆی لێ بەدووربگرێت . حوکمە هەرەمەکییەکان لەهەر دوو ماناکەدا دەکرێ کەبەهۆیە لێتێگەیشتووەکان پشتگیری بکرێن.

**See also:Essentially contested Concepts;normative theory ; Operationalization ; value.**

## Values بەهاكان *(القيم)*

بریتیە لەو ئامانجە ویستراوانە یا بێزراوانە لەهۆکارەکانی وەك ئاسایش و دیموکراتیەت و یەکسانی و ئازادی، یا ئەو پێوەرانەی کەلەهەڵسەنگاندنی بەهای ئەم ئامانجانەدا جێبەجێکراوە و هەڵبژاردنی ئامانجەکان یا ڕەتکردنەوەیان و ڕێگەکانی بەدی هێنانیان... هتد. لەوانەیە ئاماژە بکرێ بەو کۆمەڵە بەهایانە لەمانای دووەمدا کە (سیستمێکی بەهاکانە): مەودایەکی تارادەیەك یەکانگیر لەو پێوەرانەی کە بەشارەوەیی یا بەئاشکرا تاکێك یا کۆمەڵێك پابەندێتی. شیکردنەوەی ڕامیاریی بایەخ دەدات بەدیاریکردنی بەهاکان و پەیوەندیی ئاڵوگۆڕکراو و پەیوەندبوونی بەڕەفتاری ڕامیاریی و پەیوەستیی بەپەیکەرە ڕامیارییەکانەوە. لەبەر ئەوەی بەهاکانیش وەك کۆمەڵە بارێکی زەینی ئەوا ناکرێت کەڕاستەوخۆ تێبینی بکرێت بەڵکو لەڕەفتاری زارەکی یا نازارەکییەوە هەڵدەهێنجرێت.

See also: Ideology ; norm ;valu judgement.

## Variables گۆڕاوەکان *(المتغيرات)*

بریتیە لەو ڕەگەزە تایبەتمەندییانەی کەتوانای جۆراو جۆر بوونیان هەیە لە ڕووی بڕییەوە (وەك تەمەنی تاکەکان یا داهاتیان و ڕادەی پشتگیریی میللی بۆ حکومەت و ئاستی پیشەسازیی لەکۆمەڵگایەکدا) یالەڕووی جۆرییەوە (وەك باری هاوسەرێتی یا توخمی کەسەکە، و بونی شارەزایی پەرلەمانی و سروشتی شێوازی باوی بەرهەم هێنان) . ئەو ڕەگەزانەش کە ناگۆڕێ لەچوار چێوەی بابەتی توێژینەوەکە دا زاراوەی (نەگۆڕەکانی) پێ دەوترێت، لەلێکۆڵینەوەی پەیوەندی لەنێوان شۆڕش و فشاری نێو دەوڵەتی لەکۆمەڵگا کشتوکاڵییەکاندا ئەوا کۆمەڵگای کشتوکاڵی جێگیرە بەڵام شۆڕش

و فشاری نێو دەوڵەتی گۆڕاون. لەلێکۆڵینەوەیەکی فراوانتردا بۆ ئەم پەیوەندییانە لەکۆمەڵگا کشتوکاڵی و پیشەسازییەکاندا پێکەوە کۆمەڵگای کشتوکاڵی گۆڕاو دەبێت. لەوانەیە گۆڕاوەکان وەك پاشکۆ یا سەربەخۆ پۆلێن بکرێن. ئەم دەربڕینانەش ژمارەیەك مانای جیاوازیان هەیە. کاتێکیش کە گۆڕان لەگۆڕاوێکدا پەیدا دەبێت بەگۆڕان لەگۆڕاوێکی تردا ئەوا دەکرێت بوترێت کە هەردووکیان پاشکۆن (واتە یەکێکیان بۆ ئەوی تریان) کاتێکیش کەئەم جۆرە پەیوەندییە نابێت دەکرێت بوترێت کەهەردووکیان سەربەخۆن. بەڵام جوتێك گۆڕاوی پێکەوە گرێدراو لەوانەیە یەکتری لەیەك جیابکەنەوە بەوەی کەیەکێکیان پاشکۆیەو ئەوی تریش گۆڕاوێکی سەربەخۆیە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کەیاگۆڕانەکان لەگۆڕاوە سەربەخۆکەدا دەبێتە هۆی گۆڕان لەگۆڕاوە پاشکۆکەدا یا هەر هۆکار دروستکردنێك لەخۆ دەگرێت وە گۆڕانەکان لەگۆڕاوی پاشکۆدا لیی دەتوێژرێتەوە بەنسبەت گۆڕانەکانەوە لەگۆڕاوە سەربەخۆکەدا لیی دەتوێژرێتەوە.

لەو جیبەشدا کەگۆڕاوەکان پەیوەند دەبن دەکرێت بوترێت کەیەکێك لەگۆڕاوەکان (فەرمانێکە) بۆ ئەوی تریان (بۆیە جیاواز دەبێ لیی،لەوانەیە میلیەتی حکومەتیش بۆ نموونە، فەرمانێك بێت بۆ نیشاندەرێك ئابوری نیشتمانی. (ئەم بەکار هێنانەی زاراوەی فەرمان هیچ پەیوەندییەکی نیە بەگۆڕان یا شیکردنەوەی فەرمانییەوە) هەر وەك چۆن گۆڕاوەکان وا وەسف دەکرێن کە (گەشەیان ناوەکییە) یا (گەشەکردنی دەرەکییە) گۆڕاوە یەکەمەکانیش ئەو گۆڕاوانەن کەتیۆرێك یا نموونەیەك لەخۆ دەگرن، گۆڕاوە دووەمەکانیش لەناو سستمێکی تیۆریدا پێناسە ناکرێت و ئەو مەرجە زۆرو جیاوازانە لەخۆ دەگرێت کەدەکرێت بوترێت کەسستمەکە کاری تیادا دەکات.

**See also: Operationalization.**

## Verification سەلماندنی ڕاست و دروستی *(اثبات الصحة)*

بریتیە لەپرۆسەی سەلماندنی ڕاستی و دروستی گریمانەیەك لەڕێگەی تێبینی و تاقیکردنەوەوە، سەختییەکان لەبیرەکانی ڕاستی و سەلماندنی داوای لە شیکەرەوەکان کردوە کەلەم دەربڕینە ی وەك 0جێگیرکردن(coroboration) بکێشنەوە تێبینی تا ئەزموونەکان گریمانەیەکیان چەسپاندوە مادەم گریمانەکە پاش هەڵبژاردنێکی سەخت تاڕادەیەك دەمێنێتەوە (و هەڵبژاردنەکە پوچەڵی ناکاتەوە) چەند هۆیەکیش هەیە بۆ پەسەندکردنی کاتیی ئەمانەی کەماونەتەوە بەلآم ناتوانین بەشێوەیەکی گونجاو وای دانێین کەسەلماوە یا چەسپاوە یاتەنانەت ڕاستیشە. زاراوەکە بەکار دێ بۆ وەسفکردنی پرۆسەی پشکنینی ڕادەی پشت بەستن بەزانیاریەکان و شێوازەکانی کۆکردنەوەی زانیارییەکان و پێوانیان و ڕادەی بڕوا بوون بەبڕوانامەکان...هتد.

See also: Experment ; falsification;
Scieentific method ; validatio.

## *Veto* ***ڤیتۆیان مافی ظیتۆ (النقض- حق النقض)***

بریتیە لەپیادەکردنی مافێکی ڕەسمی بۆ دەزگایەك یاکەسێك بۆ ڕێگرتن لەبڕیارێك یا کارێك لەبەدەستهێنانی قەبوڵکردنی پێویست بۆ ئەوەی ئەو بڕیارە یا ئەو کارە کارا بێت. لەوانەیە مافەکە ڕەها بێت یامەرجدار بێت بەوەی کەلەژێر ڕکێفی حوکمێکی دیاریکراو دابێت و لەوانەیش سڕینەوەیەکی هەمیشەیی یا وەستێنەر (suspen-sive veto) بێت واتە بۆ ماوەیەکی ڕاگەیاندراوی کات بەکەڵك بێت. مافی ڕەهای (کە ئێستا پێویست نیە) بۆ پاشا و مافی ئەنجومەنی لۆردانی وەستێنەر بۆ یاسایەکی پەرلەمانی بەریتانی و مافی ڤیتۆی مەرجداری سەرۆکی ئەمریکی (کە دەکرێت پوچەڵبکرێتەوە بەزۆرینەی دوو سێ یەك لەهەریەك لەئەنجومەنی کۆنگرێسدا) و مافی ڤیتۆی مەرجداری بۆ بەندسرات بەڕەتکردنەوەی پێشنیارەکانی بەندستاغ

لەئەڵمانیاداو مافی ڤیتۆی ئەندامە هەمیشەییەکانی لەئەنجومەن ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ رێگرتن لەرێ و شوێنێك کەرێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دەیگرێتە بەر سەبارەت بەشتێك جگە لەمەسەلە کردارییەکان هەموویان نموونەی هێزی ڤیتۆن

See also: Veto group.

## Veto Group کۆمەڵی ڤیتۆ (مجموعة حق النقض)

هەر کۆمەڵێك کەبارێکی نیزامی یا نانیزامی وەرگرتبێت بەشێوەیەك کە مافی ئەوەی هەیە کەڕاوێژی پێ بکرێت لەو شتانەی کەکار لەبەرژەوەندییەکانی دەکات لەگەڵ توانای رێگرتن لە ڕاگەیاندنی ئەو پێشنیارانەی کەبەزیان بەخشی دائەنێت بۆ ئەو بەرژەوەندیانە. نموونەکانیش بریتین لەمانە: کۆمەڵە کشتوکاڵیەکان لەئەمەریکا و کۆمەڵەی ئەوروپی و چەندین دەوڵەتی ئەوروپیدا. سەربازییەکان لەهەندێك کۆمارەکانی ئەمریکای لاتیندا، و کڵێسای کاسۆلیکی لەئیتالیا و کۆماری ئێرلەندی. هێزی کۆمەڵی ڤیتۆش لەوانەیە لەئەنجامی پێویستی بوونی حکومەت بەپشتگیریی ڕامیاریی ئەو کۆمەڵانەو کلتوری ڕامیاری و نەریتەکانی کۆمەڵگاوە دروست بێت. یا پێگەی ستراتیژی کۆمەڵەکە سەبارەت بەسەرچاوە ئابورییەکان یاکۆمەڵایەتیەکان یا ڕامیارییە دەگمەنەکانە.

Seealso: pressure group ; veto

## Virtual representation

See : Representation Vocie See :Exit.

## Voting دەنگدان (التصويت)

بریتیە لەڕێگەیەك بۆ گەیشتن بەبڕیارێك لەلایەکانی بڕیارەکەوە بەهەڵبژاردنێك لەنێوان پێشنیازە ڕکابەرەکان و دیاریکەرەکاندا (لەڕاپرسیدا یا لەدابەشبوون سەبارەت بەلیستێك لەئەنجومەنی یاسادانان‌دا) یا هەڵبژاردنی کەسانێك بۆ پڕکردنەوەی پایەی دیاریکراو لەو دەنگدەرانەوە کە هەڵبژاردنەکانیان لەنێوان پاڵێوراوەکاندا بۆ ئەو پایانە دیاری دەکەن. پێشنیازەکە یا ئەو پاڵێوراوەی کەزۆربەی دەنگەکانی بەدەست هێناوە هەر ئەوە دەیباتەوە بەلام زۆرینە مەرجدارەکان یا ڕەهاکان لەهەندێك باری دیاریکراودا دەکرێتە مەرج. لەوانەیە ڕێگەی دەنگدانەکە بەدەست بەرزکردنەوە یابازارەکی یابەنووسین یا بەڕێگە ئامارییەکان (ئامێرەکانی دەنگدان) یائامرازە هاوشێوەکان بێت، یالەوانەیە دەنگانەکە بەئاشکرا یا بەنهێنی بێت. بۆ هەر دەنگدەرێکش دەنگێکی یەکسان هەیە بەلام ڕەنگە ڕێساکانی دەنگدان دابەشکردنی تر دیاری بکات بۆ هێزی دەنگدان (لەئەنجومەنی وەزیرانی کۆمەڵەی ئەورووپیدان بۆ نموونە) .

**See also :Democracy ; eletion ; electoral System ; majority ; plebiscite ; Psephology referendum ; representation ; Tactical voting ; veto.**

# W

## War (الحرب) شەڕ

بریتیە لەبارێکی ململانێ لەنێوان قەوارە ڕامیارییەکاندا، بەلآم وەکو پێویست هەرێمی نیین وەك دەوڵەتەکان بەلآم زاراوەکە بەکار نایەت (جگە لەمانای کۆلۆنیالیستییەکەی نەبێت وەك لە (شەڕی پارتیزانیدا) یا (شەڕە بازرگانییەکان) بۆ وەسفی ململانێکانی نێوان تاکەکان یا کۆمەڵەکان لەجۆری ناڕامیاریی. شەڕەکان هەڵدەگیرسێنرێن لەپێناوی بەدی هێنانی ئامانجەکان بەزەبری هێز یا ڕێگرتن لەم بەدی هێنانە. پێناسەی یاسایی باری شەڕیش لەکۆمەڵگایەکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازە، ڕەنگە گرنگ بێت بۆ دیاریکردنی دەست پێکردنی دەسەلآتە ناسایییەکان و کۆتایی پێهێنان کەبەخشراونەتە سەرۆکی دەوڵەت یا دەزگایەك یا حکومەتێکی تر.

See also: Civil war;
conflict approach

## Welfare state (دولة الرفاهية) دەوڵەتی خۆشگوزەرانی

دەوڵەتێکە کە بەرپرسیارێتییەکی حکومی وەردەگرێت بۆ زامنکردنی دابینکردنی پێویستییە ئابوری و کۆمەلآیەتییە بنەڕەتییەکان بۆ هاولآتییەکانی لەڕێگەی ئامادەکردنی ڕاستەوخۆی شمەکەکان و هەندێك خزمەتگوزاریی دیاریکراوو سەر لەنوێ دابەشکردنەوەی دەرامەتەکان و ڕێگەکانی تر. ناکۆکیش هەیە سەبارەت بە مەودای وردی دابینکردنی دەوڵەت بۆ ئەم جۆرە سەرپەرشتییە، هەندێکیشیان تەنها بریتین

لەپارەی دراو بەتاکەکان و دابینکردنی خزمەتگوزاریە تەندروستییەکان لەکاتێکدا بێلەمانە فێرکردن و نیشتەجێکردنی حکومی یا کۆمەکەکانی نیشتەجێکردن و خزمەتگوزاریە کۆمەڵایەتی یەکەمییەکان لەخۆ دەگرێت. جیاوازیەکی فراوانیش هەیە لە دابینکردنی کۆمەکەکانی سەرپەرشتی حکومیدا هەروەك چۆن جیاوازیی جەوهەری هەیە لەنێوان وولاتەکان و لەناو دەوڵەت خۆشیدا بەتێپەڕ بوونی کات (سەیری کتێبی فلۆرا و هایدنهایمەر بکە بەناو نیشانی پەرەسەندنی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی لە ئەوروپا و ئەمەریکادا.)

## The Development of Welfare States in Europe and America

لێکدانەوەکانی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی و گەشەکردنی جیاوازن. هەندێکیان پشت دەبەستن بەتیۆرەکانی کاردانەوە لەبەرامبەر نوێکردنەوەدا (بەتایبەتی پیشەسازی) کە داوا لەسەر دابینکردنی کۆمەڵایەتی زیاد دەکات کە ئەمە ناکرێت لەرێی دەزگا کۆمەڵایەتییەکانی تری وەك خێزانی فراوانکراوەوە بەجێ بگەیەنرێت. هەندێکی تریش وای دەبینن کە گەشەی دیموکراسیەتی جەماوەریی وای لەدەنگدەران کردوە کەفشاری هەڵبژاردنی وجەماوەریی و کۆمەڵەی بەرژەوەندیەکان بەکار بهێنن (لەنمونەی سەندیکاکان) بۆ هاندانی دابینکردنی بەرنامەکانی سەرپەرشتی،چونکە سودەکانی ئەمە زیاد دەکات بۆ ژمارەیەکی زۆر لەدەنگدەران لەهەر زیادییەکی چاوەڕوانکراو لەباجدا لەپێناوی ئەوەی کەسودەکانیان پێ بدرێت. تیۆرە مارکسییەکانیش پەرەسەندنی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی دەبەستنەوە بەشیکردنەوەی شێوەکانی بەرهەم هێنانی سۆشیالیستییەوە و وای دەبینن کەدەوڵەت دەبێ ئەم جۆرە خزمەتگوزاریانە دابین بکات لەپێناوی بەرژەوەندییەکانی سەرمایەداریدا. پاساوە ئازادەکانی دەوڵەتی خۆشگوزەرانیش دەبەستن بەو بیرۆکەیەی کەدەبێ هەموو کۆمەڵگا بەر پرسیار بێت لەچاکیی باری ئەندامەکانی و لەسودەکانی و ڕەوشەکانی هەژاری و بێکاریی و نەخۆشی و پیریی دەبێت بەنیشانەکانی دارمانی ڕەوشتی تاکی دانەنرێت. چەند ناکۆکیەك هەیە سەبارەت بەو ئەنجامانەیە کەدەوڵەتی

خۆشگوزەرانی دەستەبەری دەكات. هەندێك پێیان وایە كەئەمە پاڵپشتی گونجانی كۆمەڵایەتی و جێگیریی رامیاریی و گەشەی ئابوری دەكات. هەندێكی تریش رەخنەیان گرتووە لەفراوانكردنی بێ سنور بۆ دابینكردنی خەرجی خۆشگوزەرانی لەلایەن دەوڵەتەوە لەبەر هۆی ئابوریی (قورسی باجەكان و شوێنەوارە خراپەكانی كۆمەكە گشتگرو بەخشندەكان) و هۆی رەوشتی (ئەو بیرۆكەیەی كەپێی وایە دەوڵەتی سەرپەرشتكار بەرپرسیارێتی و هەڵبژاردنی تاكی لادەبات)، هەروەها وا دانراوە كە ئەوەی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی پێشكەش دەكات لەوانەیە لەرووی رامیارییەوە ببێتە هۆی دروستكردنی كۆمەڵێك مشەخۆر) كەبەرژەوەندیی رامیارییان هەیە لەبەردەوام بوونی كۆمەكەكانی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی و فراوانكردنیدا. ئەم جۆرە رەخنانەش بەتایبەتی پەیوەندن بەراستی نوێ لەئەمەریكا و ئەوروپای رۆژئاوادا بەتایبەتی ئایدۆلۆژیای (تاتشەری) و (ریگانی) .

See also Industrial society ;
Liberalism;new right ; socialism;
Social democracy.

## Wets and Dries — میانرەوەكان و توندرەوەكان (*المعتدلون والمتشددون*)

دوو زاراوەن كەلەژیانی رامیاریی بەریتانیادا بەو ئەندامە پارێزكارانەی پەرلەمانی بەریتانی دەوترێت (وەك وەزیرەكان و ئەندامانی ئەنجومەنی لۆردان) هەروەها حیزبییە چالاكییەكان بۆ وەسفی ئاراستەی گشتییان بەرەو رامیارییە ئابوری و كۆمەلایەتیەكان.میانرەوەكان (Wets) حەز دەكەن كەپشتگیریی لەزیادكردنی خەرجی حكومەت و فراوانكردنی رۆڵی دەوڵەت لەدابینكردنی خزمەتگوزارییە كۆمەلایەتیەكاندا بكەن و لەئابوریشدا زیاتر لەتوندرەوەكان (Dries) كەپێیان باشە كەرۆڵی بازارو سودەكانی تایبەتكردنی دەزگاكان و خزمەتگوزارییەكانی دەوڵەت

بچەسپێنن (میانڕەوەکان) بەگشتی بەشێوەیەکی بەهێزتر پەیوەستن بەدابو نەریتی باوکسالاریەکانی تەوژمی پارێزگارانەی بەریتانیا لەکاتێکدا (توندڕەوەکان) پەیوەندن بەبیرە پارێزکارە ڕادیکالاًکانەوە کەبانگەشەی ئەوە دەکات کەبەکارهێنانی دراویی دەستی بەسەردا بگیرێ بۆ کۆنترۆڵکردنی ئابوریی وولآت. لەژیانی ڕامیاریی ئەمریکاشدا لەنێوان هەردوو شەڕە جیهانییەکەدا هەر دوو زاراوەکە وەسفی ئەوانەیان دەکرد کەبەرهەڵستکارن یا ئەوانەی کەلایەنگیری ڕێگرتنن لەبەرهەم هێنانی خواردنەوە کحولییەکان و فرۆشتنیان.

**See also: Conservatism ; privatization.**

# X

## ترسان لەبێگانەو ڕق لێبوونەوەیان (الخوف من الاجانب وكرههم)
## Xenophobia

بریتیە لەترسان لەنامۆکان ڕق لێبوونەوەیان، بەتایبەتی بێگانەکان، و ترسان لەڕۆشنبیرییەکەیان و ڕق لێ بوونی. لەوانەیە ئەم جۆرە ترسە ئەنجامی ڕامیاریی هەبێت لەشێوەی حیزبە ڕەگەز پەرستەکان و خراپی تێکەڵ بوونی کەمینە ڕەگەزییەکان و جیاکاریی ڕەگەزیی.... هتد.

See also:Racism.

# Z

## (Zioinsm) زایونیزم (الصهيونية)

بزوتنەوەیەکی جولەکەیە بەتایبەتی لەو بیرانەوە سەرچاوەی گرتووە کە لەناو جولەکە ئەوروپییەکاندا بڵاو بووە لەهەر دوو سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەمدا و شێوەیەکی یەکانگیری لەنوسینەکانی تیۆدۆر هرتزل و

ووتارەکانیەوە وەرگرتووە (1860-1905) . ووشەی (زایۆنی) لەبنەچەدا ئاماژەیە بۆ ئۆرشەلیم و هەروەها بەکاریش هاتووە بۆ ئاماژەکردن بەشانشینی ئاسمان و. لەو ئارەزووەوە سەرچاوەی گرتووە کە سەر لەنوێ دەولەتێکی نەتەوەیی جولەکە لەفەلەستین دابمەزرێنرێتەوە لەرێگەی کۆچی جولەکەکانی وولاتەکانی ترەوە هەروەك چۆن ژیانەوەی زمانی عیبری و رۆشنبیریی عیبریشی لەخۆگرتووە. بیرەکانی زایۆنیستەکان، وەك ئەمرۆ،لای هەموو جولەکەکان پەسەند نەبووە.لەرابوردوشدا (و نە لەئێستاشدا) رێکەوتنێکی ئایدۆلۆژیی نیە لەناو بزووتنەوەکەدا. گەشەی دژایەتی ئەوروپا بۆ سامیەت و بەلێنی بەلفۆر (1917) و رەتکردنەوەی عەرەب لەفەلەستین بۆ چۆك دادان بەرامبەر بەکۆچی جولەکە لەماوەی ماندێتی بەریتانیادا هەموو ئەمانە ئەو دەرفەتانە بوون کەزایۆنیستەکان قۆستیانەوە بۆ بەدەست هێنانی پشتگیریی بۆ مەسەلەکەیان و دوا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا بەراگەیاندنی دروست بوونی لەدەولەتی ئیسرائیل لەسالی1948داو دانپێنانی زۆر دەولەتی گەورە یەکسەر پیی . بەلام لەهەمانکاتدا ئیسرائیل نەیتوانی کەواز لەپێویستی چەندین جارەی شەر بەرپاکردن بهێنێ بۆ پاراستنی قەوارە و زەویەکانی. زایۆنیزم لە (یاسای گەرانەوەی)ئیسرائیلیدا جووت کراوە کە مافی هاولاتێتی یەکسەر بەهەموو ئەو جولەکانە دەبەخشێ کەکۆچ دەکەن بۆ ئیسرائیل.

# فەرهەنگی نوێ

# بۆ شیکاریی ڕامیاریی

# A Modren Dictionary of Political ANALYSIS

المعجم الحديث للتحليل السياسي

ئینگلیزی ـ کوردی ـ عەرەبی


دانانی

GEOFFRE ROBERTS
And
ALISTAIR EDWARDS

وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: سمیر عبد الرحیم الچلبی

وەرگێڕانی بۆ کوردی

محەممەد چیـــا

تەنها بەناوی خوای بالا دەست

# A Modren Dictionary of Political ANALYSIS

*- فەرهەنگی نوێ بۆ شیکاری رامیاری

*- ئینگلیزی عەرەبی کوردی

وەرگێڕانی بۆ عەرەبی:سمیر عبد الرحیم الچلبی

وەرگێڕانی بۆ کوردی

محەممەد چیا

*- چاپی دووەم

سلێمانی -2009

*- بەرگ: هەرێم عوسمان

*- ژمارەی سپاردن: 354 سالی 2003

*- تیراژ:1000

نرخی 6000 دینارە

